





تابلۆی بەرگی یەکەم
خالد رسول

تابلۆی بەرگی دووەم
ئەنجیلۆ


سەرپەرشتکاری بەرگ
محمد عارف

دەرهێنانی هونەری
محمد زادە

سەرپەرشتکاری چاپ
جعفر قادر بەرزنجی

لە کتێبخانەی گشتی لە بەغدا
ژمارە (٤٨٣) ی ساڵی (١٩٨٢) ی دراوەتێ
لە چاپخانەی (دار آفاق عربية) چاپ کراوە
نرخی (٢٠٠) فلسە
ئەدرەس :
هەولێر : ئەمینداریێتی گشتی ی
رۆشنبیری و لاوان
کۆڤاری (کاروان) ت : ٢٠٨٨٢


## تکا لە نووسەران

- لەگەڵ بەرهەمەکەتدا ناوی سێ قۆڵی و ئەدرەسی تەواوت بنووسە .
- خەتەکەی شاش و خۆش بێ و قەڵەمی پاندانی تێدا بەکار بێنە .
- بەرهەمەکەت پەسند بکرێ و نەکرێ بە نووسین وەرامت دەدرێتەوە .
- ئەگەر بەرهەمەکەت پەسند نەکرا ، هەقی داواکردنەوەیت نی یە .
- چەندە پێت دەکرێ وێنەو نەخشەی پێویستمان لەگەڵدا بۆ بنێرە .

# کاروان

گوڤاریکی ڕوشنبیریی مانگانەیە
ئەمینداریێتی ی گشتی ی ڕوشنبیری و لاوان بە زمانی
کوردی و عەرەبی دەری دەکا

سەرنووسەر

محمد امین محمد احمد

31

نیسانی 1985 سالی سێیەم

لەم ژمارەیەدا

# سوپای دلێرمان هۆڕی حوێزەی لە دوژمنی گومڕا کردە گۆڕستان

ـە کتزمیری ـمو نیوی شەوی یازدە لە سەر دوازدەی ـ ـ ی ـو ١٩٨٠ . گەردەلولی زەردی گومان لێکراو ، جێکـ ـی ئیمپریلیزمو زایۆنیزم لە قومو تاراندا ، جارێکیە ـەحتە ـمنەکەی خۆیان تاقی کردەوەو هێرشێکی گەورەو ـ ـ ـەیـ بۆ سەر خاکی پیرۆزی عیراقمانیان هێناو پتر لە هەشت ـیو سەربازیی چەکدار پەلاماری هۆڕی حەوێزەو ـۆزهـ ـی ڕووباری دیجلەیان دا . دوژمنی چەپەڵ لە هێـرشەکەیـ . چەکێکی یەکجار زۆرو جۆراوجۆر لە ڕووی قورسی و کوشندەییەوە بەکار هێنا لەپاڵ دەیەها هەزار سەربازو پاسەوانی بەناو ئیسلامی . دوژمنی ڕەگەزپەرست ، بەر لە دەست پێکردنی هێرشەکەیو دوای دەستپێکردنیش ، بە شێوەیێکی نامەردانە چەند شارێکی وولاتەکەمانی بۆمباباران کردو زەتر پێنجەمیشی لە شاری بەغدا جموجوڵێکی نواندو چەند کارێکی نامرۆڤانەی ئەنجامدا .

هێرشی ئەم دوواییەی دوژمن ، چارەنووسەکەی ، لە چارەنووسی هێرشەکانی ڕابردووی نەك هەر باشتر نەبوو بەڵکو ـ بوی خراپتر بوو لاشەی هەزاران سەربازو پاسەوان بەناو ئیسلامی لە گۆڕەپانی شەڕدا بەجێهێشت ، جگە لە زەرەرو زیانی تر وەك تێکشکاندنی دەیەها زرێپۆشو دەبابەو تەیارە نەکارکەوتن دەیەهای تری ، هەروەها پتر لە بیستوسێ هەزار سەربازی ئێرانیش تەرمیان لە گۆڕەپانی جەنگ بەجێماو سەدەها لاشەی کوژراوەکانیان لە ڕۆخ ئاوی حوێزەو سەر ئاوی حوێزەو دەورووپشتی بەچاو دەبینران و زۆربەی هەرە زۆری ئاژانسەکانو ئێزگەکاکانو ڕۆژنامەکانی جیهانی ئەم ڕاستییەیان سەلماندو دانیان بە بەزینی ئێران نا .

ئێمە ، هەر لە سەرەتای هێرشەکەی دوژمن ، دەمانزانی دوژمن وەك جارانی پێشوو ، سەرکەوتن وەدی ناهێنێو شەڕ دەدۆڕێنێو هێزە قارەمانەکانی ئێمەش وەك جارانی پێشوو خۆیان ئازایانە بەرامبەر دوژمن ڕادەگرنو جگە لەمەش هەروەك جارانی پێشووش دەرسێکی باش بە دوژمن دەدەن . گومانیش لەوەدا نیە کە گەلی لە ڕووناکبیرە هوشیارەکانی جیهانو پسپۆڕان لە سیاسەتو جەنگو سەربازیدا هەمان ڕای ئێمەیان هەبووبێ ، چونکە بۆ گشت لایێكو بۆ هەموو ئەو کەسانەی دەزانن کە جەنگ گیروگرفت چارەسەر ناکاتو تەنها بە گفتوگۆو ئاشتی کێشەی نێوان ئێمەو کاربەدەستانی ئێران چارەسەر دەکرێو کۆتایی پێدێت .

بەلام ؛ ئەوەی جێگای داخە تاقمی خومەینیی جادوگەر خۆی لەم ڕاستییەدا گێل دەکاو نە ویستووەو نایەوێ بۆ ڕاستیو چارەسەری عادیلانەی ئەم کێشەیە گوێڕایەڵ بێتو هەمیشە سووره لەسەر جەنگو کوشتنو ماڵوێران کردنو خوێنڕشتنی خەڵكو لە ئەنجامی ئەم شەڕەی دوواییشیدا تەختو بەختی وەرگەڕاو ئەمە بوو لە بەرەبەیانی ڕۆژی ١٨/٣/١٩٨٠ سوپای دلێرمان مژدەی سەرکەوتنی بە گەلو سەرۆکی فەرماندە تێکۆشەر صدام حسین ڕاگەیاندو سوپا دلێرەکەمان توانی ئازایانە ، جوێزەو ڕۆژهەلاتی دیجلە بکاتە گۆڕستانێکی گەورە بۆ هێرشکەران ، بە تایبەتی ئەوانەی فریای دەربازبوون نەکەوتنو نەیانتوانی ڕابکەن خۆیان لە چنگی پۆلایی هێزەکانمان ڕزگار بکەن .

ئێستاش راستە هێرشەکەی ئەم جارەی دوژمن وەك هێرشەکانی پێشووی شکا ، هەر چەندە ، هێرشەکەی ئەم جارەی گەورەتر بوو لە هێرشەکانی رابردوویدا ، بەلام ، ئایا ئەو دوژمنە قین لە دلە ، دەرس و عیبرەت لە شکستیەکەی وەردەگریٚ ؟ یاخود ئاووریٚك لە لاشەی هەزاران سەربازی قوربەسەری ئێرانی کە لە مەیدانی جەنگدا بەجێما دەداتەوە ؟ ئایا ئەو دوژمنە نەفامە بەر لەوەی دەست بە هێرشەکەی بکات ، بیری لە ئەنجامەکانی هێرشەکانی پارەکەیی و سالانی رابردوو نەدەکردەوە کە لە لایەن هێزەکانمان شکان و لەناوبردران ؟.

بەرای ئێمە دوژمن دەرس و عیبرەتی لە شکتیەکانی خۆی وەرناگریٚ و وەری نەگرتووەو هەر بە خەیالی داگیرکردنی عیراق و دیلکردنی گەلەکەی دەژی !. ئەمە لە لایێك و لە لایێکی تریشەوە ، لەبەر ئەوەی دوژمنێکی یەکجار درندەو زۆردارە نە نرخی مرۆڤ و مرۆڤایەتی دەزانیٚ و نە دانیش بە ماڤی مرۆڤ و مرۆڤایەتی دەنیٚ ، هیچ ئاووریٚك لە سەربازە کوژراوەکانی ناداتەوەو تەنانەت دلۆپە فرمێسکێکیشیان بۆ نارژێنیٚ و هیچ جۆرە حیسابێکشیان بۆ ناکات .

گەر ئەو دوژمنە دلرەشە ، رەچاوی ئەم راستیانەی لە سەرەوە باسمان کردن ، بکردبایە ، ئاگری ئەم جەنگەی هەلنەدەگیرساندو ئێمەیشی تووشی نەدەکردو نەخشەو پیلانەکانی ئیستیعمارو زایۆنیزمی رەت دەکردەوەو خۆی نەدەکرد بە نۆکەرێکی تەواوی بێگانە !. نەدەبوو بە ئەلقە لەگوێیکی بێگانە !. بەلیٚ راستە هێرشەکەی دوژمن ئەمجارەش شکاو پارچە پارچە کرا ، راستە پتر لە بیست و سیٚ هەزار کەسی لیٚ کوژرا ، راستە بوو بە پەندی زەمانەو هەر وەکو چۆن لە جەنگەکانی سالانی رابردوو شکا ، لە جەنگی حویزەو رۆژهەلاتی دیجلەش شکا گومانیش لەوەدا نی یە گەر هاتو ئەو دوژمنە چەند مانگێکی تریش ژیا یاخود با بلێین چەند سالێکی تریش ژیا ئەوا بیٚگومان چەند هێرشێکی کەش بۆ سەر خاك و ولاتەکەمان دێنیٚ و ناو بەناو پەلاماری دەشت و ئاوو چیاو دوٚلی ولاتە خۆشەویستەکەمان دەدات و کەچی ئەنجامەکەش هەر دۆراندن و شکستی و مالوێرانی و قوربەسەری دەبێت بە تایبەتی

بۆ گەلانی ئێران . ئەو گەلانەی بە درێژایی مێژووی کۆن و نوێی ئێران تووشی جادوگەرێکی وەك خومەینی و دارو دەستەکەی نەبوونەو نابن !.

لێرەدا ئەوەی ئاشکرایەو بۆ ئێمەو خەلکیتریش لە دەرەوەی ولاتەکەماندا قسەی بەجیٚ و ئامۆژگاریی پەسندو داواو خواستی گەلان و رای گشتی جیهانی تۆزقالێك کار لە سیاسەتە نارەواکەی خومەنیی ناکەن و ناچاری ناکەن گویٚ بۆ داواو خواستی خێرخوازان شل کات .

قسەی خۆش و بەجیٚ لەگەل کاربەدەستانی ئێران سوودی نی یە ، ئا رام گرتن بەرامبەر کردەوە ناشرینەکانیان سوودی نی یە ، پەیرەوکردنی سیاسەتێکی ئاشتیخوازنەو راست و عادیلانە بەرامبەریان سوودی نی یە ، گەر قسەی بەجیٚ و هەلوێستی ئاشتیانەو ئارامگرتن سوودی هەبووایە ، ئەوا ئەو جەنگە قەت رووی نەدەداو ئاگرەکەی هەلنەدەگیرسا . چونکە عیراقی خۆشەویستمان و سەرۆکی نەبەزمان گەلیٚ هەلوێستی ئاشتیانەو ئارامگرتنیان نواند ، ئێستاش ئەگەر لە سیاسەتی ولاتەکەمان ووردبینەوە دەبینین پرە لە کاری مەردانەو هەلوێستی مرۆڤانەو رێزگرتنی لە داواو خواستی خێرخوازان ، کە لە بە هێزیٚ و تواناوە هاتووەو هەلقولاوە ، کەچی ئێرانی دوژمن ، تاقمی خومەینیی جادوگەر ، هەر لەسەر کەللە رەقیەکەی ماونەتەوە .

لەو کاتەی ئەو ووشانە بە بۆنەی سەرکەوتنە مەزنەکەی سوپامان دەنووسین و پر بە دل پیرۆزبایی لە گەل و سوپاو سەرۆکی خۆشەویستمان تێکۆشەر صدام حسین دەکەین و دەنگ بەرز دەکەینەوەو دەلێین : تاکەی دەولەتانی جیهان رۆلیٚ بینەر بەرامبەر ئەو جەنگە وەردەگرن ؟... بۆچی هەلوێستێکی توندو حەددی بۆ راگرتنی ئەم شەرە نارەوایە ناهاوێژن ، قسەی بەجیٚ و هەلوێستی ئاشتیانە لەگەل تاقمی خومەینی بیٚ سوودەو کورد دەلیٚ : **شەرعی مار بەدارو توٚبز دەزانیٚ قوناغ لە کوێیە !.**

– « سەرنووسەر » –

# قـــازی محــمد

محمد ئەمین پێنجوێنی

هەموو گەلێ بەشی خۆی قوربانی داوەو کەم تازۆر دریغی نەکردووە لە قوربانیدان و تێکۆشاوەهەتا گەیشتووە بەئامانج ومافی خۆی .

لەم سەرزەمینەدا هیچ میللەتێك بەئاسانی سەرفرازی وەدی نەهێناوەو میللەتی واهەیە بەدەیەها هەزار بەڵکو بەملیۆنەها شەهیدی داوە تا بەئاواتی شادبووەو وڵاتی ڕزگار کردووە . گەلێ جار سەرکردەو ڕۆڵەی قارەمانی ئەو گەلە بەو پەڕی غیرەت مەندیوە چونەتە سەر سێدارە نەڕەی ئازایەتییان گوێی دوژمنی کەڕ کردووە . بەڵێ میللەتی کوردیش لەساڵەهای ساڵەوە نکولی نەکردووە لە قوربانیدان . زۆر جار ڕۆڵە قارەمانەکانی گیانیان بەخشیوە بەخاکی نیشتیمان . خوێنی ئاڵیان بەسەر لوتکەی چیا سەرکەشەکانی کوردستاندا ڕژاوەو بوتە هەوێنی هەڵگیرسانەوەی بڵێسەی (نەورۆز)ی شۆڕش و شەوقی شەبەقی ئەو شەوەزەنگەی ڕەواندوتەوە کەویستراوە کوردی تیا بخنکێنرێ .

چەندەها جاریش ڕۆڵەی ئازاو بەشەرەفی ئەم گەلە بەپێی خۆی و بەوپەڕی مەردیو غیرەتەوە چونەتە بەرپەتی سێدارەو سروودی فیداکاری لەخۆبوردنیاندا ووتوەو چاویان بڕیوەتە بۆپەی شاخە بڵندەکان پەتەکەیان لەملی خۆیاندا گرێ داوەو بەزەردەخەنەی هیوای سەرکەوتنەوە ووتویانە :

**ئێمەئەڕۆین . بەڵام خاك و میللەتمان هەرئەمێنێ**

بۆیەقازی محمدی نەمر لەو کاتەدا کەلەسەر کورسی سێدارەبوو ئەم شیعرەی ووت (شیعرە کەبەفارسی یە ئەمە ماناکەیەتی): ئەم کاتەم زۆر پێخۆشە کەخۆم لەسەر داری مردن و لەناوچوون ئەبینم لەپێناوی کوردو کوردستانەکەمدا سەربەرزم خۆشحالم و لەهەموو ئەوانەی تر کەلەخوارەوەن خۆم بەرزترو باڵاتر ئەبینم ، چونکەبەنرخترین و بڵندترین شت کەگیانمە ئەوا ئەیبەخشم بەکورد . دیارە ئەمەش ڕەوشت و خوی مرۆڤی تێکۆشەرو خاوەن بیرو باوەڕو کۆڵنەدەرە .

قازی محمدی نەمر لەشاری مەهاباد لەساڵی 1901 دا لەخێزانێکی ئایینی وبەڕێزو ماقوڵ چاوی گەشی پشکۆی بەشاخ و کێوەکانی کوردستاندا هەڵهێناو هەر لەسەرەتای لاویەوە چوە کۆڕی تێکۆشان و خەبات و گورج و گۆڵی سیاسەتەوەو دەستی کرد بەبڵاوکردنەوەی بیرو باوەڕی کوردایەتی و دیموکراتی و ڕزگاری خوازی . کەڵکەڵەی بیری ڕێکخراوەیەکی نهێنی و سیاسی کەوتە ناو مێشکی یەوەو بۆیەش پەیوەندی کرد بەڕاپەڕینەکەی ئاراراتەوە کەئیحسان نوری پاشا سەرکردەی دەکرد . لەوکاتەدا کەکرا بەبەڕێوەبەری مەعاریف (مدیر معارف)ی مەهاباد لەزەمانی حوکومەتی ڕەزاخاندا هەوڵ و کۆششێکی گەلێ زۆریدا بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری و پەرەپێدان و کردنەوەی قوتابخانەی زانیاری لەناوچەکەدا . لەوکاتەدا (قازی) نەمر لاوەکانی لەقوتابخانەکان کۆدەکردەوەو باسی سەربەخۆیی میللەتی کوردی بۆ دەکردن و ئەو لاوانەی هاندەدا کەچۆن ئەم گەلە ڕزگارو ئازاد بکەن لەچنگی ڕژێمی ڕەزاخان و بەمەشەوە نەوەستا بەڵکو هەوڵی ئەوەی دەدا کە(عشائرە) کوردەکان یەك بخاو ناکۆکی و دووبەرەکیان لەناودا نەهێڵێ . لەلایەکی ترەوە هەوڵی یەك بون و ڕێکخستنی هێزە دیموکراتی یەکانی کوردستانی ئەداو هەموو هێزو توانای خۆی بەئەم مەبەستەپیرۆزو بەجێ یە تەرخان کردبوو .

قازی محمدی نەمر پاڵپشتێکی زۆر بەهێزو بەکەلك و گەورە بوو بۆکۆمەڵەکەی (ژ . ك) و ڕەواج پێدان بەبیرو باوەڕو فەلسەفەی (ژ . ك) و ڕێزی لێ دەگرت سەرکردەکانی خۆشی دەویستن . جا بۆیەلەمانگی تەشرینی یەکەم ساڵی 1944 دا بوو بە ئەندامێکی بەکەڵکی کۆمەڵە ، بێ گومان ئەندامیەتی قازی لەکۆمەڵەی (ژ . ك) دا ڕۆڵێکی گەورەوگرینگی بینی و ئیتر تیشکی باوەڕی کۆمەڵە بەزۆر جێگەی کوردستاندا بەخش و بڵاوبۆوە . هەروەها دەورێکی گەورەچاکی هەبوو لەدروست بوونی پارتی دیمرکراتی کوردستاندا . ئەو هەوڵ و کۆششەی ئەو بەردێکی کاریگەری بناغەی دامەزراندنی پارتەکەبوو ، هەربۆیەش لە یەکەم کۆنگرەی پارتدا کەلەساڵی 1945 دا بەسترا قازی هەڵبژێردرا بە سەرەکی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران . ئەمەش وانیشان دەداکەلەشۆڕش و سەرکردایەتی کردن و دانانی ڕێکەو بەرەو پێشەوەبردنی ئەو قوناغەی تێکۆشانی میللەتی کورداو دامەزراندنی جەمهوریەتی کوردستان بۆ یەکەم جار لەمێژووی گەلی کوردا قازی هەرهەمان دەستور دەوری گرینگی خۆی بینیوەو بەڵکە ئەندازیارو ڕێچکە دانەری سیاسەتەکەیشی بووە . بەهەمان جۆر قازی نەمر لەکانونی دووەمی ساڵی 1946 دا بوو بەسەر

کوماری جەمهورییەتی دیموکراتی کوردستان . لەپاش 14 مانگ
ـەژیـنی پڕ لە گیرو کێشەو دەردەسەری کوماری مەهاباد ، 14
ـگ پڕ زوران بازی لەبـەینی خێرو شـەڕو هێرشی دەرەوەو
ـدودی هەموو ناوچەی ڕوژهە لاتی ناوەڕاست . بێ گومـان
گیـروکێشەو زوران بازی ڕوژ بە ڕوژ پەرەی دەسەندو لە هەموو
لایەکەوە گەمارو دراو سوپای ئێران بەسەرکردایەتی ژەنەڕال
ـەرمارای) دوژمن بەکورد ڕووی کردە کوردستان . هێرش بو-
سـەر کوماری مەهـابادو بـە چاودێـری ڕاوێژی کـاری ئەنگلو
ئەمریکاو کوماره ساواکەی کورد جوانەمەرگ کراو قازی‌و گەلی
سەرکردەکان بەند کراون‌و لە ڕوژی 31 ی ئازاری سالی 1947
. سـەعات 3 ی بەیانی ئەوڕوژە لە مەیدانی چوارچرا لەشاری
مەهابادی خوینین ئەم قارەمانە گیانی پـاکی بەخشی بـەخاك‌و
نەتەوەکـەی لە گەل سـەیفی قـازی صـدری قـازی (3) سێ
سێـدارەیان بو ڕێزکرا .

شایانی باسە قازی نەمر کەسەرکەوتە سەر سێدارەکە
وتی چاوم مەبەستنەوە بالە دواهەناسەی ژیـانمدا تێر تـێر
چوم بەشاخ‌و کێوەکانی کوردستان‌دا بگێڕم چاوم لەو میللەتە
هـەژارو بەش خـوراوە بێت کەبێ بـەری‌یە لەبـەری ڕەنـج‌و
وولاتی‌و ئەو ئەمانەتەی من هەلگرتبوو بیدەمە دەست ئەو لاوە
حوین گەرمانەی کەهیوای دوالاوژن‌و لەو کـاتەدا وەکـو شێر
هـوری کردو ووتی .

**(بژی نەتەوەی کورد ، بژی ئازادی‌و ڕزگاری کوردستان) .**

ئیعدام کردنی قازی محمد بەهەموو دنیادا بلاوبووە گەلێ
ڕوژنـامەو ئێستگـەی جیهان بـاسی قارەمـانی‌یـەتی قـازی‌و
هـوریکانی هـەژاری‌و داماوی کـورد تێك‌شکـانی کومـاری
کوردستانیان دەکرد . لەو کـاتەدا ڕوژنـامەی (ئیـزڤستیا)ی
سوفیەتی لەژمارەی 30 نیسانی 1947 دا دەلێ :

ئەوقارەمانانە کەشەهیدکران لەناو میللەتەکەیاندا ڕیـزو
خوشـەویستییکی زوریان هەبوو لەسوزی گـەلەکەیـان بوون‌و
قین نـەبوون بـەوسیاسـەتەی کـەئیمپریـالیزم بـو کومـاری
کوردستانیان دانابوو . بویە ڕژێمی شاو ئیمپریالیزم پەلەیـان
کرد لەئیعدامی قازی محمدو سەدری قازی‌و سەیفی قازی .
لەسالی 1956 دا نەقیب شەریفی باسی مـوحاکـەمەکـەی قازی
دەکاو دەلێ :(شەریفی ئەو ئەفسەرە بوو کەحوکومەتی ئێـران
دانابوو دیفاع لەقازی بکات لەدادگادا) بەداخەوەم بو قازی
محمدی نەمر چونکە ئەو مەردە نەك دیفاعی لەخوی‌و لەحقوقی
کورد دەکرد بەلکو دیفـاعی لەحقوقی هـەموو گـەلانی ئێران
دەکرد‌و دەلێ : ئەو پیـاوە مەردانـە بەشێـوەیەك بـەرگریـان
لەبیروباوەڕیـان دەکرد . بەمنطق‌و ئازایـەتی دادگاکـەیان
دەگیرایەوەو ئەوان موحاکەمەی ئەفسەرەکانی ڕژێمیان کردو
وتیان ئێمە لەسەر هەقـین ، بەلێ بـەم جورە قـازی نەمـر
لاپەڕەیەکی پاك‌و شەریفی لەمێژووی کورددا بەجێهێشت‌و هەتا
هەتایە هەر زیندووەلەدلی هەموو کوردێکی نیشتمان پەروەردا
نامری قازی هەمیشەوا لەتویی دلدا دەژی .

# میرزا مارف

**س . ع . شادمان**

**گەلێ لەشاعیرانمان کەکوچی دواییـان کردووە نـاویان لەسەر ڕووپەڕەی ڕوژنامەو گوڤارەکانا کوژاوەتەوە بێ ئەوەی خوێندەوارەکانمان یادی کوچیـان بکەنـەوە وەیان نـاو بەنـاو لەسەریان بنووسن .یەکێك لەوشاعیـرانە ئـەم شاعیـرەمانـە کەباسی ئەکەین‌و چرای ڕووناکی کوڕی زانایان بووە . نـاوی (مارف )ە کوڕی مەلا ئەحمەدە خەلکی سلێمانی یە ، خوێندنی لەقوتابخانەی دینی تەواوکردووە . چـونکەخـوێندەوار بـووە ناوی میرزایان بەسەردا بڕیوەو پێ‌یان ووتـووە میرزا مـارف ئەویش لەشیعر دانانا کردوویەتی بەنازناو بوخوی .**

**ژیـانی خـوی بـەکـاروبـاری میـرییـەوە بـردوتـە سەر ،جگەلەزوبانی کوردی ، عەرەبی‌و فارسی‌و تورکی زانیوە ، جگەلەکومەلەشیعرەکانی پەرتوکێکی بەناوی ـ حقائق وجیزە ـ داناوە بەکوردی کەهەمووی فەلسەفەو پەندو ئاموژگاری‌یە ، بەلام وەکو خوی ئەلێت :**

**لەنـوتی غەیـرە ئەچێ قیمـەتی ئەدەب ئـەمڕو**
**کەوەك مەتاعی شکستەبـەکەسـرو کەم ئـەڕوا ،**

ئەم شاعیرەمان لەکاتێکا چاوی لێك ناو کۆچی کردوو ماڵ ئاوایی لێ کردین کەسەرەتای بەهاری خورەم بوو وەنێرگز چاوی کردبووەوە بەڵام ئەم چاوی گەشی لێك نا .. کەرێکەوتی ڕۆژی پێنج شەممەبوو ٢٩-٣-١٩٥٦ وە ١٦ی شەعبانی ١٣٧٦ی کۆچی بوو .

میرزا ڕێگایەکی ڕاست و ڕەوانی گرتووەو لەسەر ئەو ڕێ یەڕۆیشتووە بۆیە ئەڵێت :

**وەکو لاوی سلێمانی کلاوم لار ئەکەم بێ باك**
**لەدەشتی مەحشەریشدا یەعنی لەسەریەك مەزهەبودینم**
**نەبۆ لای ڕاست ڕیاکارم ، نەبۆلای چەپ کەمەربەستەم**
**لەکوێیە (ڕاستی) لەوجێگەیەسەر چاوەیی ژینم**
**ئەوی هەق بێ ووتوومەهەر ئەشی لێم تاوەکوو مردن**
**هەقەیاسینی پێشمەرگم ، هەقەئاوازی تەلقینم**
**لەمردنما نیەپێویست بەواوەیلای کەس وکارم**
**کەچونکە ڕاستی یەدینم ، مەلایێك دێن ئەکەن شینم**
**من و سەرمایەیی ڕاستی درۆ کفرە لەلای (میرزا)**
**بەسەربەستی ئەلێم خاوەن دڵێکی پاك و خاوێنم**

ئینجاکەمیرزادێتەسەرباسی غەرامی وخۆشەویستی دولبەرەکەی پێی ئەلێت و ڕووی خۆی تێ ئەکات و کەدڵی من وەك ئاوێنەی بێ گەرد وایەتەماشای بکەبەچاوی خۆت ببینەکەلەتۆزیاتر کەسی تری تێدانیەو تۆش نەکەی لێم یاخی ببی و بەرد هەڵگری ئەم شیشەی ئاوێنەیەکەبالای بەرزی و جوانی ڕووخساری خۆتی تیا ئەبینی و نەکەی بیشکێنی بڕوانن چەند بەناسکی وجوانی بۆمان دەردەبڕێت وئەڵێت :

**وەکوتاووس چیەئەمڕۆ بەناز خۆت ئەنەخشێنی**
**پەنا بەخوا بەچاوتادیارە دیسان دڵ ئەلەرزێنی**
**نەکەی بەرد هەڵگری بۆ شیشەیی دڵ ، شێتەکەخۆ دڵ**
**لەتۆ زیاتر کەسی کەی تیانیە بۆ تێکی ئەشکێنی**
**لەلای خۆتەوەکوو ئاوێنەبێگەردەتەماشای کە**
**بەداییم خۆتی تیا بنوێنە ئیکەبۆچی ئەشکێنی**
**لەتووڕەبوونی دوێنێی تۆنەترسا دڵ کەئەیزانی**
**ئەمانە گاڵتەیە ببینی کەلێوی لێ ئەقووچێنی**

**بەهەر جەورو جەفایەك حەز ئەکەی دڵ بەندەیەتوخوا**
**بەدووری ڕووت نەکەی ئەم بەندەیەی خۆت داچڵەکێنی**
**هەزار جەوروو جەفام دەرهەق بکەی من هەر ئەڵێم خوایە**
**منالەدڵ ڕەقەخۆی چا ئەبێ تۆ لێمی نەستێنی**
**قوبانی من بەسەودای تۆوە عومرم بردەسەر تازە**
**بەدەرکردن لەئەم قاپی مرادەم تۆ ئەترسێنی**
**کەیشتمە بەردەمی دەرگانەکەت کەعبەی تەواڤی دڵ**
**لەلام یەکسانە ڕووت داپۆشی یاخوو بۆمی بنوێنی**
**بەمیرزا مارف ـی کەوتوومە بەندی پەرچەمی لولت**
**خەیاڵی خاوە تۆ بتوانی لەم بەندەم کەدەربێنی**

میرزا لەگەڵ شاعیری نیشتمان پەروەر ئەحمەد موختار جافدا زۆر دۆستایەتی یان خۆش بووە جارێکیان ئەحمەد موختار ئەچێ بۆ سەفەرێ زۆری پێ ئەچێ و کەدێتەوە میرزاهیچ پرسیاری لێ ناکات و هەواڵی ناپرسی بۆیە ئەحمەد موختار بەم هۆنراوانەگلەیی لێ ئەکات و ئەڵێت :

**بێ وەفا مارف ـ لەبەرچی من لەبیرت چوو ـەوە**
**بۆچی تۆ نازانی چەند ڕۆژێکەهاتووم ەوە**
**ئەی نەفام چۆن شێر ، ئەسیری پەنجەیی ڕێوی ئەبێ**
**شاهبازت دیوە تائەمڕۆ بەچنگی ـ بووم ـەوە**
**هاتمەوە بەڵکو کەچەند وەختێ لەخەم فاریغ ببم**
**چاوی فەتتانم کەدی دیسان لەسەر خۆ چوومەوە**
**ئەهلی ئەم شارەلەوەختێکو کەتۆ وون بووی لەمن**
**ماتو بێدەنگن بە(شێخ و جوولەکەو ماڵوومەوە**
**زۆر ئەترسم تۆ نەبینم باز بڕۆمو چاوەکەم**
**نامرادو دەربەدەربم بەم دڵەی مەحرومەوە**
**پێی ووتم یار بۆچی ـ ئەحمەد ـ قامەتت واخەم بووە**
**بۆچی ئێستاش وای بەداخی تاڵی دوو ئەبڕۆمەوە**

پەراوێزەکان :

١ ـ ڕۆژنامەی ژین .
٢ ـ کۆڤاری گەلاوێژ .
٣ ـ کەشکۆڵی دەستنووسی خۆم .

# نالی و جوانی و جوان پەرستی

د. ئەمین عەلی موتابچی
مانگی نەورۆزی سالی 1983

بەر لەوەی دەست بکەم بەباسی شتێ دەربارەی بابەتەکە دەمەوێ سەرنجی دۆستان بۆ دوو شت رابکێشم :

یەکەم : کەئەشێ هێندێ بڵێن بەسەنەبرایەوە هەرلەسەر نالی دەنووسن لەوەلامدا دەڵێم ، هەر لەبەر ئەوە نا کە چ نالی و چ خانی و جزیری و مەولەوی و سالم و مەحوی و حاجی کۆیی ، بێکەس و پیرەمێردوو گۆران و هتد ، هەموویان شایانن و پێویستە هەتا هەتایە دەربارەیان بنووسرێ جگە لەوەی کەخۆش بەختانە دیوانی نالی ئامادە کراوە لەلایەن دۆستان و عاشقانی نالی یەوە کەدەبێ لەسەری بنووسرێ ، هەروەها جزیری و مەولەوی و هەر شاعیرێکی کوردی کەدیوانەکەی ئامادەکرابێ و گیرو گرفتی تارادەیەك نەمابێ .

دووەم : دەبێ بزانین کەدەربارەی شاعیرە بەناوبانگەکانی دراوسێمان دەها وە یا سەدەها کتێب و مەقالەو نامەیان لەسەر نووسراوە وەك (موتەنەبی ، ئەبولعەلا ، نظامی ، سەعدی ، حافظ ، نامق ، کەمال ، تۆفیق فیکرەت ، عبدالحق حامد هتد)[1] . هەروەها شاعیرانی ئێمەش ئەگەر لەمانە زیاترنەبن کەمترنین . میللەتی ئێمەو کتێبخانەی کوردی و نەوجەوانان و شاگردانی کورد پێویستیان بەوەیە کەدەربارەی شاعیران و نووسەرانی بەرزی کورد بنووسرێت و تارادەیەك بۆیان ڕوون بکرێتەوە ، تابەباشی و بەشێوەیەکی زانستی لێیان تێبگەن و نرخ و بەهای زمان و ئەدەبیاتی شیرینی کوردی باشتر بزانن و بناسن .

من لێرەدا نامەوێ دەربارەی ژیان و دیوانی نالی شتێ بڵێم چونکەماموستایانی وەك (مەلاعەبدولکەریمی مدرس ، مسعود محمد ، مەلاجەمیل ڕۆژبەیانی ،عەلائەددین سجادی ، هەژار ، د . مارف خەزنەدارو هتد). کەشارەزای نالین و دەربارەی نالی بیروباوەڕی زانستی و ئەدەبیان هەیەو هێندێکیشیان دەربارەی نالییان نووسیوە ، ڕێگا بەخۆم نادەم و

پڕکێشی ئەوە ناکەم کەبڵێم لەنالی دەگەم و شارەزام .

بەڵام خۆشەویستی و عیشقێ کەبەرامبەر نەك تەنها هەر نالی بەرامبەر هەموو شاعیرە بەرزەکانی کوردزمانم هەیە وای لێ کردووم کەبەبێ ئەوەی بزانم سەرنجم رادەکێشن بۆلای خۆیان و بە(فەیضی)زانستیان سەر چاوەی دڵی پڕسۆزم پاراو دەکەن و لەئاسمانی بێ پایانی شیعرەکانیاندا وەکو مەلێك کەتازە فێری پەرواز بووبێ دەفرم و لەم چڵ بۆ ئەو چڵی لەم گوڵ بۆ ئەو گوڵی (بەیتەکانیان) دەچم و بەبۆنی (موشك و عەبیریان) سەر خۆش و مەست دەبم . لەبەر ئەوەیەکەمنیش دەمەوێ لەم چەند لاپەرەیەدا شتێ دەربارەی جوانی و جوان پەرستی لای (ملك الشعراى) کورد حەزرەتی (نالی) پیشان بدەم . ئومێدەوارم کەدۆستانی خۆشەویست بەچاوی میهرەبانییەوە سەیری بفەرموون و لەکەم و کوڕی چاو بپۆشن و پەسەندی بکەن .

وەتەنی بەواتا کوردستان بەکەژو کێوییەوە بەدەشت و دۆڵییەوە ، بەدەوارو دەوەنییەوە ، بەباسك و هەورازییەوە ، بەچەم و ڕوبارییەوە بەئاژەڵ و پەلەوەرییەوە بەشارو دێهاتییەوە رازاوەو تەڕو پاراوە ، دیمەنی جوانەو جوانی لێ دەبارێ . لەزستاندا وێنەی بەفرو بارانی ، لەبەهارو نەورۆزدا گوڵاڵەو نێرگسەجاری لەهاوین دا کوێستان و ئێلاخی ، لەپاییزدا باخی پڕ لەسێوو ترێ و بەهێ و هەرمێ گوڵاوی و هەناری ، هەموو جوانن و سروشتین . دەنگ و ئاوازی (بلبل و قومری)و هەزاری لەگەڵ شمشاڵی شوانی داوێنی چیاو گوێ چەمی بەفراوی ، تێکەڵەو ئاوازێکی بەسۆز پڕ سروش بەگوێی مرۆڤ و دەوروبەری دەدەن ، نالی چاوی بەبەهاری شارەزوور کردۆتەوە ، شارەزوور بووکی وڵاتی بابان کانی پیت و فەڕ کەوەك دەریایەکی شینی بێ پایان لە شنەدا بووە ، لەوێوە بۆ زەردیاواو قۆپی قەراخ کەمەگەر لەشریتی (فلیم)دا شوێنی وا چڕو پڕو نسێ و پڕئاوو دارودەوەن ببینی . لەوێوە بۆناوچەی ئەردەلان بۆ (سنە) بووکی میرنشینی ئەردەلان ئینجا بۆ سلێمانی ، سلێمانی سەردەمی بابان ، کەوەك هەموو پایتەختێ لەهەموو لایەکەوە خۆشی و تەڕی و جوانی لێ باریوە ، لەلایەکەوە سەیرانگای سەرچنار لەولاوە بەکرەجۆو تانجەرۆ . جوانی ئافرەتی کوردی ، شەدەلار ، کەبەبۆنی مێخەك و سملی پیاو یان مەست کردووە ، هەر وەکو مامزی پێدەشت جار جار سلیان کردووە . گردی سەیوانیان پڕ لەشەهیدان کردووە ، ئەو گردەی کە هەمیشە گردی شەهیدانی دوو عیشقە یەکێ عیشقی جوانی ، یەکێ عیشقی جوانی و خۆشەویستی وڵات . دیارە نالی یەك ئەمە وڵات و وەتەنی بووبێ دەبێ بیرو هەستی ، ئەندێشەو خەیاڵی لەوشوێنەدا ، لەو ناوچەیەدا هەڵ قوڵابێ . بەتایبەتی ئەو هەست و خەیاڵ و وەسفانەی کەدەربارەی جوانی وجوان پەرستی کردوویەتی تابلۆی ڕەنگاو ڕەنگی وەتەن وڵاتی نالی بووەو سروش و ئیلهامی لەوێوە بۆ هاتووە . شیعرەکانی نالی وەنەبێ هەر بریتی بووبێ لەو بیرو خەیاڵانەی کەکردوویەتی و ویستویەتی بیگەیەنێ بەخەڵك ، بەڵکو بریتی یە لەتابلۆیەك بەواتا لەچەپکە گوڵێکی رازاوە کەگوڵدانەکەی خاکی پاکی کوردستانەو تەڕو پاراوی ئەو خاکەپیرۆزەی تیایدا نومایانەو نالیش خۆی هەڵبژێرو ڕێکخەری ئەو چەپکەگوڵەیە .

تەنانەت کەنالی شێفتەو پەرێشانی هونەری جوانکاری بووەو بەرهەمە شیعری یەکانی پێ ڕازاندۆتەوە نەتەنها لەبەر ئەوە بووە کە هونەرمەندی خۆی دەرخا بەڵکو سەرەرای ئەوەش بەهۆی جوانی و جوان پەرستی یەوە بووە کەبەشێوەیەکی وەستایانەو وورد کەم کەم شاعیری تر تووانیویتی ئەم ووردەکارییەبکا شیعرەکانی پێ برازێنێتەوە ...

نالی لەیەکەم غەزەلدا (بەپێی ئەوەی کەلە زوربەی نوسخەکاندا یەکەم غەزەلە)* دەڵێ :

**ئەی جیلوە دەری حوسن و جلەوکێشی تەماشا**
**سەرڕشتەیی دین بێ مەدەدی تۆنییەحاشا***

نالی لێرەدا ڕوودەکاتە پەروەردگارو دەڵێ جیلوە دەری حوسن و جوانیت ، لێرەدا ئیشارەتە بەو قسەیەی کەسۆفی یەکانی (متصوفه) دەڵێن خودا جوانەو جوانی خۆش دەوێ (ان الله جميل يحب الجمال)*نالی دیوانەکەی بەخودای

گەورە دەست پێ دەکا کەکان و مەنبەعی هەمووشتێکی جوان و بەشە . چونکەخودا زاتی خۆی جوانەو گەنجێکەوەکو کەدەڵێن خوا فەرموویەتی (كنت كنزا مخفيا فاحببت ان اعرف)[3] .

(کنز)یا(گەنج) شتێکی بەبەهاو بەنرخ و جوانە . بەم جۆرە نالی بەجوانیو بەبەهاو بەنرخی بێ پایانی پەروەردگارەوە دەست پێ دەکات . دیسان دەڵێ :

**فەیـاضی ریـاضی گـوڵو مـیـهـرو مـلو لەعـل**
**ئەی شەوقی ڕوح و ذەوقی لەبت ذائیقـە بەخشـا[4]**

پەرومردگار کـەباران ڕێـژی باغچـەی ژیانـە چەبـاغچەیـەك بـاغچەی گـوڵ ، شوێنی جـوانیوژیان . لێـرەدا ئـەو شتـە سـروشتیانـەی کەزۆر جـوانن کۆی کـردونەتـەوە لەگـوڵ ، میهر(ڕۆژ - خۆر)مل : مل وەیا(مە)مانگ ، لەعل : ئەو بەردە بەنرخەسوورە ئاڵە جوانە . ئەمـانە هـەموو جـوانن و جوانی دەبەخشن بەدەورو پشتیان . «خۆر - ڕۆژ»کەکان و مەنبەعی ژیـانە بـۆ کائینـاتی سەر ئـەم زەوییەی ئێمـەو نمـوونـەی جوانییە ، مە(مانگ) جوانـەو زێوەری ئـاسمانـە لەشەودا . لەعل : بەنرخەو نموونەی جوانییەو جوانترین تـەشبیهەبـۆ لێوی ئاڵی ناسکی ئافرەتی جوان . یا کە دەڵێ :

**ئـەستێرە هـەمـوو مـەحـوە لەنێـو نـووری قـەمـەردا**
**یـاشەمسی جـەمـاڵت شـەوی گێـراوە بـە قـەردا[5]**

ئەستێرە ، قەمەر ، ئەمانە کەخشڵ و زێوەری ئاسمانن و جوانن کـەڕۆژ هەڵدێت هـەموو نـامێنن ، بەرادەیـەك باسی جـوانی یارەکەی یاخۆشەویستەکەی دەکات کەوەك ڕۆژ وایەشـەوی گێراوە بەبەیان و ئەستێرەو مانگ هەموو مەحون و جـوانییان بەرامبەر جوانی ستایشکراوەکەی (مەمدوحەکە) نانوێنێ .

یا کە دەڵێ :

**ڕەنگی نـیـیـە ڕوخـسـارەیی ڕەنـگـیـن و لەطیفی**
**ڕۆشن بـووە ئـەم نـوکتـە ئـەبـاتی لەبـەصـەردا**

ڕومەتێ ئەوەندە ناسك و جوان بێ کە ڕەنگی نەبێ و نـەتوانی بڵێی چـەرەنگـە ئـەمـە ئـەو پـەڕی جـوانیو تـەسـەوری جوانێتییەکەبەجۆرێك لەبەیتەکەی دوای ئەمەدا دەڵێ :

**هـەرچـەنـدە کـە ئینسـانـە لەبـەر چـاوی من و تـۆ**
**مـومکن نییە ئـەم لوطفـە لە ئینسـان و بـەشـەردا**

تەماشاکە چ دەفەرموێ ! دەڵێ هەر چەندە ئینسانە لەبەر چاوی من و تۆ بەڵام هێنـد جوانـە ئەم جـوانییە مـومکین نییـە لە بەشەردا هەبێ ئەمە ئەوپەڕی جوانییە ، دەبێ پەریبێ . یا کە دەڵێ :

**تـاتـایـی سـەری طوڕڕەیـی پـڕ پـێـچشیبـادا**
**هـەر تـایـەکی بـارێکی گـوڵو نـافـە بـە بـا دا**

طوڕڕەی سەری یار : واتا زوڵفەکەی جوانە جگە لەوەی کەهەر تایەك (تاڵێك) لەو طوڕڕە جوانە کـەبجوڵێ بـارێ بۆنی خۆش و گوڵ و موشك (میسك) بە با دا دەدا . بەرادەیەك جوانی یاری باس دەکاو دەڵێ :

**گـوڵ هـاتـە دەرێ لاف لەحـوسـنـی بـوتـی مـادا**
**لەرزی قـەدی بـەرزی لەڕقـا زوڵفـی کـە بـا دا**

گوڵ نموونەی جوانییەبەڵام بوتەکەی نالی گوڵیش نایگاتێ لەجوانیداو دەبێ گوڵ بلەرزێ لەبەر جوانی بـوتی نالیدا . بەجۆرێکی وا کەئەستێرەی (زوهرە) کەبەسەماکەر (رقاصە)ی ئاسمان بەناوبانگە لەبەر جوانی یـار بەو جلە نیلۆفـەرییەوە لەمەیداندا شەرمەندە دەبێ کەدەڵێ :

**شـەو چـەپکـەنی نەیلۆفـەری بـۆ جـیلوەی ڕەقصی**
**شـەرمنـدە دەکـا زوهـرەیی زەهـرا لەسـەمـادا**

یاکەدەڵێ :

**خۆش صوبح دەمێکە کە بە خەندە دەنوێنێ**
**بەس ذەڕڕەیی خۆرشید لەذەڕڕێکی سوهادا**

ئەو پەڕی جوانی سروشتی بەکار هێناوە بۆجوانی یارەکەی چ جوانی‌یەك ؟ پێکەنینی وورشەداری لەبەیاندا . هەروەها تەشبیهی دەمی یار بە غونچە لەبەر جوانی و بچووکی و سوری و تەڕو پاراوی کەدەڵێ :

**دەم دەم کە دەکا زاری پڕ ئازاری بەغونچە**
**بۆ دەعوەتی ماچی لەبە گۆیا دەمی نادا**
یا کە دەڵێ :
**شیرەیی جانە وتم یا مەیە ؟ چابوو فەرمووی**
**عەکسی لەعلی لەبی مەرجانە لە فنجانەمدا**

لەمە جوانتر چی هەیە ؟ شەرابەیاشیلەی گیانەو حەیاتە کە وەلام دەداتەوە دەڵێ عەکسی لەعلی لێوی مەرجانە . لەعل : ئەو بەردەبەنرخە سوورە ئاڵەیە . مەرجان : بەردی بەنرخی سووری مەیلەو پەمەیی‌یە بە واتا عەکسی یا وێنەی لەعلی لێوی سووری وەك مەرجانەلەناو پیاڵەکەدا . جوانترین شتی بەکار هێناوە .

حافظی شیرازی دەڵێ :
**مادر پیالەعکس رخ یار دیدەایم**
**ای بیخبر ز لذت شرب مدام ما[7]**

واتا : شێوەی رووەمەتی (ڕووی) یار دەبینی لەپیالەدا (بەواتا پیاڵەی مەی) ئەی ئەوەی کەبێ ئاگای لە لەززەتی خواردنەوەی شەرابی ساف .
یاکەدەڵێ :
**نالی ئەو نوقطە کە وابوو بەنیشانەی چاوی**
**من لەصەفحەی ڕوخی ئەو دڵبەرەنیشانمدا[8]**

بەراستی ئەو پەڕی جوانی و ووردەکاری‌یە ئەوەندە ڕوومەتی یارەکەی بەناسکی و بلورین لەقەڵەم داوە کەبیلبیلەی چاوی لەڕووی ڕوومەتی یارەکەیدا عەکسی داوەتەوە وەکو خاڵێك .

حافظی شیرازی دەڵێ :
**مردم دیدە زلطف رخ او در رخ او**
**عکس خود دید گمان برد کەمشکین خالیست[9]**

بەواتا : وێنەی بیلبیلەی چاوم لەسەر ڕوومەتی یار عەکسی دایەوەو چاوم وای زانی کەخاڵێکی ڕەشە لەسەر ڕوومەتی . یا کە دەڵێ :

**گەر بێیە دەرێ سەروی ڕەوانی لە ئیرەمدا**
**وەر نەیەیەدەرێ ، ئاهووی چینی لەحەرەمدا[10]**
سەرو : ئەگەر چی بێبەرە بەلام سەرکەش و بالابەرزترین درەختەبە تایبەتی سەروی ئازاد .

ئیرەم : بەهەشتی (شەدداد)کەلەقورئانی پیرۆزدا ناوی هاتووە (ارم ذات العماد ، التی لم یخلق مثلها فی البلاد)(ئایەتی (8) سورەتی (الفجر) .

ئاهوو :ئاسك : جوانترین حەیوانەو ئافرەتی جوان بەتایبەتی چاوی پێ تەشبیەدەکرێ بەلام (ئاهوی چین)خاوەن موشکە(میسکە) .
حەرەم :(کعبة)پیرۆزترین شوێنە لای موسڵمانان . نالی ئەو پەڕی شتی جوان و دانسقەی هەڵبژاردووە ئەوەندە شێفتەی جوانی بووەو جوانی باش ناسیوە هەموشتێکی یارەکەی ئەگەر چی ئەشێ لای خەڵك بەکەم و کوڕی لەقەڵەم درابێ ،ئەو بەجوانی دادەنێ و جۆرە جوانی‌یەکە کە هەر ئەو خۆی دەزانێ چی‌یە .
کە دەڵێ :
**پێم دەڵێن : مەحبوبە خێڵو قیچە مەیلی شەڕ دەکا**
**خێڵو قیچە ، یا ترازووی نازی نەختێ سەر دەکا[11]**

ڕاستە زۆرجار هەیەکە بەعزە شتێ بۆ ئافرەتێکی تایبەتی دەبێ بەنەخش و سلاوی جوانی ، وەکو کەمێ تیلی چاو یا نەرمی چاو ، یاخەوالویی چاو ..
یاکە دەڵێ :

**ئەو چاوەغەزالە فەتەراتی سەرو ماڵە**
**ئەو نەرگسەکاڵە نە منی هێشت و نە کالا**
**حوققەی فەلەکو ل ئەطلەس و ئەستوونەیی زێڕین**
**بێ بێکە بەتارای سەرو ترکەی خەزو والا[12]**

ئەو جوانیانەی کەلەسروشتدا هەن زۆرن بەڵام ئەمانە کە بۆ یار یا لەگەل یاردا بەکار بهێنرێن جوانترن وەك : چاوی غەزال ، نێرگس : کەبۆ چاوی جوان بەکار دەهێنرێ هەروەها ئاسمانی شین و پاکی بێ بەرین .
کۆلکەزێرینە ، هەمووی جوانی یەو جوانن بۆ یارە جا سەیری جوانی و بەکار هێنانی کەلای نالی .شەمس و قەمەرو نوورو ضیا هەموو سەرچاوەی ڕوناکی و جوانین لەسروشتدا ، ئەمانە هەموو جوانن بۆیە نالی ناوی هێناون بەلام کەدەڵێ لادە (دەسرۆکەیی) بۆ ئەوەی ڕووی یار دەرکەوێ شەمس و قەمەرو نووری ڕووی یارەکەی وەکو شەمس و قەمەرو نوری سروشتین ، چونکە لای نالی ئەمانە شەمس و قەمەری ئەون و دەیان پەرستێ .

**لادە دەسرۆکەیی هەوری لە جەبین**
**دەرکەوێ شەمس و قەمەر ، نووروضیا[13]**

نالی کەدەڵێ :

**عاشقی صونعی حەقم قوربانی ڕەنگی قودرەتم**
**چاوی ماوی ، خاڵی شین ، کوڵمی سپی ، زوڵفی سیا[14]**

نالی بەتەواوی لەم بەیتەدا (عیشق) پیشان دەداو دەری دەخا کە ئەو عاشقی جوانی یەو جوانی دەپەرستێ ، لەبەر ئەوەی کە ئەو شتەجوانانە دەهێنن تاکو خۆی لەپێناویاندا بەخت بکا ، چونکە دەستکردو دروستکراوی یەزدانی پاکە کە سەرچاوەی جوانی و عیشق و خۆشەویستی یە . نالی کەشەیدای جوانی یەو لەهەموو شتێکا جوانی یەك هەڵدەبژێرێ بەواتا نالی لە عیشقدا ئەوپەڕی گرتووە کەدەڵێ :

**هەم واریثی فەرهادمو هەم نائیبی مەجنوون**
**واتێمەگە ، قوربان ، کەگەدا بولهەوەسێکم[15]**

بەواتا من عاشقی ڕاستەقینەم و شوێن و ڕێی فەرهادو مەجنوونم گرتووە نەك ئارەزووباز ، من بەدڵ شێت و شەیدام . لێرەدا نالی خۆشەویستی یەکەی وەکو ئەوەیە کەلای حافزی شیرازی هەیەو بەکاری هێناوە وەکو هۆیەك بۆ بەیانی جوانی و جوان پەرستی ، چونکە نالی لەبنەرەتا سروش (ئیلهامی) عیشق و خۆشەویستی لەوێنەی جوانی سروشت و لەجوانی (کائینات) ەوە وەرگرتووە [16]حافز دەڵێ :

**در ازل پرتو حسنت ز تجلی دم زد**
**عشق پیدا شدو اتش بهمه عالم زد[17]**

یا کە دەڵێ :

**مەجلسێکی چەمەن و بولبول و بەزمی گوڵ و مول**
**بە دوصەد مەدرەسەوو دەرس و کیتابی نادەم[18]**

هێندێ لەو شتە جوان و خۆشانەی کە لە سروشتدا هەن ئەمانەن کەنالی ناویان دەبا : چەمەن ، بولبول ، بەزمی گوڵ و شەراب : ئەو پەڕی جوانی و خۆشی هێنەرن .
یا کە دەڵێ :

**خاڵت چیە؟ دانەی گەنمی جەننەتی ڕووتە**
**چاوت چیە ؟ فیتنەی حەرەمی قیبلەیی ئەبرۆ[19]**

جوانی خاڵ لەسەر کۆناو شوبهاندنی بەدانەی گەنمی بەهەشت کە بوو بەهۆی ئەوەی ئادەم ببێ بەداوەوەو لەبەهەشت دەرکرێ ، هەروەها (ڕوو) کەلەجوانیدا وەك بەهەشتە چاو کە فیتنەی حەرەمی قیبلەی ئەبرۆیە چونکە ئەبرۆ قیبلەی (عوشاقانە) وەبە هۆی چاوەکانی یەوە کە مەستن لەدینی یان لادەدا .
حافز دەڵێ :

**خالی مشکین که بدان عارض گندمگونست**
**سرّ آن دانه که شد رهزن ادم با اوست**

بەواتا : خالی میسکی‌میسك ڕەشەو بۆنی خۆشەکە لەسەر ئەو ڕوومەتە سەوزەی گەنم ڕەنگی‌یە ، سرری ئەو دانەیەی هەیە کەڕێی لەئادەم گرت «گومرای کرد» ،«خالی میسکی‌یەکەوەك گەنمی لەسەر کوڵی گوڵینی ئەوڕازی ئەو دانەیەیە ، کەئادەمی گومراکرد»

یاکەدەڵێ :

**ڕەیاحین پەرچەمو ، لالە کولاەو ، یاسەمەن طوڕڕە**
**بەنەفشە خاڵو نەرگس چاوو گوڵزارو سەمەن ساقە**

لەمانە جوانتر چی هەن کەیەکێ بتوانێ جوانی یاری پێ تەشبیەکا ، هەموو جوانن‌و جوانییان لێ دەبارێ .

یا کە دەڵێ :

**(مانی) نییەتی قووەتی تەصویری بڕۆی تۆ**
**ئەم قەوسە بەدەستی موتەنەففیس نەکشاوە**
**بۆچی نەگریم ، صەد کەڕەتم دڵ دەشکێنی**
**بۆ مەی نەڕژێ شیشە لە صەد لاوەشکاوە**

جوانی بڕۆی یار لای نالی بەئەندازەیەکە کە«مانی» نەقاشی بەناوبانگ هێزو توانایی«تەصویری»بڕۆی یاری نییە ، ئەوقەوس‌و هیلالی‌یەی» کەلەبڕۆی‌داهەیە بەدەستی ئادەمیزاد دروست نەکراوەو شتێکە خواکردەو هەر ئەوە کەئەو وێنەیەی کێشاوە وابەو جوانی‌یە .

لەبەیتی دووەمدا کەدەڵێ : بۆچی نەگریم ، بەڕاستی بڕواناکەم وێنەلەمەجوانتر هەبێ کەشیشەی شەڕابی سووری هەناری شکابێ‌و شەڕابە ڕومانی‌یەکەی لێ بڕژێ وەك دڵی نالی کەخوێنی لێ دەڕژێ ، تەنانەت بۆ خوێن ڕژانەکەشی شتی جوانی بەکار هێناوە کەشوشەی شەرابی هەناری‌یە .

جوانی غونچەی گوڵی سور «گوڵەباغ» کەگۆی مەمکەکانی یاری پێ چواندووە ، بالای بە«گوڵبن» بەواتا درەختی گوڵ ، جا«قوببەی»سینە کەمەبەستی لەجووتە مەمکەکانێتی ، یەك لەیەك جوانترن‌و ئەو پەڕی جوانپەرستی پیشان دەدا ، جگەلەوە وێنەی شیری سپی کەلەگۆی مەمکی ئافرەت دێتە خوارێ هەروەکو چۆن نەی شەکر کەشەکر دەگرێ ، لەم بەیتەدا کە دەڵێ :

**هەناسەم زوڵفەکەی لاداوو مەیلێکی نەکرد چاوی**
**نەسیم ئەنگووت‌و شەو ڕابوردو نەرگس هەر لەخەودایە**

کەسەیری ئەم بەیتە دەکەین وەکو ـ تابلۆیەك شریتێکی سینەما هەموو جوانی‌یەك‌و شیرینی‌یەك‌و ئارامی‌یەکت دێتەبەرچاو ، یاکەدەڵێ :

**بیری مەجنوونە وجوودم لەهەموو بەر بەرییە**
**نەکەسێ مونتەفیعی‌یەك بەری یاسێبەرییە**

لێرەدا دەیەوێ بڵێ من وەکو (بید) بی (مجنون) شۆڕەبی وام بێ سودم . بەڵام لەهەمان کاتدا جوانی لەبیرنەچۆتەوە چونکە«بید مجنون» شۆڕەبی باسودو بەری نەبێ بەڵام تابڵێی جوانەو سێبەرێکی کڕی هەیەو لەشوێنێکا دەبێ بەواتا دەڕوێ کەژیانی تیادابێ بەواتا کەئاو هەبێ .لەئەدەبیاتی فارسیش‌دا «بیدمجنون» بۆ جوانی بەکار هاتووە .کەدەڵێ :

**لۆمەیی نالی‌یی دێوانە مەکەن ئەی عوقەلا**
**ئەمەموودێکە زەدەی لەطمەیی دەستی پەرییە**

کەدەڵێ لۆمەی مەکەن لەوانەیە قسەی لەجێی خۆیدا نەمابێ چونکە دەستی لێ وەشێنراوە ، بەڵام دەست لێ وەشاندن کەئەبێ بەهۆی شێتی‌یەوە جنۆکەیە بەڵام لای نالی جنۆکە نی‌یە «پەری»یە کەنمونەی جوانی‌یە دەستی لێ وەشاندووە نەك جنۆکەی چەپەڵی دوژمنی ئینسان ، وە یا کە دەڵێ :

**خارایی سەوزو شینی لەبەر کردووە جەبەل**
**دامێنی وەردی سورە کەدەستم بەدامەنی**

جوانی بەهار ، تەڕوپاراوی مانگی نەورۆزی کوردستان پیشان دەدا بەووردی‌و بەکورتی . جگە لەوەی کەهەر ئەم ڕەنگانەیە

کەئافرەتی کوردستـان وەك سروشتی کـوردستان خـۆی بێ دەرازێنێتەوە ، یا کە دەڵێ :

**وەك دوڕو یـاقـووت نـەقـشـە : دنـدان و لـەبـی ئـاڵی**
**هەر وەك بەڕەزا پەخشە : ئەگریجە لەسەر خاڵی**

جـوانی دوڕو یاقـوت ، لەبی ئاڵی ، هـەروەها بـەڕەزا کەگیایەکی هەتا بڵێی سەوزو نازك و جوانە کەلەدرزو لای شاخە بەرزەکانمانەوە وەك ئەگریجەی ئافرەت شۆڕدەبێتەوە ، جگە لەجوانی خاڵ ، هەموو جوانی یەو جوان پەرستی و شارەزایی حەزرەتی نالی دەردەخا .

* * *

ئەوەی لەم چەند لاپەڕەیە دا پیشان درا قەترەیەکە لەدەریای بەرزی و هونەرمەنـدی و جوانی و جـوان پەرستی لای نـالی ، چونکە ئەگەر بتەوێ هەمووشیعرەکـانی بگریت لەوزەی ئـەم چەند لاپـەڕەیەدا نی یـە جاهـەر وەکو کـورد دەڵێت «مشتێ موونەی خەروارێکە»

**پەراوێزو سەرچاوەو کتێب :**

١-١ (المتنبی) : ناوونەسەبی (احمد کوڕی حوسەینە) و «کونیەی ئبـوالطیب و لەقەبی متنبی» یـە . لەساڵی 303 کـۆچی لەگـەڕەکی کیندی کوفە لەدایك بووە ... لەگەڕانەوەیدا لەفارسەوە بۆ بەغدا لەنزیکی بەغدا لەساڵی 354کۆچیدا کوژرا ، لەشاعیرە هەرە بـەرزو بـەناوبـانگەکـانی زمان و ئـەدەبیاتی عـەرەبە .شـاعیری ئێـرانی بەناوبانگ «سعدی شیرازی» زۆر لەژێر کاریگەری «متنبی»دابووە ، «متنبی وسعدی»د. حسین علی محفوظ 1336 شمس تاران .

ب - (ابـو العـلا المـعـری) لەسـاڵی 979 ی زاینـیدا لە«معـرة النعمـان»لەسووریـە لەدایك بـووە لەچوار سـاڵانیدا کوێر بـووە لە(حەلەب و ئەنطاکیەو طەرابولس) خوێندوویەتی تـالەساڵی 1058 زاینیدا کـۆچی دوایی کردووە شـاعیرێکی بـەرزو فـەیلەسـوفێکی عەرەبە .

ج - نیزامی : (نیزامی کنجوی ، ابو محمد الیاس یـوسف نظامی) شاعیرو اوستادی گەورەی ئـەدەبیاتی فـارسی یە خـاوەنی (مخزن الاسرار — خسرو شیرین — لیلی ومجنون — هفت پیکر — اسکندر نامە)یە جگەلەدیوانی قەسیدەو غەزەل لەساڵی 1217 کۆچی داکۆچی کردووە .

د - (سـعـدی - مشـرف کـوڕی مـصـلح) سـعـدی شیـرازی لەشاعیرەبەناوبانگەکانی ئێرانە کەلەساڵی 1294 زاینی کۆچی دوایی کردووەو خاوەنی (گولستان و بـوستان)ە شـاعیرانی کـورد لەژێر کاریگەری «سعدی و نظامی و حافظ و مولانا جامی»دا بوون .

هـ - حافز (خواجەشمس الدین محمد بهاءالدین حافظی شیـرازی) لەشاعیرە بەناوبانگەکانی ئێرانی یـەو شاعیـرو اوستادی غـەزەلی سۆفیانەیە لەساڵی 1389 زاینی دا کۆچی دوایی کردووە .

و - (نامق کمال) : شاعیری تورکی سەردەمی (تنظیمات) لە ١٨٤٠ز لەدایك بووەو لەساڵی 1888 ز کۆچی دوایی کردووە ،

ز - «توفیق فیکرت» ، شاعیری تورکی سەردەمی (ثروت فنون) ە ، لە 22 کانوونی یەکەمی 1867 ز لەدایك بووەو لە 8 گەلی 1915 کۆچی دوایی کردووە .

ح - (عبدالحق حامـد) : شاعیـری تورکی سـەردەمی (تنظیمـات و ثروت فنون) لەئەدەبیاتی تورکی دا لە 5 شوباتی 1852 لەدایك بووە لە 13 نیسانی 1937 ز کۆچی دوایی کردووە .

2 - بۆ سەیری بەیتەکان تکایەتەماشای یەکێ لەم دیوانانـەی نالی بفەرموون :

ا - مەلا عبدالکریم مدرس - دیوانی نالی - بەغدا 1976 لەمەودوا کەناوی ئەم دیوانە دێت بۆ ئاسانی «نالی - مدرس» بەکار دەهێنین .

ب - دوکتـۆر مـارف خـەزنـەدار — دیـوانی نـالی و فـەرهـەنگی نالی — بەغدا 1977 بۆ ئاسانی «نالی — خەزنەدار»بەکاردێت .

ج - اقـای علی مقبـل — دیوانی نـالی - سنندج 1327 شمسی - بـۆ ئاسانی «نالی - مقبل»بەکاردێت .

3 - نالی - مدرس ل 57
= خەزنەدار ل 40
= مقبل ل 3

3 - ئـەمە (حـدیثی قدسی)پێ دەڵێن

4 - نالی ل 79 ، نالی خەزنەدار ل 45 نالی مقبل ل 5
5 - نالی مدرس ل 83، نالی خەزنەدار ل 44، نالی مقبل ل 4
6 - نالی مدرس ل 92 نالی خەزنەدار ل 40 نالی مقبل ل 4
7 - دیوانی (خواجەحافزی شیرازی) محمد قزوینی ودکتـۆر قاسم غنی — تاران - ل 9
8 - نالی مدرس ل 92 نالی خەزنەدار ل 40 نالی مقبل ل 4
9 - دیوانی (خواجە حافزی شیرازی)محمد قزوینی ودکتـۆر قاسم غنی - تاران - ل 47
10 - نالی مدرس ل 93 نالی خەزنەدار ل 47 نالی مقبل ل 9
11 - نالی مدرس ل 100 نالی خەزنەدار ل 54 نالی مقبل ل 9

12 ـ نالی مدرس ل 117 ، نالی خەزنەدار ل 40 ، نالی مقبل ل 7

13 ـ نالی مدرس ل 125 ، نالی خەزنەدار ل 61 ، نالی مقبل ل 7

14 ـ نالی مدرس ل 125 ، نالی خەزنەدار ل 42 ، نالی مقبل ل 16

15 ـ نالی مدرس ل 285 ، نالی خەزنەدار ل 77 ، نالی مقبل ل 28

16 ـ («دکتور شمس الدین احمد» سەروکی بەشی فارسی دانشگای کشمیر لە «مقالە»کەیدا بەناوی «حافظو جمال پرستی»دا دەڵێ ووشەی «عیشق» کەحافظ لەشیعرەکانی خۆیدا زۆر تر بەکاری هێناوە . هۆیەکە بۆ بەیانی هەستی جوان پەرستی خۆی چونکە هەر وەکو گوتمان «حافز» لەبنەڕەتا سروشی «ئیلهامی» عیشق لەوێنەی سروشتیو «کائینات» وەرگرتووە..) ـ (مقالاتی دربارەء زندگیو شعر حافظ بەکوشش دکتر منصور رستگار چاپ دوم ـ شیراز ، 1360 شمسی ل 29 )

17 ـ (دیوانی خواجە حافز شیرازی) محمد قزوینیو دوکتور قاسم غنی ل 103

18 ـ نالی مدرس ل 306 ، نالی خەزنەدار ل 72 ، نالی مقبل ل 28

19 ـ نالی مدرس ل 306 ، نالی خەزنەدار ل 80 ، نالی مقبل ل 32

20 ـ سەرچاوەی ژمارە ( 17 ) ـ ل 41

21 ـ نالی مدرس ل 455 ، نالی خەزنەدار ل 97 ، نالی مقبل ل 42

22 ـ نالی مدرس ل 535 ، نالی خەزنەدار ل 105 ، نالی مقبل ل 35 — 38

22 ـ مانی (نەقاشێکی بەناوو بانگ بووە لەزەمانی (اردشیر) یا لەرەمانی «بهرام شاد» بووە داوای پێغەمبەرێتی کردووە ، بارام شا کوشتی . لەکتێبەکانی «ارژنگ»ە کەپڕە لەوێنەو شتی جوان ، جگە لەکتێبی «شاپورگان» .

23 ـ نالی مدرس ل 569 ، نالی خەزنەدار ل 113 ، نالی مقبل ل 43

24 ـ نالی مدرس ل 586 ، نالی خەزنەدار ل 116 ، نالی مقبل ل 43

25 ـ نالی مدرس ل 587 ، نالی خەزنەدار ل 116 ، نالی مقبل ل 44

26 ـ نالی مدرس ل 662 ، نالی خەزنەدار ل 122 ، نالی مقبل ل 66

27 ـ نالی مدرس ل 717

جگە لەو سەرچاوەو کتێبانەی کەناویان لەپەراوێزەکاندا هاتووە سوود لەم سەرچاوەو کتێبانەش وەرگیراوە ،


1 ـ علاءالدین سجادی مێژووی ئەدەبی کوردی بەغدا چاپی دووەم 1971

2 ـ مسعود محمد ـ چەپکێك لەگوڵزاری نالی ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری بەغدا 1974

3 ـ گنج سخن ـ جلد دوم ـ از نظامی تا جامی دکتر ذبیح الله صفا تهران 1364

4 ـ برهان قاطع جلدچهارم ـ تهران 1334 — 1335


# گەلە گورگ

## پێشەکی

پێش ئەم بهێنە سەر ڕاڤە کرنا ڤێ چیروکێ ، مە دڤێت بێژین کۆ کاك حسین عارف خودانێ تاقي کرنەکا دیرو درێژە دچیروکا کوردیدا کۆ دگەهتە نێزیکی سی سالا هەر هۆسا سەیدا «حوسێن عارف» خۆدانێ ڤێ تاقی کرنا درێژ ، گەلەك جارا یێ هاتیە خەتابار کرن کۆ قارەمانێت چیروکێت وی دویرن ژ کۆمەلێ کوردەواری ، نەمازە ڕەخنەگر بەحسێ وان چیروکێت ناڤبری دکەن ئەڤێن ل پشتی سالا (1970) ێ ، نڤێسین ئاشکراتر پشتی [مانڤێستا] ڕوانگە بلاڤ بووی کۆ سەیدا حوسێن ئێك ژ پێشەوایێت وێ دەستەکێ بوو .

ل ڤێرە هەکە ئەم بیرو باوەرێت هەمی ڕەخنەگرا بهینین دێ بیتە درێژ پێدان تنێ دێ گۆتنا سێ ژوان کەینە بەلگێ ئاخڤتنا خۆ ، سەیدا [عبدالرزاق بیمار]و سەیدا فوئاد قەرەداغی ئێك دگرن لڤی بابەتی دەمێ بیمار دبێژیت :

[ئەگەر بە چاوی کوردایەتیشەوە سەیری قارەمانەکە بکەین نە لە ڕەنگو سیمای هەڵسو کەوتدا نە لەبیرو زۆربەی ئەندێشەکانیدا ڕەنگو دروشمی کوردانەی تەواو ڕوەتی نیە ، تایبەتییەکانی نەتەوایەتی لێ ڕەنگ نەداتەوە][1] هەر وەکو قەرەداغی دەڵێ [پاڵەوانەکە وەك یەکێکی خەیاڵی ئەکەوێتە ڕوو وەك لەوەی کەسێکی واقعی بێت لە وولاتێکدا بژیو ئینتمای نەتەوایەتی خۆی هەبێت]

هەر چەندە د . عیزەدین مستەفای باوەری یا هەی ب شیانا چیرۆك نڤێسێ ناڤبری بەلێ ئەو ژی وی خەتابار دکەن کو قارەمانێت وی گەلەك جارا ڕەنگێ خۆمالیەتی نینە وەك دبێژیت [سوور بوون لە سەر زاڵ بوونی ڕوخسارو بەکار هێنانی

# لبـــەر تیشکا رەخنێ

انور محمد طاهر

ـەکـیکی تازە تر زۆر جار مرۆڤەکـە وون دەکاتو سـەرەتای
ـسـو ـدنی روخسـاری مرۆڤی خـۆماڵی دادەمـەزرێنێت ئـەو
ـمـ ـنێ چی دەکاو هەمو پردەکـانی نێوان خـۆیو ریالیـزمی
ـەـ ـووخاندو ڕێگەی گەڕانەوەی هێشتـوتەوە بـەلام پاش ئـەو
ـەـ ـۆر چیرۆکدا زۆر ناوەستایە چیێ بێ رەنگ بۆ مەنـەلووژو
ـیـلوك فلاش بـاك دەکاتو مـەودا (بُعـد) فـرێ دەرێتـەوە
چیرۆکەوەو هـەندێکیش تـەواو پشت دەکەنـە مرۆڤی کـوردو
مێژووی بە ناوی هونەرەوە [خَسرَ الدنیا والآخرة*] ئەز دبێژم
ئەگەرێ ڤێ خەتابار کرنێ دگەڕیتە دوو هۆیا :ـ

- هەر مێ سەیدایێت هێژا ژ ئێـك بیرو بـاوەڕێت فەلسـەڤ
ـیـالکتیکی ڤێ چەنـدێ ڕاڤە دکـەن ئەڤ قـوتابخـانێت
سریالیو شـەپۆلا هـوشیاری [تیـار الوعي] ب تشتەکێ
ئەرەوا ل قەلەم ددەن .

ـة - قارەمانێت چیرۆکێت سەیدا «حوسێن عارفو ئـۆ گەلەك
چیروك نڤیسێت دی وەك محمد موکری ، رەئوف بێگەردو
صەلاح شوان جیاوازی یا هەی دگەل چیرۆکێت کوردی
بێت سالایێت [شێستێو] بەرو خارتر ئەو ژی دکرێتە دوو
ئەگەرێت دی :ـ

- ئەو بارو زروڤێت ڕامیاری و کۆمەلایەتی یێ ملەتێ مە یێ
کورد تێدا دژیت گەلەك جۆدای یـا هەی دگـەل سالایێت
پێشیێ چ ب ئـالێ ڕامیاری ڤـە چ ب ئالێ پێشکـەڤتنێ ،
مەبەستـا مە مـرۆڤێ کورد ئـالوز بوونو گیـرو گرفتێت
شارستانیەتێ [ازمات حضارية] یێ لدەڤ پەیدا بوین .

ب - چیرۆك نڤیسێ کورد خۆد گۆهێ گای دا نە نڤستیە !! هزرو
بیرێت نوی ئەڤێن ل ئـەدەبێ ئۆرپـای پەیـدا بووین یێ
ئاگادارە ژ سریالیو دادیو شەپۆلا هوشیاریو فەلسەفا
وجودی ئۆ نڤشتوکێت کافکاو جێمس جویسو سـارتەرو
کامی و .. هتد . دخوینیتو یێ «متأثر» دبیت ..

**«گەلە گورگ»**

ئەڤ چیروکە ژ کۆمەلا چیروکیت وی مە یا هەلبژارتی* .
ئەڤ چیرۆکە ب ڕەنگێ خارێ مەیا ڕاڤە کری

**1 - قارەمانێت چیروکێ**
**2 - شەڕەنیخ د چیروکێدا**
**3 - جهـ «المكان» د چیروکێدا**
**4 - دەم «الزمان» د چیروکێدا**
**5 - دویماهیك .**

## 1 - قارەمانێت چیروکێ

**ا - بارام :**

قارەمانێ سەرەکی یێ چیروکێیە گەلەك چیرۆك نڤێس بۆمە وەسف دکەت کۆکەسێ سیهەمێ تاکە یان هندە جارا بارام خۆدهێتە پێش وەك چیروك بێژێ شانوییێ .

چیرۆك نڤێس بۆ مـە بارامی وەسف دکـەت کۆ لاوەکێ بیستو شەش سالە ژیێ وی یێ ڕاپێچـایە ب جـلو بەرگێت کوردی .

ساکویەکێ [«پالتو» لەشکری گەلەك دەما یێ لبەر ئەڤە وەسفـا دیمەنێ قـارەمانی یێ دەرڤـەیە بـارام کۆ قـارەمانێ چیروکێیە مرۆڤەکێ بێ تاقی کرنو سەر بۆرە هزرو بیرێت وی

گەلەك ژ پاشماوەیت بابێ وینە وەك ئەو دبێژیت . [ نازانم من بە چاوی خۆم نەمدیووە بەلام ئاموژگاری‌ی باوو باپیرانـە ڕێ‌ی تێدە چێ ..][4] .

پـلا خانـدن‌و ڕوشنبیریـا وی ئـامـادەیـا کشت‌و کـالێ بدویماهی هینای وەك دبێژت [بە درێژایی خـوێندنمـان هەتـا ئامادەیی کشت‌و کاڵان تەواو کرد هەر پێکەوە بووین][5] .

ئەز دبێژم چیرۆك نڤێس ئەڤە یا هینای دا سەرێ ڕێکا لبەر خوێندەواری بەرزە کەت

**«چ ئێك گرتن هەیە ل نـاڤ بەینـا ڤی قارەمـانی‌و چیرۆك نڤێسی ؟»**

نڤیسەرو شاعرێ ئەلمانی یی مەزن جوهان ڤـون گۆتـە دبێژیت «هەر نڤێسەرەك بەحسێ خۆ بۆ مە دکەت ل نڤێسینێت خۆدا هەر چەندە ئەڤە نە مەبەستا ویە[6]»

یان ئیڤان خـوتسارف ڕەخنـەگرێ سـوڤیاتی دبێـژیت [نڤێسەر دڤێت بێ وردو هێمن بیت ل پشکنینا ژیانا خەلکی ب ڕەنگەکێ کشتی هەکە نڤێسینا وی دێ پیتـە رویدانـا خۆدی (ذات) وی زێدەتر نە][7] .

ل ڤێرە مەبەستا مە نینە کـۆ چەنـد ژ سەدێ نڤێسـەر بەحسێ یاداشت‌و ژیاننامـا خۆ دکەت بەلێ ئەم دشێین بێژین کو ئەڤ قارەمانە نێزیکە کو چیرۆك نڤێس بەحسێخۆ دکەت . بەلێ بارا پێتر رومان نڤێس‌و چیروك نڤێسێت جیهانێ ژیان‌و تـاقی کرنێت وان یا ڕەنگ دای ل بەرهەمێت وان .

بەلێ نابیت قارەمانێ چیرۆك نڤیسی دانینە بن چادرەکا سیاسی‌و دەست‌و پێیا لێ گرێدین بەلێ یا فرە ڕەنگ‌و سیمـای‌و تایبەتێت وی بزانین دا دەرگەهێ چیروکێ لە ڤەبیت ئەو ژی ئەڤ خالێت خارێ تە :ـ

1 ـ مرۆڤەکێ بەرڵلایە ئۆ یێ دویرە ژ هەمی حیزب‌و تاقمێت سیاسی نەبەسی ئەڤە بتنێ هەتا گەلەك دگەل «ویسێ» هەڤالێ خۆ کۆل هەرسێ قوناغێت قوتابخانێ پێکڤە بوون ژێ نەرازیە چونکی مروڤێ سەر ب تاقمێ سیاسي هـەبیت لبا چیـرۆك نڤێس وەك کەرێ پەزیە نە دەنگەو نە بەنگە بەسی ڕێکا لێ دبن ڤێت لێ بچیت وەك زار دەڤێ قـارەمانێ چیـروکی بارامی دبێـژیت [مەگـەر حیزبەکەت فەرمانت پێ بدا ئەمایان دەبی فەرمانی حیزب لە لای ئێوە ڕەتکردنەوەی بۆ نی‌یە کە دەلێ بمرن دەمرن وەڵلاهی سەیرن][8] . هەر چیرۆك نڤێس لڤێ چەندێ نـاراوستێت بەلێ مرۆڤی سیاسەتکار گەلەك دڤێت دویر بکەڤیت ژێ چنکی ل دەڤ وی هـەر ئاخڤتن‌و پـەیڤێت زل‌و مەزنن دەمێ بـارام بەحسێ وەیسەی هەڤالێ خۆ دکـەت پشتی کەتیـە داڤێت سیاسـەتێ دبێژیت :ـ

[کەچی کەوتیتە داوی سیاسەتەوە ئیتر نەعوزو بیلا لێم بوویتە فەیلوسووفێك][9] .

هەر وەکو ئەو دگەل خۆ دبێژیت زار دەڤێ وەیسەی کۆ مرۆڤەکێ خەیالی‌یە ئۆ ل واقعی نـاژیت [ـ هۆ .. هـۆ بارامـە خەیالاویەکە دەرگام لێ بکەرەوە ، هاتووم جارێکی تر لە خەیالە پڕ سەیرو سەمەرەکەت بدوێین][10] .

هەر هۆسا قارەمانێ چیروکا گەلە گورگ مرۆڤەکێ گۆشە گیرێ ڤی چەرخی‌یە ، [وضوح الرؤیا] ل دەڤ نینە جاران دبیتە مرۆڤەکێ «مثالی» دڤێت دویر بکـەڤیت ژ خەلکی هـەمیا ئـۆ ل کۆمارا ئەفلاطونی بۆ شاعیران بەحسی ژێ کری‌و وێ دروست کەت‌و . ئۆ دویر کەڤیت ژ خەلکی ئاوایی وەك دبێـژیت [تاکـە خانوویەکی تەریکی دور ئاوا دوور لە ئاوایی یان کردووە][11] .

ئەڤ دویر کەتنە ب مال‌و خێزانا خۆڤە یێ هاتیە ڕەت کرن ژ هەمی کەس‌و کارێت وی بەلێ ڤەت گوهـ نەدایێ مەسەلە یا کریە «حدّي» بەلێ ئاخڤتنا ڤی بەری چیرۆك نڤێسی نەقل دکەت کۆ دبێژیت :

[بە خەیاڵ شتێکی خۆشە بەلام بە کردار ڤەت نا هێنرێتە دی][12] نەبەس ئەڤ چەندە چیرۆك نڤێسی دڤێت قارەمانێ وی مرۆڤەکێ یاخی بووی بیت ژ کۆمەلی ڤەت نێزیکی وان جـۆرە کەسا نەبیت هەتا هەڤالێ وی وەیە هەکە هاتبا ڤێ [کۆمارا] بخو دروست کری بریار دا دەرکەت وەك دبێژیت [ئەم وتەی عەلەیکە سەلام‌و نە عەلەیکە‌سەلامەی خەونەکەمت چۆن لە بیر مابوو یا کە تۆ دەتـزانی ئەوە بـڕیارێـك بوو دابـوم ئیتر چـۆن هاتیت بەلام ... نا ... نا ئیبلیسیت بە تـایبەتی لەو وەختـەوەی ... دەستت دایـە سیـاسـەت سـوور دەتـزانی چ وەرامێکی تـۆ

ـحدمەوە گوایە بەتۆ بلێم نەعەلەیکە سەلام برۆ وەلبە][13] .

... یان خەلك هاتن ل دەڤ دوزەخێ بۆ دروست دکەن نەڤە ژی گەلەك نێزیکی گۆتنەکا سارتەری‌یە ئەڤا بێژیت [دوزەخ ئەوە ئەڤا خەلك بۆتە دروست دکەت] .

وەك بارام دبێژیت

[خەڵکێکی بێ شومار بە نیازی هەروا بۆ سەعاتە وەختێك ـوور کەوتنەوە لە دۆزەخەکەی خۆیان‌و حەوانەوە لە ـەهەشتەکەی تۆدا ڕۆژانە کەوتنە ڕێچکە بەستن بو لات چی ـمکەیت ؟ دیارە هیچ ریسەکەت لێدەبیتەوە بە خوری ـەهەشتەکەت دە بیتەوە بە دوزەخ][14] .

... قارەمانێ چیروکێ کۆ ناڤێ وی بارامە گەلەك هەلبژاردنا خۆدا یێ سەربەستە وەك قارەمانەکێ [وجودی] ماڤێ هەلبژادنێ یێ هەی ئو ئەڤ رێك‌و ئالوزبوونا کەتیە تێدا قەت چ چەرخ‌و فەلەکا تاوانبار ناکەت وەك قارەمانێت چیروکێت ـوملنسی‌و هەتا رادەیەکێ هندە چیرۆك نڤێسێت ڕیالزمی یەعنی مروڤ یێ سەربەستە ل وێ ڕێکا لێ دچیت چنکی ئەو ڕێك ب ـکرە زویا خۆیا هلبژارتی دەمێ قارەمانێ ژکومەلی ڤەدەرکەتی ئەو بتنێ بەر پسیارە کەسێ دی نە وەك دبێژیت :ـ

[خەتا خەتای خۆمە دەبێ شانی بدەمە بەر][15] ، هەتا یێ سەربەست بۆ دەمێ جهـ بخو هەلبژارتی ب هەمی ئارەزوو نیڤا ـلێ خۆ وەك دبێژیت : [کوێت پێ باشە بچو بە ئارەزووی خۆت هەلبژێرە ، لەوەی هەمانە کامی بە دڵی تۆیە دەستی بخەرە سەرو بلێم بە سەر چاو][16] .

ئەرێ ئەم دشێین بێژین قارەمانێ چیروکێ مروڤەکێ (وجودی)یە یان نە ؟ !

موّرکا ئاشکرا یا هەی ئەدەبێ وجودی کۆ قەلەقە

ئەو ژی (قەلەق) بەلێ هەر چەندە قارەمانێ کاك [حوسێنی] هەست ب ترسێ دکەت پێتر ژ [قەلەقێ] ئۆ ترسی‌و قەلەق، گەلەك ژ ئێك جودانە .

[د . عبدالرحمن بدوی][17] بەحسێ ڤێ جودایێ دکەت دبێژیت [دڤیت ئەم تێکهل نەکەین ل ناڤ بەینا قەلەق‌و هەمی جوّرێت ترسێ چنکی ترسی ژ تشتەکێ دیارو دەست نیشان کریە بەلێ قەلەق نە ژ تشتەکی تایبەتی‌و بۆ مروڤێ تنی ژ گەلەك تشتانە بۆ مروڤایەتی هەمی وەك قەلەقا مروڤی ژ جیهانێ‌و گیرو گرفتێت وێ ئو چارە نووسا مروڤایەتی یە کا دێ گەهتە چ دەراڤ قەلەق ل دەڤ مروڤی یا هەی بەس لدەڤ حەیوانا نینە .

بەلێ رێبەرو فەیلەسوفێ وجودیەتێ سارتر پێناسا قەلەقێ دکەت‌و دبێژیت [قەلەق تشتەکێ مروڤایەتی‌یە هەبونا مروڤی وەك خود (ذات) کۆ مروڤ بەر پسیارێ چارە نووسا خۆیە ڤێجا ژبەر هندێ مروڤ یێ پێ کۆلێ دکەت دابگهتە ئارمانجێت خو ئەوێنی دڤێت بدەستێ خۆ ڤە بهینیت ئەڤە دبیتە هو یێ داهینانێ][18] .

ڤێجا ئەڤ قارەمانە دگەل گریا چیروکێ دەست پێ دکەت یێ [قەلەقە] سەر چ ؟ سەر هەمی ئالو گۆرا وەك بارام بخو بەحس دکەت کۆ قەلەق یا هەی چ ڕێبازو تاقیمێت سیاسی نەشێن دروست بکەن وەك ئەو دبێژیت [منیشی گوشە گیرێکی هەلاتوو لە کومەڵ تۆ دەتەوێ گوایە بە سیاسەت چاکی بکەیت][19] بەلێ پێتر کۆ وی قارەمانی (قەلەق) هەبیت گەلەك ترسی یا هەی ژگورگی هەر چەندە هەکە ڕەمز بیت «ترسی» دبیتە تشتەکێ رموا ، ڤێجا قەلەق ترسی ل دەڤ قارەمانی دبیتە ئێك معادلە ئەو ژی دەمێ دبێژتە ئایشێ

[نازانم لە شتێك دەترسم نازانم چی‌یە .

ـ ئایش گیان خۆت مەشلەژێنە یانێ مەبەستم ئەوەیە بلێم خۆت مەترسێنە][20] ئەڤ قارەمانە گەلەك یێ ر ق‌و کینە سەر کۆمەلی مروڤێ یاخی بووی شۆرشگێر مللەتی بهاژوت لدیڤ بیرو باوەرێت خو سەخمراتا پێشکەڤتنێ نەکو دا بن گۆرکەت ئەڤ رەق‌و کەرب‌و کینە نە یا پیروزە بەلێ گەلەك نەچینایەتی بەلکو یا عەشایریە چنکی خزم‌و کەسێت خو نەبی نەڤێت دی ل ئاوای دژین هەمی گورگی وەك بارام دبێژیت [با بچینە ناو ئاوایی لەوێ لە گەڵ گورگە هاوەڵیاندا دەس بدەنە یەخەی یەکتری هەر دووکیان دایە قاقای پێکەنین ئایش هەر بەدەم پێکەنینەوە وتی :ـ

ـ ئەی باوکم دایکم ئەی کاکم‌و ...

ـ نا ئەوان نا .. ئەوانی لێدەرچن][21]

بەلێ قارەمانێ چیرۆکە کۆ بارامە ل دویماهی‌یە چیرۆك نڤێسی دەست وی دگریت تووشی داشکەستنێ دکەت ئەڤ ڕێکە

بخـو هەلبـژاردی کو بـەرامبـەری سـر وشت و بـاو زەریـان و بەرهنگاری و خەباتەکا ژین و مرنا دگەل گورگا کری کـو قەت نەکەریتە ناف کومەل و خەلکی بەلێ دەمێ سپێدێ داتێت ئو رۆژ هەلێت گورگ دڕەڤن پێش قارەمان کەیف شادیێت سەرکەفتنێ بکەت ، ئەف زحمەت و ئازار چو بەر ئافێ دا دچیت دەمێ دبێژتە ژنا خو ئامادە بکە دا بچینە ناف گورگێت دوو پێ وەک [جـل و بەرگی پێوستی مندالەکان و خوم و خوت بپێچەرەوە ئامـادەبن دەچینەوە ناو کومەلگای گورگی دوو پێ]

ئایە کاک حوسێنی بو ؟ ئەف قارەمانە ئێخستە ڤی کراسی نەهێلا پشتی وێ ئازاردانێ بگەهتە سەرکەفتنێ کو ئەڤە بناغێ ئولێ [ قەلانە ] یان ئەف زەحمەتە هەمی وەک بەردێ سیزیڤی لێ هات یان بارام پاش گەزبووژوان بیرو هزرێت خو ؟؟ یان زانی چارە نووسێ وی ئەوە دگەل گورگێت دوو پێ بژیت ئەز دبێژم سەیدا حوسێن نەبێ « متعمد » ئەف چارە نووسە بو قارەمانێ خو دانای بەلێ وەک نڤیسەرو رەخنەگرێ عەرەب غالب هەلسا دبێژیت [ لهێشیێ من دڤێت بێژم و باوەرێ ب تشتەکێ دروست بهینم ئەو ژی ژ تاقی کرنا منە وەک چیروک نڤیس و رەخنەگر کو هونەرمەند هەلویستی سەرەکی ئەڤێ بیرو هزرێت وی بو دچن نا هەلبژێریت چونکی دستوفسکیێ ژار رومان دنڤیسان دڤیا هێرشا بەتە سەر سوشیالستا بەلی لدویماهیێ هزرو بیرێت وان دارشتن ..

## 2 - گورگ

د . خالدة سەعید دبێژیت [ رومـان نڤیس بهندێ نـە راوستیانە کو واقعی شی بکەت و رەخنێ لێ بگریت بەلکوێ هاتی هندە رەمزا دورست بکەت دا واتایێت بەردەوام بدەت و بشێت بمێژیت دا تشتیت نوی دروست بکەت ئەلبـەت ئەف لاکـارێ هونەری دێ رووناکی و ڤەژین تێدا هەبیت ] .

سەیدا حوسێنی گەلە گورگ کریە دناڤ دراما چیروکی دا ئو دەورەکێ درێژو سەرەکی پێ دایێ ئەز قەت پێ دو دل نینم کو ئەف گەلە گورگە رەمزە بو دوژمنی و شەری و دەست درێژ کەرا ئو شیاپی گەلەک واتاو مەعنا ژێر بەردا گورگـا بێژیت . گورک د فلکلوری مەیێ کـوردی پێ پرە ژ بـەندو سـەرهاتی و چیروکێت سەر گورگی نە وەک دبێژن تو با گورگی مەرگە یـان [ گورگە دبیستێ مهێ دا ] چیروک نڤیسی بەرەکێ دو چیچک بێت کوشتین گورگ وەک رەمز دچیروکێ دا « بُعد » یا دای هەر دو قارەمانا [ ئایش و بارام ] بیرهاتنێت زاروکی بێت هەین سەر گورگی دەمێ گوهل دەنگێ گورگی بووین کو گەلەک هزرو بیرا دهاتە بپ هزرا وان وەک ئایش دبێژیت « زور حیکایەت و سەر گوزشتەم . دەربـارەی گورگ لە دایکم بیستـوە بە تـایبەتی لە سالانی بەر ئەمسالی ئێمەدا » .

ل ڤێرە چیروک نڤیس قارەمانێت خوێ ئامادە کرین دەمێ وێ درامایێ دەست پێ دکەت دا قارەمانێت وی مەسەلێ تێ بگەهن یەعنی چیروک نڤیسی دراما یا گفاشتی و مونتاج کری و « بُعد » یا دایە خوێندەواری کو هاتنا گورگا یەعنی شەرەنیخ دەست پێ دکەت ئەڤە ژی سەرکەفتنا چیروک نڤیسیە ل بکار هینانا ڤێ رەمزی ، بەلێ سێ جارا چیروک نڤیسی وەک صوفیەکێ « سرّا » خو ئاشکرا بکەت ئەڤە یان خـەفلەتە چیـروک نڤیس کەتیە تێدا یا پێ سورە سەر هندێ کو رەمزێ خو ئاشکرا بکەت دا هنـدە مژو مـورانا سـەر راکەت خـوینـدەوارێ ئـاسـای تێبگەهیت و بو وی روهن بیت وەک دبێژیت [ با بچنە ئاوایی و لەوێ لەگەل گورگە دوو پێیەکـانی هاوەلیـاندا دەس بـدەنە یەخەی یەکتری ] .

یان دبێژیت [ هیـچ بە هەلە مەچو گورگی زور ئاسایین و بەلام هێگجار برسین و بو تێر کردنی ورگیان پەلامار دەدەن سل لە هیچ شتێك ناکەنـەوە گوایـە گورگی دو پێیش هـەر وەها ناکا ] .

چیروک نڤیسی گورگ پێ هینای رەمزێ خرابیێ ئەرێ ما دبیت خەلکی وی ئاوای هەمی مروڤێت خراب و دڕندە بن وەک گورگا قەت ئەڤە یا نە رەوایە تەرو هشکا هـەمی پێکڤە بێنـە سووتن .

## 3 - ئایش

هەر چەندە کاک حوسێن عارفی گەلەک باوەری ب ژنێ یا هەی دڤێت دەور هەبیت بەلێ وەک مروڤەکێ ڤێ جیهانا سێ هەر دەورێ ریڤە لانەک و تـابعی پێ ئو ژن هـەر یا لبن دلوڤـانی و

ـرمكي‌و چەلەنگیا مێری ئـەز دبێژم ئـەڤە ژی دزڤـڕیتە دوو ـەگەرا : ـ

- چیرۆك نڤێسی ئەڤا کویراتیا [ لا شعوریٚ ] خۆ بیٚ سووررو ـزمرکرن ئاشکرا کر .

ـ یلن چیرۆك نڤێسی نـە دڤیا دیمـەنەکێ نـە [ واقعی ] یێ کۆمەلی وەربگـریت دویر بیت ژ دورست کـرنا قـارەمانێت ـوپرمان .

ئایش د چیروکیٚ دا سیتـافکا [ بـارامی ] یە ئـۆ بیرو مـریت وی ڤەد دچیت‌و راڤە دکەت وەك سەر زاریٚ وی دبێژیت [ تۆ چۆن بڕیار دەدەیت من وەها دەکەم ][٣٠] .

یا هندە جارا ئایش دبیتە ئەگەرا هندیٚ وریٚ (بارامی) ـمیتـە خاریٚ‌و دەوریٚ شـەلبی ببینیت د شەرەنیخیٚ‌دا وەك ـێژیت .

[ فەرمو بزانە بە چ حالێکی گەیاندوین تۆ ئـەگەر ئـەو حەیلە نەیدایە لە کەللەت بۆ ئاوەها تووش دەبووین ][٣٢]

یان گری‌و ترسا ئایشیٚ نا هێلیت بارام هێرشا گورگا پرت‌و ـلاڤە بکەت وەك بارام بخو دبێژیت [ لە دلی خۆیدا وای بڕیار دا چوەمریٚ بکا تا ئەوی تر دەگە ڕێتـەوە سەری بـۆ خواردنی‌و مرسـەتی تەقە لێکـردنیان بـەکۆمـەڵ لیٚ بیتەوە بـەلام دەنگی گریـنێکی بە کولی ئایش وازی لەو بڕیارە پیٚ هیناو بە پرتاو خوی کرـومو بە ژووردا ][٣٣] .

ـوو قارەمانێت دی د چیروکیٚ‌دا ییٚت هەین وەك وەیسە مەڤالی بارامی ئۆبازە سەی وان بەلیٚ ئەڤێت مە بەحس ژیٚ کرین ـوەبا چیروکیٚ‌نە .

« شەرە نیخ د چیروکیٚ‌دا »

چیرۆك نڤێس هونەرمەندە قەت نە ییٚ بەر پسیارە بۆ مە وەك وینە گریٚ فوتکرافی ئەڤ جیهانا دبینیت نەقل‌و نەخش بکەت ـەلیٚ یا وی دڤێت بکەت سەرو ژنوی نەخش‌و پلانا بۆ جیهانەکا ـوی دانیت وەك هەڤیـری ڤەستـریٚت دویماهیکیٚ خینـدەوار ـگەهتە ویٚ راستیا وی دڤیا بێژیت .

کاك حوسینی لڤی چیروکیٚ دا شەرەنیخەکا دروست کری ـەکە ئەم بهین وەك پراکتیکا « عەمەلی » سەح بکەینیٚ هندە تشت نـە واقعی نـە ئـەڤـە ژی دیٚ بیتـە وەك بـەرسڤـا [ سارویان ] ی دای [ کە چیرۆك نڤێسیٚ ئەمریکی ب ڕەگـەز ئەرمنی یە گۆتنیٚ ئەڤ چیروکێت تە گەلەك ژوان نەراستن هندە رویدان ییٚت تێدا هەین کۆ زحمەتە ببن .. (سارویان) ی گۆت چنکی من چیروك ییٚت تڤێساین نە راپۆرت سەیدایێ حوسین دراما چیروکیٚ دەست پیٚ دکەت ب ڕێك خۆش کرن‌و ڤەوژارتنیٚ هەتا دگەهتە ڤیٚ سەرە نیخیٚ ، ئەو ژی دەمیٚ (بارام) ئۆغـر درکەت‌و دویر دکەڤیت ژ کۆمەلی تێدا ئەوە خێزانا خۆ‌دوسەریٚ زارویا دچنە دویر ئاوایی دژین ، ئـاسمان دبیتـە مژو مـۆران دویماهیکی .. زریان بشتی هنگیٚ دیٚ ڕەگەزیٚ سەرەکی هینتە ناڤ چیروکیٚ پشتی [ جەوەکیٚ ] دروست دکەن وەك چەوا د چیروکێت پولیسێت رۆژ ئـاڤادا دبینن پێش بـوونا تـاوانەکیٚ مەزن ، مێشکیٚ خویندەواری ئامادەدکەت کۆ دیٚ تشتەك پەیدا بیت . ئەو ژی گەلە گورگە .

ئەڤ بابەتیٚ شەرە نیخا مرۆڤی دگەل سروشتی گەلەك رومان نڤێسا یا لیٚ ڤەکولای ئۆ بە حس کری وەك ملڤیل درومانا [ موبی دیك ] دا یان ئەرنست همنگوای درومانـا پیرە مێـرو زەریا یان جەنکیز ئیتماتۆڤ د روومـانا [ سـەی بەڵك ] یـان گابریل کارشیا مارکیث د [ سەرهاتیا دەریا وانـەکی خندەقی دبیت کاك حوسینیٚ مفا ژ ڤان وەرکرتبیت بەلی قەتَ ژ داهینانا وێکێم ناکەت چنکی وی جیهانەکا کوردی خۆمالی یا خەملاندی و بهنەکا . کوردەواری دەت .

ئەم دشین ڤیٚ شەرەنیخیٚ بکەینە معادەلەیەك

« سروشت×مرۆڤی »

سروشت [ زریان + بەفر + گەلە گورك دژی مرۆڤ [ بارام + ئایشە + بازە دوبەرن دکەتینە شەرە نیخەکا بەر دەوام کۆسروشت ئەو ژی پێکهاتیە ژ زریان بەفر کۆدخزمـەتا گورگانە دیٚ بیتە یارەیدەك کۆ گورك دژوارتر بن‌و ئۆ سەرماو زریان ببنە ئاستە نگ دا باران ییٚ لاوازو بیٚ زەفەر بیت .

بەریٚ دی ییٚ پێك هاتیە ژ یارام‌و ئایشیٚ دگەل دمانجیٚ کۆ ئەو ژی تکنولوجیایە مرۆڤی یا بخـو دروست کری ئـۆ گەلەك کارەکیٚ مەزن دبینیت بۆ رووخاندنا بەریٚ دی .

بازەل ڤیرە ییٚ دگەل بەریٚ مرۆڤی دژی سروشتی چنکی

مروڤ ب هوش و هزرەمەندیا خو یێ کێشایە بەرێ خو کریە دار دەستێ خوشارەزای ل بەرێ دی یاهەی .

ئیشارەتەك یا هەی بو دەست پێ کرنا ڤێ شەرەنیخێ ئەو ژی وەك وێ گولا ئێکێ یە ئەڤا پەقیت ل جەبهێ ئو شەرو ئاتش دەست پێ دکەت ئەو ئیشارەتە ژی دەمێ پازە درەویت [ بارام تەواو بە ئاگا هاتەوە دەستی لە ئایش بەرداو قیت بووەوە بازە بەو پەڕی حیرس و توورەیی یەوە دەوەڕێ ] .

ئەڤە ئالی دی دەست ب شەرەنیخێ کر بارام خو ئامادە دکەت [ ئەوسا هەلسایەوە سەر پێ گەلە گورگ تەواو نیـزیك بوونەتەوە هیچ سلێك لەوەڕینی بازە ناکاتەوە ] .

بارام رابو دەمانجا خو هەلگرت و بازە کەتە دیڤ دەست بتەقێ کر گورگ رەڤین بەلی شەرەنیخ بدویماهی نە هات جارەکا دی گەلە گورکا هێرشەکا دی کر ، وەك دیار دبیت .

[ گەلە گورگ زوری پێ نـەچوو پـەیدا بـوون بە ئـاشکرا هەستیان پێدەکرا کـە تەواو نـزیك بـوونەتـەوە دەورو خولی خانووەکە دەدەن ] . دەمێ هەر شالاوێت گەلە گورگا بـەر دەوام دبن ورێ بارام و ئایشێ دەهێتە خارێ ترسا گورکا دکەڤتە دلی وان ئایشێ بەردا گریە ئو دو دل بوون کو ئەڤنە گورگن .

[ ئەی دەبێ چی بن .

- دەبێ دێوو درنج بن خویان خستبێتە پیستی گورگەوە ] .

ل دویماهی . قەناعەت بو چێ دبیت دبێژیت :

[ ئایش ڕاست دەکا گورك نین ئەمانە گورگ نین ] بەلی ئەڤ [ معادلە ] و شەرەنیخ یا گرێدایە ب تشتـەکێ ئەو ژی (الزمن - دەم) بورینا میلێ سەعـەتێ سەرکـەڤتنە بـو بەرێ مروڤی دژی سروشتی .

ئایش و بارامی یا خو راگرتی و خەباتێ دکەن هەتا روژ هلاتی و ئو دنیا روهن دبیت هەر چـەندە ل کـوردەواری قەت نەبویە زریان ئێك شەڤێ ناکێشیت بەلکو چەند شەڤا بەلێ چیروك نڤیسی ئەڤە یا ترخان کری بو چیروکا خو سپێدێ ڕوژ هەلات [ ئایش دنیا رووناکە و گەلە گورك نەماون تـەواو ڕزگار مـان بوو .. رزگارمان بوو .. تەواو ] .

یـەعنی دویماهیکـا ڤێ تراجیـدیایێ ب هـلاتنـا ڕوژێ دهێت .

## جهـو شوێن (المكان) د چیروکێ دا

گاستون باشلار دبێژیت :-

[هەر جهەك نسبەت بن تایبەتێمخو بێت نـەتەوایـەتی هەین کو (تەعبیرێ) ژ دیتنەکێ دکەت] . ئەڤ جهێ دراما چیروکێ لێ تێتە گێران کوردستانە ئو مورا نـەتەوایـەتی پێڤە دیارە هەکە هاتو ئەڤ چیروکە وەرگێرا سەر زمـانەکێ بیـانی خوێندەوارێ وی ئەزمانی دێ تشتەکێ ژ زڤستانا کوردستانێ زانیت .

چیروك بەحسێ دور جها دکەت .

1 - ئاوایی بەلێ چ ئیشارەت نینن کا ئەڤ ئاوای یە باژێرە یا گوندە هەر دبێژیت .

[ئاوایی تەنیا بە دووکەلی لوولەی زوپاکانیدا دەزانرا ئەوە ئاوایی یە دەنا بە وورتە و جولە و بە دیمەن هیچ نیشانەیەکی تری پێوە دیار نەمابوو] .

بەلێ هەکە دیار کربا دا پێتر خزمەتا چیروکێ کەت جونکی باژێر «تحـدیدا» قـوناغـەکا مللەتی دکـەت و دشێن چـەرخێ چیروکێ تێدا دیار بکەین پشتی بزانین وی باژێری کا چەنـد شارستانیەتێ بریە .

2 - جهێ دووێ - چولە - یەعنی سروشت دویر ژ مروڤاو گیرو گرفتێت وان یان تێك دانا سروشتی ژ ئالێ مروڤی ڤە یەکەم کەس بوو وی خانی لێ ئاڤا کری ، وەك دبێژیت [ئـەی ئەمـە روژی ئەوەیە ئێوە لەو چولەوانی یە بمێننەوە] .

وەك دیارە ئاوایی ل جهـەکێ بەرزو بلنـد بیت چونکی چیروك نڤیس بو مە هوسا وەسف دکەت کـو هاتن ژ گـوندی سانەهی ترە ژ چونێ . وەك دبێژیت :-

[کەڕانەوەکەی ئاسانتر بوو لە چوونەکەی] ئەڤێ وی ئاوایی بژیت دچنە ڕێزا گورگێت دوو پێ قەت ژ گورگێت دروندە دویر نینن تنێ ئەڤ مەسەلا فەسلەجی نەبیت کو گورگ چـار پێ نە ئەو دوو پێ .

چیروك نڤیسی دڤێت چ پیوەندی وان هەر دو «جها» پێکڤە نەمینن هەر وەکو دوو جیهانێت دژی یەك بن .

بەلێ لڤێرەدا مەسەلەکا ئابوری و پێوەندێت مروڤایەتی یا

مەی دەفەر بۆ دەفەرێ وەلات بۆ وەلاتی ئەو پێوستیا مرۆڤی حوکمێ هندێ دکەت ئۆ [مکانیەت] تا نەمینیت جیهـان دبیتە گوـمك ، چیرۆك نڤێس نەشیا ببریت ئەوژی دەمێ بارام دچیت ـمتی بۆ چرایێ خۆ بهینت وەکی دبێژیت [خۆ دەتوانم فرسەت ـیمو بچم هەندێکی تر بینم بەلام ناچم][**] .

یەعنی جارەکێ بێ چووی بەلێ نە ڤێت بکەتـە دو جارا ـکی ڤێ کاڤێ پێوستی پێ‌نینە .

ئەو جهـ [ئاوایی] دوزەخە بەلێ چوڵێ وی بەهشتە وەك ـبێژیت :

[بە درێژای ئەو هەشت مانگی پێشووە لە چیمـان کەم ـو . ژیانێکی بێ قرەو برەو بێ گێچەڵو سەر یەشەوە نە کەس حەقی بەسەرمانەوە بووەو نـەهەقیشمـان بەسـەر کەسـەوە ـوە][**] .

خانی‌یە مرۆڤ تێدا دژیت جیهانا ئێکێ‌یە ئۆجهەکێ هەڤ ـکە ل بیرهاتنێت مرۆڤی ئـۆ جهێ مرۆڤ تێـدا ڤەحـەویای ـمێت خـۆ بێت «لا شعوری» مـەدا بێت هـەبن هـەر هـزرو تەحمینەکێ بکەی دێ هێتە بیرا مە .

وەك باشلین دبێژیت .

[ل زڤستانێت (تراجیدی) دەمێ ئەز ل مـالا بابێ خـۆ مهێڤلنێت مە ژ مالا وان ئۆخر دکرو دچۆنە خارێ ئۆلبن رحمەتا ـیتا هەچکو قوناغەکا درێژە بۆجهەکێ نە دیار دچن من پربدل ـڤێ ئەز ل دیڤ هێت وان بکە ڤم وەك دکتێبێت دیروکێ بۆ مە فەدگێرن] ، ئەز وەبکەم[**] .

ب راست سەیدایێ [حوسێن] ژی وەك باشلین دبێژیت شیـا بەحس کـرنا ڤی (جهی) دیـروکا ملەتێ کـوردو دگەل سـالایێت زریانو بەفرا بۆراندی ب ڤـان رووداوا گلێشیتو ڤە قەتینیت چونکی مەسەلا زڤستانێو بەفـرو زریانـا گەلەك یـا گرێدای‌یە ب کۆمەلێ کوردی ڤە ئۆ گەلەك جارا یا کریە مێژوو بخو وەك دبێژن بەری بەفرا سوور پشتی بەفرا سـوور فلان کەس هاتە سەر دونیایێ .. هتد .

مێژوو بیتە کەرەسە بۆ هونەرێ چیروكو رومانا یا رەوایە لدەڤ هەمی چیرۆك نڤیسو رومان نڤێسا وەك دبێژن [رومان ئەو دیروکەیە قەت نە رەش دبیت نە دهێتە ژ بیرکرن] .

● دەم ـ کات [الزمن] د چیروکێ‌دا ●

چیـرۆك نڤێسی چەوا مـاملەت دگەل [دەمی] کـریـە د چیرۆکێ‌دا ؟ ! ..

ئەگەر گێرانەوە [سرد] چیروکێ دکەتە ناڤ د زەمنی‌دا بەلێ وەسف چیروکێ د جهێ‌دا راوستینیتو ئۆ دکەتە چەنـد [مَشْهَدْ] ل فرمانی نۆکە [الحاضر] .

د . عبـدالرحمن بدوی دبێـژیت [دەم «زَمَنْ» ل چەنـد حالەتا راوستیت وەك حالەتێ «قەلەقێ» چەوا دەم پێ راوستایە پێچەوانەوە ئەگەر ل حالەتێ کەیف خوشیا دابێت دەم کورت دبیت][**] .

کاك حوسینی بخو گەلەك مفا ژ ڤێ چەندێ پێ وەرگرتی گەلەك رووداو بێت چیروکا خۆدا راچاندین ل دەمەکێ کورت دا .

چیرۆك دەست پێ دکەت بدەمێ ئێڤاری ئۆ هەتا سپیدە دهلێت .

لدەمێ نوکە [الزمن الحاضر] چیروك نڤێس نە راوستایە شیای ب شێوەیێ [ڤلاش باك] «تسلسـلا» دەمی بشکنیت ئۆ بچیت سەر بیر هاتنێت بەری چەند سالایێت بوری سەر باخڤیت «دراما» چیروکێ ب رەنگێ گشتی بەحسێ دەمێ نۆکەو داهاتی دکەت یەعنی هەمی کریـارێت مەزن گـرێداینـە بڤی دەمی‌ڤە بارامو ئایش پێ ل ژڤانا گهورینەکێ پێ خۆ ئامـادە دکەن بـۆ شەرەنیخەکێ دگەل گەلە گورگا ئەڤ شەرەنیخە جارەکا دی یا گرێدایە ب «زەمەنـەکێ» کۆرت ئـەو ژی رۆژ هەلاتنـە ، وەك دبێژیت .

[تێپەڕ بوونی کـات بـاشتـرین چـارەسـەرە هـەرکـە شەبەقی‌دا ئیتر وەل دەبنو لە کۆڵان دەبنەوە][**] .

کاك حوسینی گەلەك یا خۆگرێدای ب وەسف کرنا جهـو خانیو گەلە گورگاو بارامی ڤێجا یا بویە ئەگەرا هندێ «دەم» راوستێت سەر حیسابا وەسفێ هەر چەندە یا خۆ دویر کری ژ وەسڤێت کلاسیکی کو ب درێژای وەسفا نـاڤ چاڤو درێـژیا قارەمانی دکرن .

زەمەن د چیروکێ دا زەمەنەکێ «وجـودی‌یە» چـونکی قارەمانی ئەڤ دەمێ سالێ کۆ زڤستانە ئۆ پێ بـزریانو هـرو

باین ، بخو هەلبژارتی شەڤەكا دریّژ بكەڤتە شەرەنیخیّ دگەل گوّرگا نوّ مەسەلا «قدری» تیّدا نینە .

سیّ دەم بیّ لڤیّ چیروكیّ بكار هاتین :ـ

ا ـ دەمیّ ئیّستا [نوكە] .

ب ـ دەمیّ داهاتوو .

جـ ـ دەمیّ رابوردوو .

بەلیّ دەمیّ نوكە بیّ زالە سەر چیروكیّ و گەلەك یا ڤەكرتی چیروك دەست پیّ دكەت ل دەمیّ نوّكە وەك دبیّژت :ـ

[زوّپاكە جاریّكیّ تریش سوور بووە نیّلە نیّلی گەشتە لوتكە لەوەدا نەما لە بەردا رابگرن][45] .

ژ بەر پەڕ (55) هەتا دگەهتە (65) هەمی [زَمَنْ] د حالەتیّ نوّكە دایە چونكی بیّ گریّدای ب وەسفیّ قەت نا لڤیت هەمی بەحسیّ بارامی‌یە ، چوّئاوایی هاتە ڤە ، نڤست ، رابوّ ... هتد .

تسلسلا دەمی نە شكاندیە تنیّ ل ئیّك رستە نەبیت ئەو ژی دچیتە سەر كاتیّ بوری وەك دبیّژیت [بەلكو بەقسەی پیرانی ئاوایی گوایە سی و پیّنج سالّ لەوە بەر زریانیّكی تری وەهای دی بیّ][46] .

«زَمَنْ» دچیروكا هەڤ چەرخا ئەڤرو نە یـا گریّـدایە ب تسلسلا خوّ شەپوّلا هوّشیاری ل وردترین پیّناسیّت خـوّدا كوّ قارەمانیّت چیروك و رومانیّت وی نە ب كات و جها ڤەگـریّدای نینن .

جیمس جـویس ریّبەرو دامـەزرینەریّ ڤیّ قـوتابخـانیّ دبیّژیت :

[هەكە ئەز شیایم پچـە ناڤ جـەرگیّ باژیّـریّ «دبلن»و بەحسی ژیّ بكەم ئەز دشیّم بەحسیّ هەمی باژیّریّت جیهانیّ بكەم چونكی تشتیّ تایبەتی ژ تشتیّ گشتی پەیدا بوویە][47] .

«دویماهیك»

ئەم نەشین هەر رستـەیەك د چیـروكیّدا هەبیت ئـەم چیروك نڤیسی بكیّشینە دادگەها وەك پولیسیّ پشكنینیّ بكەینە پسیارو بەرسڤ دگەل چیروك نڤیسی ئـوّ دڤیّت هەمی تشتیّت دچیروكیّ هاتین [منطقی] بن سەد ژ سەدیّ .

جارەكیّ پسیار ژ گـوّتەی ئـەلمانی كـر كا چ د رومـانا «فاوست دا» نڤیسیە بەرسڤا واندا :ـ هەكە ئەز بوّ هەوە بیّژ دڤیا جارەكا دی بنڤیسمەڤە ، ئەڤ «منطقیەتا» راست و راسـ دهوّنەری‌دا گەلەك دەوریّ ئەندیّشەو سوّزا كیّم دكەت بـەا جوّرە رەخنە یا پەیدا بوو كوّ دبیّژتیّ [رەخنـا پراكتیكی] كـ سەیدا حوسیّن عارف د دیدارا چیروكیّ یا ئیّكەتیا نڤیسەڤانیّ كورد ل سالا (1979) ئەڤ رەخنە لسەر چیروكا رەزا سەید گوڵ مەشق كر بەلیّ سەیدا حوسیّنی ژی چەند جارا پیّ كەتیە ڤاز خـەفلەت و بسەردا چـونا 1 ـ ژمـارا گورگـا هـەر جـارەكیّ نەمرەكیّ د دەتە خویّندەواریّ دبیّژیت [توّ دەلیّی حەوت هەشت گورگی دوو پیّ ی][48] .

دڤیدا چیروّك نڤیسی ژماریّ زیدە دكەت وەك دبیّژیت [لە جاری پیشوو زیاترن سەیرە یانی چوون دەستەیەكی تریشیان هیّنا][49] ، یەعنی ژهەشتا زیدە تر لیّ هاتن دبنە دوو گەلە گورك هەكە ب حسابا چیروّك نڤیسی بیت كو گەلە گورك حەڤتن یان هەشت ئەڤە بوونە چاردە ب كیّماسی وەك دبیّژیت [نـەك گەلە گورگیّك یا وەك خوّت دەلیّیت دوو گەلە گورك وانی‌یە ئوّبالّ بە گەردنم وایە][50] . بەلیّ دهیّت دەمیّ فیشەكیّت دەمانجیّ حیساب دكـەت دبیّژت كـوّ من دوازدە فیشەكیّت هـەین ئـەو حـەفت گورگی ، دبیّژیت [پیّوست ناكا .... حەوتن ئەوە دوازدە !!][51] ، یەعنی حەفت گورگن ئەڤە دوازدە فیشەك .

دەمیّ بەحسیّ دەرگەهی دكەت دبیّژت كوّ ب سانـەهی سومی .

وەك [زوّری پیّ نەچوو كونیكی پچكوّلەی تیّكـرد ئینجا سەریّكی تەنافەكەی تیّدا رەتكردەوە][52] .

بەلیّ هەر بەحسیّ وی دەرگەهی دكەت كوّ گەلەك زحمەتە چ ئامیر نەشیّن كارەكی لیّ بكەن وەك دبیـّژیت [دەرگا كـەشی تەختە دار گویّزیّكی ئەوتوّیە كە چنگ وكەلبە كاری تیّناكەن][53] .

یان مەسەلا سەعەت و دەمی نەییّ ووردە وەك بەحسی دكەت كوّ شەبەقی دابیّت :

[پینج و شەش حەوت دەقیقەیە گوایە دەبیّ شەبـەقی دابیّ نەخیّر نابیّ قەت نابیّ من ئەگەر چی لە ئایش و لە خوّشم دەكرد بە سەعات شەش بەلام لە راستیدا لە دەور بەری شەش و چارەكدا شەبەق دەدا][54] بەلیّ هەر پشتی چەند دیّرا ڤیّ ژبیر

دکەت‌و دبێژیت [من دەزانم هێشتا نیزیکە سەعـاتە وەختێکی ناوە شەبەق بدا][55] .

## ژێدەر


1 ـ کاروان ژمارە ـ 15 ـ قارەمان لە چیـرۆکی نوێی کـوردیداو لە چیرۆکەکانی «حسین عارف» دا بە نموونە عبدالرزاق بیمار .

2 ـ کاروان ژمارە (19) ناوەرۆکی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌ی چیرۆکی کوردی . د . عیزەدین مستەفا رەسول .

3 ـ کـەڵە کورگ ـ حسـین عارف ـ چـاپـا ئێکێ سـاڵا ـ 1983 ـ لە چـاپکراوەکـانی ئەمینـداریەتی گشتی‌ی رۆشنبیـری‌و لاوانی ناوچەی کوردستان .

4 ـ کەڵە کورگ ل 61 .

5 ـ کەڵە کورگ ل 72 .

6 ـ لغة الفن القصصي ـ تاليف البرت كوك تقديم وترجمه د .طه الراوي ـ مجلة الاقلام العدد العاشر تموز 1977 .

7 ـ دراسة في قصص محمد خضير [الانتظار بدون جدوى غالب هلسا الاقلام العدد العاشر تموز 1977 .

8 ـ کەڵە کورگ ل 2 .

9 ـ کەڵە کورگ ل 72 .

10 ـ کەڵە کورگ ل 73 .

11 ـ کەڵە کورگ ل 80 .

12 ـ کەڵە کورگ ل 58 .

13 ـ کەڵە کورگ ل 73 .

14 ـ کەڵە کورگ ل 71 .

15 ـ کەڵە کورگ ل 68 .

16 ـ کەڵە کورگ ل 72 .

17 ـ الزمان الوجودى ـ تـاليف ـ عبدالرحمن بـدوى دار الثقافـة بيروت ـ 1973 ـ .

18 ـ الوجوديه فلسفة الواقع الانساني غازي الاحمدي ـ منشورات دار مكتبة الحياة / بيروت .

19 ـ کەڵە کورگ ل 72 .

20 ـ کەڵە کورگ ل 101 .

21 ـ کەڵە کورگ ل 75 .

22 ـ کەڵە کورگ ل 100 .

23 ـ دراسة في فن قصص «محمد خضير» غالب هلسا الاقلام العدد العاشر تموز ـ 1977 ـ .

24 ـ حركية الابداع . دراسات في الادب العربي الحديث دار العودة ـ بيروت 1979 .

25 ـ کەڵە کورگ ل 75 .

26 ـ کەڵە کورگ ل 75 .

27 ـ کەڵە کورگ ل 91 .

28 ـ کەڵە کورگ ل 86 .

29 ـ کەڵە کورگ ل 91 .

30 ـ کەڵە کورگ ل 92 .

31 ـ کەڵە کورگ ل 73 .

32 ـ کەڵە کورگ ل 75 .

33 ـ کەڵە کورگ ل 90 .

34 ـ کەڵە کورگ ل 90 — 91 .

35 ـ کەڵە کورگ ل 96 .

36 ـ جماليات المكان ـ تاليف جاستون باشلار ترجمه غالب هلسا ـ كتاب الاقلام .

37 ـ کەڵە کورگ ل 55 .

38 ـ کەڵە کورگ ل 56 .

39 ـ کەڵە کورگ ل 58 .

40 ـ کەڵە کورگ ل 58 .

41 ـ کەڵە کورگ ل 66 .

42 ـ جماليات المكان ـ تاليف جاستون باشلار ترجمة غالب هلسا ـ كتاب الاقلام .

43 ـ الزمان الوجودي . تاليف ـ عبدالرحمن بـدوى دار الثقافـة ـ بيروت 1973 .

44 ـ کەڵە کورگ ل 98 .

45 ـ کەڵە کورگ ل 65 .

46 ـ کەڵە کورگ ل 67 .

47 ـ جيمس جـويس في النقد الادبي الحـديث دراسـة في الروايـة الحديثه والمصطلح الادبي .

48 ـ کەڵە کورگ ل 76 .

49 ـ کەڵە کورگ ل 77 .

50 ـ کەڵە کورگ ل 80 .

51 ـ کەڵە کورگ ل 81 .

52 ـ کەڵە کورگ ل 94 .

53 ـ کەڵە کورگ ل 98 .

54 ـ کەڵە کورگ ل 102 .

55 ـ کەڵە کورگ ل 102 .

## دیوانی کاروان

# ژیکەلە

نــیـگـا سـرکـە بـەهـاری تـاسـە خـامـۆش ...
سـەرنـج بـۆتـە شـەپـۆل کـەشتی فـەرامـۆش ...
لە دونـدی هـەسـتـەوە تـیـشـکـی خـەیـاڵم ...
دەجـۆشـێـنـێ بـزەی سـەد لێـوی کـاڵم ...
شـەپـۆلم بـۆ چیـای جـوانیت دەکـەم شـین ...
شـنـەم بـۆ لێـوی نـاز بـەسـیـە گـڕو قـین ...
هـەنـاسـەی بـسـکـی ڕەشـمـاڵی نـیـگـاتـم ...
هـەنـیـسـکـی جـێ ژوانـی مـەرگـە سـاتـم ...
تـەزوی سـاردی دوو لێـوی ژیـی کـەمـانـم ...
بـزەو ئـۆخـژنـی سـاتـی ڕامـوسـانـم ...
تـەبـارەی بـاخـی ژیـکـەی نـاسـکـە سـاڵم ...
هـەوێـنـی ڕەنـگـی کـوڵـەی دانـە خـاڵم ...
گـەڕاوەی پڕ لە ڕازی ئـیـشـقـی جـوانـیـم ...
کـەنـەفتی مـاچی خـونچـەی بـەر بـەیـانـیم ...
لە سـەر « نـوقـڵێ » هـەبێ خـۆی دابـەداردا ...
لە بـەر ژیـکـە نـەبـم وێـڵ بـە هـەوار دا ...
بـەهـارم بـۆ گـوڵی تـۆ دێـمـەوە سـوێ ...
لە گـەڵـابـە لەدڵـا تـاوێ بـدوێ ...
بـە مـاچێـکـی لە لێـوت خـەم مـەهـێڵە ...
لە ڕێی دڵدا بـبـە تـاوە ڕەهـێـڵە ...
دەبـەر لێـوت مـرم ژیـکـەی خـودایـی ...
نـەکـەی بـیـرکـەیـتـەوە بـۆ ڕێی جـودایی ...
ئـەگـەر وابـێ هـەتـا هـەم خـوێـن دەڕێـژم ...
گـوڵو دڕکو گـەڵا تـێـکـرا دەنـێـژم ...
بـزەو شـەکـراوو ژار وێـکـرا دەڕێـژم ...
ووتـەو پـەنـدو جـوێـن وەك یـەك دەبـێـژم ...
بـەڵام ژیـکـە هـەتـا تـۆم بـی دەمـێـنـم ...
ئـەگـەر تـۆم بـۆ نـەمـای مـن بـۆ بـمـێـنـم ...

جەمال محمد اسماعیل 1981

لە ژمارە «٢٦»ی گۆڤـارەکەمـاندا وتـارێکمان بـە ناونیشـانی «ناوبژی لە نێوان برایان نیازیو نەقشبەنـدیدا» بـڵاوکردەوە کـە بەداخەوە بە پێچەوانەی ڕێبازی گۆڤارەکەمانەوە ، هەندێ تانەو تـەشەری بـەرامبـەر بـرای هـونـەرمـەند «مـەزهـەری خـالقی» تێکەوتبوو .

ئێمە لەگەڵ عوزرخواییماندا ، وا لێرەدا لەسەر خواستی کاك «مەزهەر» خۆی ، ئەو نامەیەی لەم ڕووەوە بۆی نـاردووین بڵاو دەکەینەوە .

«کاروان»

مامۆستای بەڕێز ، محەمەدی حەمە .
ئیحترامم هەیە بۆ ئێوەو هەموو بەڕێوەبەرانی گۆڤارە بەرزو
جوانەکەتان ، هیوادارم کاروبارەکانتان لە ڕێگای خزمەتی گەل دا
بێ وچان و دائیم لە گەشەسەندن دا بێت
برای بەڕێزم نازانم ئەدەب و فەرهەنگی کوردیان ،
یان قانوونی مطبوعات ڕێی دەدا کە بە ناسراوێک بە بێ هیچ
بەڵگەو هۆیەکەوە ناوی خەڵک بە خراپە بەرن و بڵاو بکەنەوە !!...؟
من تەنیا لە ئێوە گلەیم هەیە [illegible] ئەوەی وا ئەتانەوێ
[illegible] ناوی خۆی ئاشکرا بکات بێ گوناه کەس
[illegible] دانانێ ......
[illegible]
[illegible]
[illegible]
[illegible]
[illegible]
[illegible]
[illegible] ......

[illegible] مظهر خالقی
١٦/١٢/٨٤

# کەڵکەڵەی پیری

● شێخ طیب شێخ محمد (کلۆڵ) ●

کە هاتە گفت زاری نوقلت — نوقوڵ باری بە نوقلانە
دەبا بە (ئاخ) بوت هەڵ — ڕێژم لەدور بۆت بومە دێوانە
مەنوارە سەری سپی بوم — گرو کاڵە بۆ جۆلانە
خواماڵی جوانیت کاوڵکا — یەخسیری کرد ئەم ئینسانە
لەڕێی ئەوەدا نەماوم — ئەم کۆڵانەو ـ ئەو کۆڵانە
تۆ وێنەی کۆترو کەوێ — مان دەگرێ لێم ئەم کۆچانە
خۆزگە لەش وەکوو دڵ — بوایە پیرنەبوایە لەم ژیانە
بەلام داخەکەی گرانم — بێ گوڵ بێ نرخە ئینجانە
(کلۆڵ) لەهەوری ئەوینت — وای ڕشت ئەم شیعرە بارانە

# ئەو ئەڤینەی لە خوێنمایە

« محمد ئاوارە »

ئەم دەزانی کەنارو ڕۆخ
روو لە دەریا وەردەگێڕن ..!
ئەم دەزانی ئاوو ئاگر
بەیەکەوە جەژن ئەگێڕن ...!
بروا ناکەم ..
بەهیچ چەشنێ بەهیچ جۆرێ
نابێ .. ناشێ .. ماسی لەدەریا بتۆرێ ..
من ناگریم تا بتوانم پێدەکەنم هاها .. هاها
دەنگم دەڕوا ...
بەگوێی ئاوارەکان دەگا ..
من ئەستێرەی چاوەکانم
لە ئاسمانی خۆشەویستیت داناچۆڕێ
هەر چاوەڕێی ئەڤینی تۆن ،
باکەمیش بێ هەریەك چۆڕێ ..
جێت ناهێڵم گشت ئەستێرە
ئاسمانی شین جێ بهێڵێ
ئەڤینی تۆ لە خوێنمایە دەمارەکانم دەکێڵێ ..

پێم گرتووە .. رادەوەستم
بەرامبەر تۆف و ڕەشەبا ..
کێ دەیەوێ تۆم خۆش نەوێ
با دەماری هەموو لەشم والا بکا .

● داری ساری ●

# لە دریای عەشقدا

جامی بادە لەو پنجەبێ شمشاڵە
تنیا ماچی لەو دووْ لێوی ئاڵە
یان ئەیشارەی لەو دوْ دیدەی کاڵە
گەر وپەیان کوْشیام خیونم هەڵاڵە

* * *

جامی لەو بادەی تیژی تامدارە
بەو پنجەی نازەگ شیرینی یارە
گە وپی مەست بووْم شیتو دیوانە
دیوّر مەوم لەغەم هەولو وپەژارە

* * *

هەرچەند بەنوشوم لەوّ بادەی کوْانە
لە تیژیش مەست بوْم شیت ودیوانە
لە دریای ئازار مەلەوانی کەم
درم چەوم لەچەرخ سزای زەمانە

* * *

بادەی دستی یار هەر چەندی تیژبوّ
نوش چی لەپی جامەش لاریژ بوّ
چێونا لە ئاخڵ ستەم رەها دوْم
بیلا کەپوڵم بەتیژیش گیژ بوّ

* * *

بیلا بەنوْشم بیلا مەست بوْەم
بیلا لە دریای ئازاد خەست بوْەم

بەو جامە ساقی ویرم ئاسودەس
چیوّ مار وبالای یار پیەوس بوْەم

* * *

لە لەعڵەی لێوەش شەربت نوّش بەکم
زڵفی زرینەش و سەرپوش بەکم
سەربەنم وبان سینەو مەمانەش
تا غەمەی روژگار فراموّش بەکم

* * *

بیلا بەمەژم تازەگی لێوەش
وسەرپوّش بەکم زڵفی پەشێوەش
بوْو گوْلوّ ومیخەك هەیوّراتی وهار
هەر شەو نمدار دوْو زڵفی پەشێوەش

* * *

دو دست لە گەردن دەم لەناوی دەم
چێو ماری دیەمی پیچخواردیم ئەوهەم
لە گوڵزاری عەشق پرەی دڵ وازکرد
دێور لەشوفاران هوکارەی ستەم

* * *

پن وجام دیار لە گوڵزاری گوّڵ
ماڵشکاو کردیم ناز وڕازی دڵ
ئەو شەربت مەدا ومن نوّش مەکردم
غەرق لە عەشقەش بیوم لەقاپ تا قاقوّڵ

# گازیه‌ك

سه‌لمان کوڤلی

جانێ گوهارا ب ئاڤێژه
نه‌ ژ ڕه‌نگ ته‌نه
ڤزانی مینا گوهارا
بلبل و که‌و چه‌ند پێڤه‌نه ؟

دێ ب ئاڤێژه
بنێ دۆلا
بنێ سۆلا
مخابنی ڤانێرگزا ،
ته‌ڕو تۆلا

نێ خوناڤاکه‌تی ڕوی‌یا
پێڤه به‌هی شرین گه‌زو
کوشتم و سوتم بشکوڤا
چ د خوشیکن ژارو ئه‌زو

زاڤانه‌و .. نابنه زاڤا
ته‌ڤن پیرکن نه‌شێن داڤا
یارێ د بنه‌فش و گوڵولا
پێکی خوه‌ش که‌ن‌و ، ده‌هوڵا

بهار هات‌و
لزستان‌و
لهاڤینا
ڤه‌که‌ن تۆلا
ڤه‌که‌ن تۆلا

* * *

جانێ ..
ده‌وات نه‌بی چنه ؟
بلا به‌س بن .
پاری خوه‌رێ ب چاڤ شوڕی‌یێ
ئه‌ووپاری ب ڕه‌ش‌و هه‌ش بن
ئه‌ڤ ڕویکێ د هو زه‌رو لاواز
ئاڤێ بدێ ، بلا گه‌ش بن
ئوب ئاڤێژه وابازنا
نه‌ ژ ڕه‌نگ ته‌نه
ب ئاڤێ بنێ ده‌ریا خه‌ما
نه‌هه‌ژی گوڤه‌ندا مه‌نه
ب ئاڤێ ل ئه‌نیا ئاگر بده
بێژی قه‌ڕمتی گوڕ بده
مخابنی ڤا نێرگزا ،
. دبێ خامه‌نه
مخابن ئه‌ڤینیا مه‌مێ ،
ڕێکا پڕ مارو ده‌هبه‌نه
بهار هات‌و
هێژ زستان‌و
هێژ هاڤین‌و ،
گوهارو بازن بێ‌د ته‌نه
گوهارو بازن بێ‌د ته‌نه

* * *

جانامنێ .. .
چه‌ند که‌سه‌رو خه‌م مه‌خارن
هێژتا ب پاشیڤ‌و فتارن
مانزانی ؟
سه‌یران‌و سه‌ما دڤێ هه‌بن
دهه‌ژی ته‌نگ
چه‌ندی نێرگزو بیتانوك
شرینی‌و خه‌لاتێ ته‌نه
چه‌ند مه‌م هه‌نه ، وه‌ك ڤی‌مه‌می
خازگینی‌و ده‌واتیێ‌د ته‌نه
خه‌نایێ بینه ب ده‌کچا ،
ده‌واتی‌نه .
به‌رده‌ڤانیا
ب ده‌زڕ کورا
نێچیر ڤانێ‌د بژارتی‌نه
خه‌تیرا بده ده‌ست پیرا
چرا بده ده‌ست فه‌قیرا
ئوپێل بده
فیرپا بده
سیرپا بده
خوب ئاڤێ کاکلکا دلی
خوب ئاڤێ د بیبیکامن‌ده
بهار هات‌و
شولا بێریك‌و شڤانا
گده‌گده
بهار هات‌و
ڕویکێ زستان‌و هاڤینا
ڕه‌نگێ بهارێ تێ‌بده
ڕه‌نگێ بهارێ تێ‌بده

مەلا مەحمود مصطەفا یوسفی

# نێچیرا کەوا لکوردستانێ

مەیزێنە هەڤالا ژتە دەستێ خوە قەتاندن
مالی خوە برن چادرو کۆنێ خوە هلاندن .
زوزان ڤەکرن تەڤدە تو هێلانە ل دەشتێ
کۆنێ خوە ڤەدان تەڤدە شەلیتی خوە رەشاندن
نێچیرە لسەر شاخو زنارا دلەزێنن
نالینە سەرێ قازو کەوالێ دەفڕاندن

شەش خانە ل دەستێ ل ملا کەو ب فغانن
بازی ل هەوا قیڕە غەمێ دل دڕە ڤاندن
داڤێ خوە ڤەدان کۆزو چەپەر لاتو تەڕاشن
جەلابو رباطێ بهونەر ژێڕە نەقاندن

جەلابە دباکێ ئەڤە رۆژامە عەگیدا
لەشکەر دکشاو خوە ل هاوێر فەڕەشاندن
مێرخاس خوە ژ هەڤدوو دگرن تێنە هەوارێ
رەش دانە هەڤوو دن بەرو ساقێ خوە شداندن

یەك هاتو خەبەر دانە جەلابی م بناسە
ئەز لاوێ چیامە مچەپەر پر هەرڤاندن
چاوا تۆ دوێرێ کو دعەردێ مەدە باکێ
ڤی عەردی گەلە خوێن مژو دوژمن شەتتاندن
ئێ لنگێ خوە یاڤێژێ وەلێت دێ بمرێ تێ
چەند تیپێ نەیارامە ژ بەر هەڤدوو قەتاندن

رێ تەڤ مەل وا رەش کرنو مانە پەریشان
زارۆكو مەزن تەڤدە ب ناڤی مە نڤاندن
چاڤێ تە چلۆ رەش بووە ؟ کێ وا ل تەکریە
دۆر هاتە رباطی چەكو گورزێ خوە هەژاند
زرتێ خوە ددان گۆ وەرە پەسنانە بژێرە
ڤا هەردوو عەگیدا ل هەڤوو دن ڤەگەڕاندن
کولابە دئاڤێتنە هەڤدوو نبە یان
بێ ترسو ڕەڤین هەڤدوو دخوێنی گەڤزاند
نالی بفەلەك چوون بە غەزەب هاتنە هەڤدوو
پێ گورزو کولنگا سەروپێ لەڤ هەڕشاندن
لێ لاوێ چیا هێ خوە نەدی پێکەتە داڤ
زەندو تلیو مل ل وی زووکا دشداند
ئاهاتی ژدەستا وی دگۆ : « تف ل روویی تە
ئەی کۆلەئی دوژمن وەژڤێ رێ چ هێلاندن ؟ »
مللەت شەڤو رۆ قیرە درێ سەر بخۆە بوونێ
نیزیکە کو وا کۆلەئێ وەکتە خەنقاندن »
لەشکەر ڤەڕەڤی چوونە نزارا بهەوارێ
کەوگیرێ مە زووکا خوە بداڤا ڤەکهاندن
وا سەد عەفەرین دانە رباطی کو ژوارە
پسمامو برایێ خوە ب سەر شوڕی شکاندن
ئەی دل (کولۆ) هنگی تو کولو دەردێ خوەباڤێ
رۆژا وە حەقێ لاوێ چیا تەڤدە ستاندن

# هەڵبەستێکی بڵاونەکراوەی خوالێخۆشبوو مەلا حسین شێخ سعدی (فانی)

● بشیر حسین سعدی ●

ئەوا لەخوارەوە پێنج خشتەکی یەکی زانای گەورەی ئاینی مەلا حسێن شیخ سەعدی - تۆمار دەکەین کە هەتا ئێستا لە چ ڕۆژنامەو گۆڤارێکی کوردی‌دا بڵاونەکراوەتەوە ، هیوادارین ئەم زووانە دیوانە دەستنووسەکەی بەچاپ بگەینین .

## پێنج خشتەکی (فانی) لەسەر غەزەلی (زێوەر)

بۆ وەصڵی شیفا فیکری سەفەر مەرهەمە ئیمڕۆ
بۆ چاوی کزم خاکی ڕەهت سورمەمە ئیمڕۆ
کوێی تووە قەدرو شەرەفم کەعبەمە ئیمڕۆ
عالەم بە سەبەب قافلەیی ئاهم تەمە ئیمڕۆ
شوێراوی سروشکم بە مەتەڵ زەمزەمە ئیمڕۆ

* * *

بووم زەردە ئەگەر بێت‌و بڵێم شاهی جیهانی
شایانی زەمان شاهن‌و تۆ شاهی ئەوانی
ڕەمزی دەمە یا جەوهەرە یا نوقطەیی مانی
لێوت کە عەقیقە بوەتە ڕوکنی یەمانی
ماچێ کە جەوازی نی‌یە جێی پەنجەمە ئیمڕۆ

* * *

بۆ نەوعی بەشەر جن‌و مەلەك مەحرەم‌و ئەغیار
طەوفی حەرەمی تۆ بەسە بۆ دەردی دڵی زار
بۆ یێکە دەسووڕێن‌و دەگرێن‌و لە هاوار
مەحفوظە لە بۆسەو لەدەسی عاشقی غەمبار
ئەو ڕوکنەیی شامی کە دەڵێی پەرچەمە ئیمڕۆ

* * *

زولفت کە بە تاریکی‌و پێچی بەچە ناچی
لەو زولەتە ترسم هەیە ڕووحم بە فەناچی
ڕێی ماچی ڕوخی گرتوی تو خدا بڵێ لاچی
خاڵت حجر الاسودە دەست ناکەوی ماچی
دەستم کە بگاتێ سەبەبی روتبەمە ئیمڕۆ

* * *

نەسرین‌و سەمەن یاسەمەن‌و سوسن‌و سونبول
سەودا زەدەیی پەرچەمی تۆن نالەیی بولبول
پڕ حیکمەتی غونچەی دەمتە باعثی ئەی گوڵ
کۆبۆتەوە حەججاجی خەیاڵی لەمینای دڵ
شەیتانی ڕەقیب ڕەجمی لەلام ئەلزەمە ئیمڕۆ

* * *

دەرمانە مەگەر خاکی دەرت بۆ دڵی پڕ زام
بۆ شەرزەمەیی خاص‌و لەبۆ مەجمەعەیی عام
صەد جار بە فیدای خاکی صەفات ئەو سەری هینام
شەو تا بەسەحەر (موزدەلیفە) حوجرەیە مەئوام
ئەما عەرەفەی کوێی تووە جێگەمە ئیمڕۆ




هەوێدی ، کوردەکی ژ ناڤچەیێ ئاناتۆلی‌یێ‌یە . چەر تێ‌زانین ، ل ناڤچەیێ ئاناتۆلی‌یێ ، ل دۆر ئەنقەرێ ، قۆنیە ئو بـاژارێن دن ، قەلێ کـورد تەڤی قـەلێ تـرك دژی . کـوردێن ڤێ‌دەرێ زودا هاتنە ڤی ئالی ، ژ مابەینێ سەدان سال دەرباس بوویە . دیسا ژ ئەوانا . زمانێ باڤ ئو کالان ئو عەداتێن وان بیرنەکرنە .

هنگێ وەخوەند ، هوونێ ببینن ، هەلبەستێن هەوێدی ، ب دلگـەرمی ، ب وەلاتپاریـزی تژەنـە . ئـەو دژی زولم ئـو کەدخواری‌یێ‌یە ، ژ جەم خەباتکـاران ئو بنـدەستانـە . ئەو دهەلبەستـێن خوەدا دەردێن بنـدەستان گـەلەك ب دەلالی ئو هۆستاتی دبێژە .

ئەشکەرەیە کو ، زاراڤایێ ڤی ئالی ، وەکی یێن ئالییێ دن ، هن خوسووسی‌یەتێن خوە هەنە . مە ، بۆنا کو تو خرابی نەدن هەلبەستان ، تشتـەك نەگـوهورانـد ، ئەو ب چشکێ هاتبوون نڤیساندن ، ئەم دیسا ب وی شکلی نەشر دکن .

## زمان

کۆمان هەیە ، زمان ، دەڤ ،
پێشتا هەرە ، گاڤ ب گاڤ .
زمانێ مە داییك ـ باڤ
جامێر رابە بەسە خەو !
زمانێ داییك هنگڤ ،
دبرقە نۆتێ زڤ ،
زمان ئەیام ، ئاڤ ئو شیڤ
رییا راوات ، کری هیڤ ،
هوبکن زمانێ هەڤ .
ژین دبەزە ، لەهی ـ ئاڤ .
رۆنی ، خوەرا مەکە شەڤ
دلبرین ، دلەرزە لێڤ ،
کۆم زمانێ خوە زانی ،
داوستی ، هەمی بانی .
چار ئاوزەم ، یەکە کانی ،
بناتێ کۆماکانی :

## پووك

زڤستان ، بارەش ، شەڤ ئو رۆژ سار ،
خەوێ دا ژین ، پیڤۆك ، دار ..
بخور ، رەژی ، ئێزنگ ، خوار ،
پووکێ ، سەرمێ ، ئالەست کش دەر ،
درێژ وەك سال ، قەفلین ، شەڤ .
بەرف ئو پووگان رێ نەدا هەڤ .

[illegible] بوژین خوەش ، لێکەتی ڕەڤ .
[illegible] -مژیٚ قەرسین چاڤ .
[illegible] قورموجکە پاری ،
[illegible] ، تنە بەری ،
[illegible] مەزن ژوٚردا باری ،
[illegible] ل بەر دەری ،
[illegible] کر ، قالاو خواری ..
[illegible] د ناڤ دا زاری ،
[illegible] هەنە نەدی سەری

## دەندك

[illegible] ناڤ ، نادافی ،
[illegible] .
[illegible] . با ، ڕوٚ ،
[illegible] .
[illegible] ، دەندك ،
[illegible] . ستریهـ ، چلوٚ ڕست ،
[illegible] . هیڤ ، سال ،
[illegible] . تشت ، تاوا ..
[illegible] ، خوەش ، بهەش ،
[illegible] ، سوٚر ، کەسك ، چیق ، ڕەش ..
[illegible] هەرت ، ماشی ، خوار ،
[illegible] ، شابوو ..
[illegible] . دمندك .
[illegible] وی ، وان بزر هشت
[illegible] ، نەرم تاهل ، شیرین ..
[illegible] کرتی گوٚشت

## هلوار

[illegible] بکم هاوار ،
[illegible] نارە .
[illegible] . وازاپەلفین
[illegible] هووزان .

بەزیم ڕیٚ تنە ،
خزانە خوە چووك دی
بەنیشتیٚ دەڤی پیت جو .
چوون هیڤیٚ قوٚم
هووتیٚ دینیٚ بوون یەك ،
هاتنا وازا کرن جوٚم
برینیٚ هوندوور کوٚتی ،
تاوا تاوا نەخوەشی ،
بەژن - سەری پێتی ،
ئاخ ، ئاڤی باش
مینا موژیٚ ڕەش
گەنم ، سێڤ ، زەبەش
وەلات مژ ، گش بنبەخ
جوٚتکاری بیٚئاخ ،
پیتکەنین ، پرس ئو لەخ ..

## دوو چەم

ژ زوٚزانان هات ، دیجلە - فرات ،
پیت گورگورن ، بوٚ چ سوو هات ؟
ل ڕییا دریٚژ هەویژ ئو جوٚت ..
نالین دەردیٚ مەزن فروٚت ،
ڕوٚژ و شەڤ تەرن ، تنە نە خەو ،
بەزین دوو چەم ، همبەری هەڤ .
ئاخیٚ تی‌یە ، قەلشی لێڤ ..
بەژنیٚ دریٚژ خوە پیت بەردا ،
بەژنیٚ دریٚژ ، شیمە دوو چاڤ
بوٚتان زاپیٚ خوە پیت بەردا
هەڤال جڤین ، هەموو سەردا ،
نێزیك مەنزل خوە هەڤ واردا ،
ئافرەمیٚ ژین هاتی زاردا ،
چەمان ، پێلان ، دلیٚ خوە زیز
نان و نیمەت تژی بوون هیز ،
پیڤوٚك ، سوٚسن ، نەوال ئو هوٚز ،
ئاخ خەملی چەژنا پیروٚز .

## بویرۆكرات

خزان بێمەری ،
هەمی بێسەری ،
دز ل سەر پرە ،
ڕەپساند بەری ..
خزانۆ تو ڕویت ،
كالاو ، گشتك هویت ..
جورا ڕاكشاند ،
ڕۆڤی ڕا هشت پویرت .
نەخاشم ، كەشت پشت .
تنەیین دەنگ كوشت
تالان بوو باژار .
دویمە گەمار هشت
بویرۆكرات سولّتان ..
وازا ، پویچە جان ..
ڤا ، « كێ كر كێ » یە[1]
هاكا چوی دەوران ..

## كەو

چوو زۆز[illegible]ێ دندا بوو كەو ،
ڕۆژ ئو ش[illegible]ڤ چاڤێ من نەدی خەو ،
دەڤێ من [illegible]ا دهەلن لێڤ ،
ئەز نۆتێ [illegible]ندێ هەلاندم ..
بناگە دا مۆری‌یێ گار ،
كەوێ دەنگدا سەری زنار ،
لێڤ منگڤین ، شەكرێ زار ،
ئەز هۆز ئو زۆزان گەڕاندم .

بەژنا درێژ نۆتێ فەرە ،
چاڤێ هێشین ئەو بهارە ،
قەنجە خوەش ، تنە تو دەرە ،
مینا پەلك ئەز وەشاندم ..
گەریم ، گریم ، چوویە نیڤ خەم ،
پرێدا چووم ، نەدی‌یە چەم .
سینگێ سپی ، خوشییە ، ئاڤزەم .
ئەز بێ‌ئاڤ ، تینا پەقاندم ..

## شڤان[2]

مستۆ سستۆ ـ پستۆ ، شڤان ،
كولاڤێ قۆل ل كاوان ،
كشاندی كلێ چاوان
مستۆ كاورانا خستۆ ..
مستۆ ـ ڕەشۆ ، لاومەت ،
ڕەشۆ ژار ، سڤك ، بێ‌هەشۆ :
ـ لاومەت ، بزنێ بچێرینە ئیسال ..
مستۆ : ـ لۆ ، باژۆ ناڤ پەز ، بزنان !
تو هاتی هوندووری خەیال ئو دوژمنان ..
ڕەشۆ شا بوو ، چوو هۆنسكا[3] وێدا ،
مستۆ ب تلێ سمێل بادا ..
ڕەشۆ چوو ، بینە چار بزنێ خوە ،
ـ ڕۆژا تە ڕۆنی ، لاوێ مەتا فات !
نفتی دلێ مستۆ
ڤا بۆ بزنا هات ..
ـ بزنا هۆدا چوو ڕۆدا ،
ئا خشت گووران كوشت ،
ئا هێشین دندا بوو ڕۆژا پاشین .
ئا بەلیبانی من جۆتێ وارانی .
ئەیار پێرێ ئێواری ئانی ! ..

---

(1) ناوی كۆوارێكە لە سوریە دەردەچوو .
(2) ئەم پەندە لە زۆر جێیان بەكاردێ ، لە كوردستان .
(3) هۆنسك : ناوی گوندێكە .

## فەرهەنگۆك

تقزمم : كانیاو ، سەرینچاوە
ئەبم : هەوا ، با
ـرەش : رەش‌با ، باهۆز
ـەیلنی : گوێ‌قوت
ـەنیشت : بنێشت

ـەری : بەریك ، بەرك ، گیرفان
ـسكە : گەردن
ـستە : بناخە ، بنەرەت
ـر : توخم

حوەكرن : لەناوبردن ، ون‌كردن
جیق : زەردی تیر
ـ وستی : بەپێوە ، لەسەرپێ
ئەیلر : پێست

گەمار : كڵاو پیسی
خەیاڵ‌دوژمن : دژمن
خەم : تەمەن ، عومر
خومەفوەردان : بەیەكدا جۆش‌خواردن

خشت : ناپەسەند
خوت : هێسكی سەرران ، قاڵچە
هەمی‌بانی : باری هەموو لەسەر پێ وەستان

هەرتن : هارین ، هارینەوە ، تێك شكاندن
هەش : هۆش ، ئاوەز ، ئەقڵ
هەویژ : هاوبیر ، هاوڕێ

میز : كووپە ، هیزە

هۆز : دەشت
كەشتن : شكان ، قەڵشین
كۆمەكان : كۆمەڵان
كۆتن : كرۆشتن
لەهی : لافاو
لەخ‌كرن : گاڵتەكردن
مالك : دایك

ماشین : ماشینەوە ، كرۆشتن
مووژ : مێوژ
نادافی : نم ، شێ
نقتین : دڵۆپان
پەلك : كڵا ، گەڵا
پێتن : برژاندن
پیت : بەگوڕوتوان
پیفۆك : پیشۆك
پووك : فەرتەنە ، وەیشوومە
راوات : ئازادی ، سەربەستی
رەپساندن : ئاوساندن
رستن : سەوزبوون ـ شین‌بوون ، سیس‌هەڵاتن .
سەری : گوڵەگەنم ، سەرك
ستریهـ : ستری ، درك ، درپوو
تاوا : چەشن ، شت
زار : دەم
زیز : زویر
وازا : لاواز ، بێ‌هێز
نۆتێ : وەك
پێشتا : پێشدا ، بۆپێشەوە
هەرە : هەرۆ ، هەرپوو ، برۆ
گاف : گاو ، گام ، هەن [ گاو ]
رابە : هەستە
منگف : هەنگوین
زف : زیو
شیف : شیو
هیف : مانگەشەو ، مانگ

هوبكن : فێربن ، هینبن
زمانێ هەڤ : زمانی یەکتر
دبەزە : ڕادەکا
ڕۆنی : ڕووناکی
بناتێ کۆمەکانی : بنەڕەتی کۆمەڵانە
ئێزنگ : سووتەنی
ئالەست : دلێسێتەوە
مژ : تەم
کنجدڕی : جلوبەرگ شڕو دڕاو
تنەبەری : گیرفانو بەریکیان نیە
گەوروو : گەروو
قورمووچ : لوول
پاری : تیکە ، پاروو
خزان : هەژارو ڕووت ؛ لاواز
قالاو : قەلەو
هیمێ مەزن : بەردی زل
واز : بێهێز
پالە : پالە ، ڕەنجدەر ، کرێکار
تم : هەمیشە
دەندك : قۆزاخە
ناداڤی : تم ، خوناو ، ئاونگ
ڕۆ : ڕۆژ ، هەتاو
کەشتدەندك : قۆزاخەتەقی ، پەموودانە تەقی
چلۆ : بەڕوو
جان : گیانلەبەر
تشت : چشت
تاوا : مەخلووقات
بهەش : بەئاوەز ، بەهۆش
لۆری : سۆزی کرد ، لاواندیەوە ، گۆرانی بەسۆزی گوت
شابوو : شادبوو
بزرهشت : توخمتان بەجێهێشت ، تۆرەوسۆرەتان لێکەوتەوە
تاهل : تاڵ
دەنگ نارە : دەنگ ناڕوا
پەلفین : داڕزان
قادا دزو هووزان : مەیدان دزو پەتپسێنی تێڕژاوە .

ڕێ تنە : ڕێگا نیە .
بەزیم : هەلاتم .
خوە چووكدێ : خۆیان بەکەمزانی
قۆم : قەوم ، خەڵك
دنێ : دنیا
برینێ هوندوور کۆتی : بـرین لە بنەوەڕا چـرکی کردووە ،
بنەوەڕا دەکرۆژێ
بەژن ـ سەری پێتی : سەرتاپا دەسووتێ
ئاڤی باشی : خاکی بەراو
زەبەش : شووتی
وەلات مژ : وڵات بەتەمومژە
گشبنەخ : گشت برشیهەڵێناوە ، بۆکەڕووی لێدێ .
ئاخ : خاك ، زەوی
پیتکەنین ، پوس ئولەخ : بەهێزو توانا لە پێکەنینو شادیدان
تەرن : دەڕۆن
تنە نە خەو : خەو نیە
تیبە : تینووە ، تێنی یە
بۆتان : ناوی ڕووبارێکە
زاپ : ناوی ڕووبارێکە
خۆهەڤ واردا : هێورین لە هەوارێ
چەم : ڕووبار
نێمەت : نیعمەت
تژی : پڕ
بێمەری : بێپیاو ، بێپشتوپەنا
هەمی بێسەری : هەموو بێسەرۆکن
ڕەپساندبەری : گیرفانیان پڕکرد ، ئاوساند .
خزانۆ تو ڕویت : هەژار تۆ ڕووتی
هوندوور : ژوورەوە
لاومەت : منداڵو زارۆك
بێهەش : بێهۆش
ژار : ڕیوەڵە
تلی : پەنجە
مەت : پوور ، پلك
مەتافات : پلکەفاتم .
گوور : گورگ

**شاعیری انگلیزي : جۆن دۆن**
**وەرگێڕ : فریاد ابراهیم رسول**

# مردن .. لە خۆت بایی مەبە!!

## Death , Be not Proud

مردن ئەتۆ .. مردن ئەتۆ :
لە خۆبایی بوونت لەچی ؟
لە خۆبازی بوونت لەچی ؟!
گف . بوونەوەت ،
پف بوونەوەت ،
سوور بوونەوەت ،
مر بونەوەت ،
هەڵسان و هەڵچوونت لەچی ؟

ناوت ئەگەرچی دەرچووە ،
مردن وەهایەو وابووە :
کە گەورەیە ، کە کافرە
کە هەمنشینی ئاگرە
پر ترس و پر مەشەققەتە
پر رەنج و دەردو ئەزیەتە
بەڵام لە ڕاستی‌یا ئەتۆ
ئەوەی دەڵێن دەرحەق بە تۆ ،
قەت وانیە ، دەڵێن درۆ
ئەوانەی تۆ کە تێ‌ئەگەی
دەیان کوژی‌و گیانیان دەبەی
نەمردوون ، نەکەوتوون
ئەی مردنی بێ دەسەلات
ئەی مردنی ڕیسواوو لات
تۆ ناتوانی تاکو منیش
منی زەعیف و تاقەڕیش

منی زەعیف و بێ پەنا
منی بێ‌کەس و پڕ بەلا
لە ناو ببەیت و بم کوژی .
وێنەت لە ڕاحەتی خەوە
لە ناو نوین و جێ‌ی شەوە
خۆش‌ی و شادی هێنەری
لە ززەت و ڕاحەتی سەری
چاوەڕوانینی هاتنت
هاتنی خۆشی هێنەرت
جا مردنی بە دەست و برد
لیمان نەبری خێرو فەڕت
چاوەڕوانین ..
چاوەڕوانین کە زوو بە زوو
لاوانمان .. پیاوانمان
ببەی لە گەڵ خۆت زوو بە زوو
ڕایان ڕفێنی زوو بە زوو
یەك یەك وەیا خۆ دوو بە دوو
تۆ ئەی مایەی حەسانەوە ،
حەسانەوەی لەش و دەروون
دەردی لەش و داوای دەروون
تۆ نۆکەری چارەنووسی
چ نۆکەری چاپلووسی
عەبدی تالیع و بەختی تۆ
ژێر دەستی شاو تەختی تۆ
یاوەری لێ‌قەوماوانی

دۆستی دەروون سووتاوانی
هاوڕێی بێ چارە پیاوانی .
ژینت لە گەڵ ژەهرو شەڕە
ناوت لە گەڵ دەردی سەرە
لەگەڵ نەخۆشی‌دا دەژی
لەگەڵ تەندروستی دژی
یەك شت بزانە ئەی مردن
ئەی مردنی بێ سەرڕەوین
حەشیشەو شەڕاب و مەی
وەك تۆ دەبەخشن سازو نەی
هێنەری خۆش و خەون
داهێنەری بەزمی شەون
چاتریش دەست دەوەشێنن
توخمی خەمۆشی دەڕوێنن
جا کەوایە بۆچ پف دەبی
بۆ وەکوو ژووژك گف دەبی
بۆ دەئاوسێ‌ی وەکو کەلەش
ئەستوور دەبی بەسەر ، بەلەش
کارت هەر یەکە هەر خەوە
دووایی ئەم کورتە خەوە
بە گورجی هەڵدەستینەوە
جارێکی تر نامرینەوە .
مردن برۆ .. مردن برۆ
ناووت بووە کەچە[1] پەڕۆ
ئیتر ناوت لێرە نابەین
دڵمان بە تووە پەست ناکەین
مردن .. مردن .. ئەتۆ ئەوجا
نۆرەت گەیشت دەبێ بمری
مردن ! ئەتۆ دەبێ بمری !!

(1) کەچەپەڕۆ : کۆنە پەڕۆ

سەرچاوە :
Poet,s World
By : James Reeves

# سەوزەگیا

● شەماڵ ●
فەڕەنسا ـ تەمووزی 1984

ـ تەمەنت چەند ساڵە ؟

(لێوەکانم هاتنە لەرزین و هەناسەم سواربوو . گرژ بوونی دەمارەکان زۆریان بۆ دەهێنام و پاڵیان پێوە دەنام تا بە ناو لولەیەکی گەرمدا فڕێ درامە ناو تاریکاییەکی گەرمتر . ماندوو ، پەشۆکاو ، کەوتمە پەلکوتان . کاتێ دەویست خۆم لە نامۆیی نیشتەجێ نوێکەم ڕزگار بکەم .)

ـ چیتە بۆ وەلام نادەیتەوە ؟

(لەم تونی بابایەدا چی دەکەم ؟ بۆ دارستان و شاخ و دەشت و ڕوبار و دەریاو کانیەکانم جێهێشت ؟)

ـ تۆ کەڕی ؟

(لەناو تاریکاییەکەدا کەوتمە پەلکوتان ، پارچە پارچەکانی خۆم کۆدەکردەوە ، جێگاکەم تەسك دەبۆوە و دیوارەکان تەنگیان پێهەڵدەچنیم ، ئەو دیوی دیوارەکان ترس و نامۆیی بوون . خۆم بە نینۆك هەڵدەواسی بە دیوارەکاندا . لافاوی خوێن لولی دام و فڕێی دامە ناو دۆڵێکەوە .

دێوە دان ڕزیوەکان ، جگەرەی خۆشکێش لەدەستەوە ، بە دەمی داپچڕاوی پڕ لە لیکی زەردەوە ، لەمبەرو ئەوبەری دۆڵەکەوە پێشوازیان لێ کردم .)

(هەتا هێزم تیابوو ڕامکرد ، خۆم کێشا بە کەواو سەڵتە لەبەرێکی مێزەر سپیدا ، نەگیرسامەوە ، دوو سێ تف و نەحلەتی بە دوامدا فڕێدا . ئەستێرە بابردەڵەکان لە ژێر لێفەی تەم و مژدا تاسابوون ، داوای مژدانەی لە دایکبوونم لە ناوکم کرد چاوەکانی لێبز کردمەوە .)

ـ وەلام بدەرەوە ! چیت لێدەپرسم ؟

بە ناچاری پەنجەی مۆرم نا بە بڕیاری کۆیلەیی خۆمدا . بو پێنج پیت و چەند ژمارەیەکی تێکەلاو . بە تەوژمێکی یاخ خەوێکی نەهاتەدی تێکەڵی گا گەلێك بووم . لە گەڕان بەدو خۆمدا ، هەرگاکەلەو مەدالیای ڕەوشتی خۆی خەلات کرد منیش بۆ یادگار لە ژووری ئافرەتێکی خرپنەی لەش فرۆش هەڵواسین .

بەدوکەڵی جگەرەیەکی داگیراوە کۆیلایەتیەک فەراموش کرد ! .

(ئەو ڕۆژەی کە ئاسمان ، زەوی ، خواکان ، تۆو ئاژەڵەکان دایکبوون ، دروست کرام بە ئارەزوو هەوەسی خۆپەرستانەو ئەنجامی پاشماوە تەقینەوە کانی گەردوون .)

ئەڵقە ڕیزی شێتیان دا لە دەرگای ژوورەکەم و سێجار بڕیا سزای مەرگمیان مۆر کرد .

ـ ڕۆڵە تۆ سەر بە گۆبەندو شومی !

(هەموو سنورو سنوری گەورەو بچوکیشم بە بێ شێلا هیواکان کرمە ڕێز بوون و ئالای شێتی خۆم لە چوارچێوە گرت باوەشی شلەتێنی کچۆڵە ئەوروپاییەکاندا گیرسامەوە . مێ دایە سۆزو ئارەزووم . هەر شەپۆلێك بەتین دەهات کەنار خۆێ ئەدایە بەری . خۆم خستە داوێنی شەوێکی کوێرو تا هێ تیابوو بەدەنگی بەرز وتەکانی خاوەن چایخانەکەم گیلگامێش وتەوە . ملوانکەی شەوە کوێرەکەم بە گڕوگاڵە پچڕاند دەنکە دەنکە دەم هۆنیەوە ، لافاوی پێکەنینی هەستا ماندوو ، پەشۆکاو ئەودیوی تاریکاییێکە پڕە لە ترسی و نامۆیی خۆم بە نینۆك بەدیواری ئەم شەوە کوێرەدا هەڵدەواسم .




لەسەر قەرەویلەیەکی هۆڵی نەخۆشخانەکە ڕاکشابوو ، ـووی بەلای پەنجەرەکەوە وەرگێڕابوو... لەبەر بەرزی ئـەم ـهومەی ئەمی تیایـە، ئاسمـانی شین نـەبێ هیچی کەی لەو ـەنجەرانەوە بەدی نەدەکرد.. گوێی ڕایەڵ کردبوو بۆ دەنگی ـ ـیۆیەکی دوور، گۆرانی بوو.. هەستی لەخۆی بڕیبوو ، جگە ـەو دەنگە دووره کشو ماتیەکی پاشنیوەڕۆیی چەتری بەسەر ـەخۆشەکاندا هەڵدابوو .

ـ ـەی ڕەنج بە خەسار کاکەی گۆرانیبێژ.. هەتـا گۆرانیـەك ـیێتە بەرهەمو تۆمـاری دەکەی چـەند ئـازارو ئەشکـەنجە ـەکێشێ، چەندین کۆسپ لە ڕێگاتا سەر بەرز دەکەنەوە.. چەند ـە تسانی خەڵکی گـوێت لێ رادەگرن.. لەوان وایـە تۆ بـەم گۆرانی گوتنە ڕادەبوێری. هەست بـە مانـدوویەتی مێشـكو ـەست و دەرونت ناکەن؛

بە ئاستەم توانای ئەم دیـوو ئەو دیـوکردنی هـەبوو.. ـیری و نەخۆشی بەجارێ تەنگیان پێ هەڵچنیبوو.. هەرچەندە

تەمەنی لە حەفتا ساڵ تێپەڕ بوو بوو، بـەڵام پاکیو خـاوێنی ـەیەکەم سەیرکـردنیا سـەرنجی مرۆڤی ڕادەکێشـا ، ڕۆژگار

ڕوخسـاری ئەم پیـرێژنەی بـەتـەواوی کێـلا بـوو.. بـەڵام نەیتوانیبـوو شوێنـەواری تارمـایی جوانیی تـاق لاویی لە شێوەو چاوەکانیدا بشارێتەوە.

دەنگی گۆرانیەکە کپ بوو.. هەناسـەیەکی هـەڵکێشا، ڕووی کردە لای نەخۆشەکەی تەنیشتیەوە..

ـ ئەرێ کچم ئەمڕۆ باشتر نیت.؟

ـ بەخوا پووری ئەمڕۆ باشترم لە خوا بەزیاد بێ ، بەڵام زۆر بیری مناڵەکانم دەکەم .. بە پەرۆشەوە چاوەڕێی سبـەینێ دەکەم چونکە ڕۆژی ـ مواجەهەیە ـ خوا ئەمجارەیش بـە بینینیان شادم بکـاتەوە هیچیکـەم نەدەویست. ئـەی پووری وادیارە کەسووکاری تۆ دوورن وا هیچ نابینم کەسێ سەرت لێ بدا؟ وەك بە چاوەڕێی کەسیشەوە نەبیت وای.

چاوەڕوانی پرسیارێکی وا جەرگ بڕی نەدەکرد. دووبارە ڕووی کـردەوە لای پەنجـەرەکە، وەکـوو نارەزایی دەربـڕینێك. لە ڕاستیدا بێکەس بوو. کەسیش سەری لێ نەدەدا، لەو ڕۆژەوە کەسی نەما کە گۆرانی گوتنی کردە کەسی خۆی خزمو کەسانی نەفرەتیان لێ کرد.. ئەمیش ناچار لەگەڵ گێژەڵۆکی دونیایەکی تایبەتیدا خولی خواردەوە. بە ئاستەم چاوەکانی لێکنا.. ئەم پرسیارەی هاوسێ نەخۆشەکەی بە گورجی شریتی تۆزاویی ڕابوردووی خستەوە جووڵەو خولانەوە، بە پچڕ پچڕی لەسەر شووشەی پـەنجەرەکـە دەی بینی «هەتـا من کەسم هـەبوو خەڵکی دەیناسیم »....دنای چەند کەس بە حەسرەتی ئەوەوە بوون چاوێکیان بۆ هەڵبێنم..! ، چەند بە دەنـگو ئاوازەکـەم شادیم دەخستە دڵو مێشکی سەر مەستانەوە..برینی لاوانم سـارێژ دەکـرد، بەیتـەکانم ویـردی سەر زاری دەروێشـانوو دڵسوتاوانی ڕێگەی عیشق بوون. بۆناوداراني میللەت هەرخۆم شیوەن گێڕبووم.. هاواری سرودم گڕی بڵێسەی سینەی زۆر لێکراوانی خۆشتر دەکرد.. دەنگی قەوانەکانم لە دیوەخـانەو چاخانەکانا مەجلیسی خۆشو گەرمتر دەکرد..»

ـ ئەرێ پووری وەڵامی پرسیارەکەمت نەدایەوە، دەڵێی توون بوتیەوە؟!..

رووی کردەوە لای خاوەن پرسیارەکە، بە ئاستەم چاوی هەڵبڕی.. فرمێسکە پەنگ خواردوەکەی ژێر پێڵوەکانی بە خوڕ هاتنە خوارێ، بە لوچیەکانی ڕوویدا سەرەو ژێر بوونەوە.. ئەمە باشترین وەڵام بوو بۆ پرسیاری ئەو ئافرەتە.. ڕێگەی لە هەموو پرسیارێکی کەی بڕی. پرسیارەکەی ئەم ئافرەتە، پرسیارەکانی کابرای دوختۆریی بە بیر هێنایەوە، کە لە یەکەم ڕۆژی هاتنی بۆ ئەم نەخۆشخانەیە ئاراستەی کرد.

- ناوت؟
- ب.ا.ي
- تەمەنت؟
- حەفتا ساڵ زیاتر.
- نیزیك ترین کەست کێیە لێرە؟
- بۆ چیتە؟
- بۆئەوەی لە کاتی پێویستیا خەبەری بدەینێ.. (کەسم نیە)
- چۆن؟
- ئێوە کەسمن..

دوختۆرەکە چیتر درێژەی پێ نەدا. پاش چەند ڕۆژێ.. نیوەشەو بەدواوە .. دەنگی هەنسکدان و گریانێکی کپ و پچڕ پچڕ لە قاوشەکەدا پەیدا بوو .دوو زەلام بە عارەبانەیەکەوە هاتنە قاوشەکەوە، بە ئاسپایی نایانە سەری و بێ ئەوەی ورتەیان لێوە بێت، بردیان.

هەواڵی مردنی لە نێو چواردیواری قاوشەکەیدا دەنگی دایەوەو هیچی تر، هەواڵێکی ساردو سڕ. دەزگا هونەریەکان بەم هەواڵەیان نەبیست، ڕۆژنامەکان دێڕێکیان لەسەر نەنووسی لە هەمان ڕۆژدا ئیستگەی رادیۆ - بە ڕێکەوت - گۆرانیەکی ئەوی پێشکەش کرد..! بەڵام کەس نەیدەزانی لەم ڕۆژەدا خاوەنی ئەم دەنگە سەری نایەوە....
ئەوەی لەم ڕۆژە روویدا لە (ب.ا.ی) تەنها ئەوەبوو لاشەکەیان خستە ژێر دەستی قوتابیانی ئەو کۆلیجەی سەر بە خەستەخانەکە بوو، بۆ ئەوەی پەل پەلی بکەنەوە!!




**هیمداد حوسین**

**کۆلێژی ئەدەبیات - هەولێر 1983**

نیوەڕۆبوو ، یەکێ لە ڕۆژە گەرمەکانی ئاخرو ئۆخری بەهارو سەرەتای هاوینی ئەمساڵ بوو . نیوەڕۆیان کردبوویان بە پیشە دوای نان خواردن هەریەکەی لە شوێن خۆی لێ دەخەوت .. ئەم نیوەڕۆیە خەو لە چاوانت تۆرابوو ، وەك یەکێ کارەساتێکی جەرگ بڕی لێ قەومابێ کوڵێ خەفەت و ئازارو ژان لە ناوەوە تەنگیان پێ هەڵچنی بووی . دەستێکت بۆ گۆڤارەکەی تەنیشتت درێژ کرد ، لاپەڕەی یەکەم و دووەم و سێیەمت هەڵدایەوە ، هەتا دەستت تێدابوو فڕێت دا ، چی یە ئەوە ، هەموو جارێك هەر یەك شت دەنووسن ..
جیهان لە پێش چاوت زۆر بچووك بیووەوە ، هێندەی سێوێکیشی لێ نەمابووەوە . کەشتی خەیاڵت بۆ تاوێکیش لە هیچ بەندەرێکا لەنگەری نەدەگرت . هەناسەیەکی قووڵت هەڵکێشا ، لەبەر خۆتەوە بە وورتەیەکەوە نەوەك گوێیان لێت بێ

- ئاخ لەم ژیانە ..
هەستت دەکرد سەرت ژان دەکا ، دوورنی یە وەك بۆمبایەك بتەقێ . دەستێکت خستە سەر نێو چەوانت . چاوەکانت هەڵگلۆفتی ..

تەق تەق تەق .. یەکێ لە دەرگایدا ، بەپەلە شوێن خۆتەوە هەڵسای

- کێیە ؟
- خۆمانین
دەرگاکەت کردەوە . باجی ئایشێ‌ی دایکی سالاری هاوڕێت بوو ، زەرفێکی کاغەزی بەدەستەوەبوو . تۆش فەرمووت لێکرد .
- کوڕم کێتان لە مارێیە ؟ .
- وەڵڵا باجی هەر خۆمانین ، دەفەرموو .
تۆزێ بەخێرایی پێش ئەو گەڕایتەوە ژوورەوە ، بانگی دایکت کرد ، دایە .. دایە هەستە باجی ئایشێ هاتی‌یە . دایکت هەڵسا ..

- باجی ئایشێ ئەوە ئەتووی ، دەوەرە
- سەلامو عەلێك
- سەلام ، بەخێر بێ‌ی
- چی‌یە ئەوە دەرێی نووستبوون ؟.
- ئەرێ وەڵڵا ، چ بکەین .
- لە خەویشم کردن .
- کچێ نانا ، دە دانیشە .

باجی ئایشێ دانیشت ، دەستێکی بۆ زەرفەکە برد کارتێکی بووك گواستنەوەی دەرهێنا دایە دەست دایکم‌و ووتی :
- ڕۆژی جوحمەی دەبی بێنە مارێمە ، ژنێ لۆ سالاری کوڕم دەینین ئەمجا ڕووی لەتۆ کردو ووتی :

- کوڕم دەبی ئەتوش هەربێ‌ی .
- ئینشاڵڵا

- ئەدی ئەتو کەینێ ئەوها شاییەکمان لۆ دەگێڕی هێشتا وەڵامم نەدابووەوە ، دایکم بەزەردە خەنەیەکەوە هاتە وەڵام : باجی ئایشێ ئاسۆ جارێ مندارە ژنی لۆچی‌یە ؟ خۆت گرموڵە کردەوە ، سەرت شۆڕکردەوە ، سەیرێکی دایکت‌و باجی ئایشێت کردو بەسەر لێوانەوە زەردەخەنەیەکت بۆ کردن ، بەڵام چی لەناخەوە ئەکوڵایت‌و ڕقت لە دایکت هەڵسابوو . باجی ئایشێش لەشوێن خۆی هەڵساو خواحافیزی لێکردن . دەتویست پێبکەنی ، زۆر قایم پێبکەنی ، هەرچەند هێزت دەدایە بەرخۆت بێسوود بوو ، قوڕگت دەنگتی لە سێدارە دەدا .

دوێنێ بەیانی کۆلیجت هاتەوە یاد ، لەگەڵ نازدار بەجووتە لە کۆلیج دوور کەوتنەوە ، بۆت باس‌کرد ، ئەوەی دوو ساڵە لەناختا پەنگی خواردبووەوە ، ئەوەی بە ئاوات بووی ڕۆژێ لە ڕۆژان ئازایەتی بتگرێ‌و بەرامبەر ئەو کچەی خۆشەویستی لەگەڵ خوێنتا تێکەڵ بووە بۆی بدرکێنی . دوێنی هەموو ئازایەتیەکت لەخۆدا کۆکردەوەو ووشەی خۆشەویستیت بەگوێی دڵیا چرپاند ، مەلی بەندی قەفەسی سینەتت بەرەڵڵا کرد . بەڵێنت پێدا ، خوا یاربێ لە داهاتوویەکی نزیك ، هەمووی ساڵێکتان لە کۆلیج ماوەو دەنێری‌یە خوازبێنی .

تەواو بێزار بووی ، کارمامزی ئۆقرەت لەدەشتی سینەتا تەڕاتێنی بوو ، لەگەڵ بەخەیاڵداهاتنی هەر ڕۆژێك لە ڕۆژانی کۆلیج تیرێك بوو جەرگی کۆن دەکردی . لەپڕ زنجیرەی بیرت ترازاو لەشوێن خۆتەوە هەڵسای بەرەو ژووری ئاوێنەکە ملت نا ، لەبەردەم ئاوێنە زل‌و گەورەکەتان دەستێکت بەلا سمێلە قنجەکەتا هێناو بە هەموو هێزێکتەوە داتە قاقای پێکەنین .

تەموزی 1983



مار = ماڵ
مندار = منداڵ
دەرێی : دەڵێی
مارێمە : ماڵی ئێمە
لۆ : بۆ

# سەگ

چیرۆکی

● یاسین رفاعیة ●

وەرگێڕانی

● خەبات ئەحمەد ●

عەلی هەموو ڕۆژێ گەڕەکە کۆنەکەی خۆیانی جێئەهێشت و لە شەقامە تازەکەی نزیک خۆیاندا پیاسەی ئەکرد کە ئەم بەرو ئەو بەری بە کۆشك رازابۆوە . عەلی لێرەدا جۆرە هەوایەکی دیکە هەڵئەمژێ ، جۆرە خەڵکێك ئەبینێ کە زۆر جیاوازە لەو خەڵکانەی لە گەڕەکەکەی خۆیاندا ئەیانبینێ ، هەموو پاك و خاوێنن ، جل و بەرگی قەشەنگ لەبەر ئەکەن ، لەبەردەم کۆشکەکانیاندا ئۆتۆمۆبیلی هەمە چەشن وەستاون .

ڕۆژێکیان ، عەلی لەبەر دەرگایەکی گەورەی ئاسنین ا راوە ستا ، لە توێی شیشەکانیەوە ئەیڕوانییە کۆشکەکە ، ئەو کۆشکەی کەوتۆتە نێوان باخچەیەکی پڕ لە گوڵی جۆراو جۆر ، جگە لە چەند ئاوزێڵێکی بچووك لەم لاو لەولا کە ئاوەکەی لە چەند کوڵو بیرێکی مسینەوە هەڵئەقوڵا ، چەترێکی گەورەی ڕەنگاوڕەنگ لای ڕاستی کۆشکەکەوە کە ئەندامانی خێزانەکەی لەژێردا دائەنیشتن : کابرایەکی بەساڵاچوو ڕۆژنامە ئەخوێنێتەوە ، ژنێك خوری ئەچنێ ، کچێکی گەنج کتێب ئەخوێنێتەوە ، لەولایشەوە کوڕێکی هاوتەمەنی خۆی کۆمەڵە سەگێك دەوریان لێداوە .

عەلی زۆر تەماشای ئەم شوێنە ئەفسوناوی‌یەی ئەکرد ، هەتا کوڕەکە بەدی‌ی‌کرد ، سەگەکانی جێهێشت و هێدی هێدی لە دەرگاکە نزیك بۆوە تاڕێك کەوتە بەرامبەر عەلی ، عەلی تەماشایەکی کرد بینی چەند پاك و خاوێنە ، پرچە زەردەکەی زۆر بەجوانی ڕێکخراوە . عەلی ویستی بڕوا ، بەڵام ئەو بە پرسیارێك رایگرت :

– حەزت لە باخچەکەمان هەیە ؟

عەلی ووتی :

– زۆر جوانە .
– ئێوە باخچەتان هەیە ؟
– ناوەڵا نیمانە .
– ئەی سەگتان هەیە ؟
– نەء نیمانە .
– ئەی قەمەرە ؟
– ناوەڵا ئەویش .

عەلی ئەبینێ کوڕەکە گەشکە ئەیگرێ و ئەڵێ :

– ئەمە باخچەکەمانە .

ئەوجا کوڵانەی سەگەکانی پێ‌نیشان‌داو ووتی :

– ئەوەیش سەگەکانمان

پاشان دەستی بۆ ئۆتۆمۆبیلەکەی خۆیان راکێشاو وتی :

– ئەوەیش سەیارەکەمانە .

عەلی ووتی :

– ژیانێکی خۆشتان هەیە .

دیسان ویستی بڕوات ، بەڵام کوڕەکە پێ‌ی گووت :

– وەرە .. سەیری سەگەکان بکە .

عەلی پێ‌ی ناخۆش نەبوو ، کوڕەکە کەلێنێکی لە دەرگاکە کردەوەو دەستی عەلی‌ی گرت و هێنایە ژوورێ .

کوڕەکە گووتی :

- ناوت چی‌یە ؟
- عەلی .. ئەی توو ؟
- زیاد .

کوڕەکە گووتی :

- باباوکم نەمانبینێ ، بچینە پشت ئەو دیوارەوە .

عەلی گووتی :

- بۆچی ؟
- چونکە باوکم منالی چلکنی خۆش ناوێ .

عەلی ترسا ، ویستی هەڵێو بگەڕێتەوە ، بەلام زیاد دەستی گرت‌و توند بەخۆیەوەی گرێدا . گەیشتنە شوێنی سەگەکان ، چوار سەگ بوون ، هەریەکەیان بەچەشن‌و رەنگێ . لە ناوەندی باخچەکەشدا کەوێلێکی دارینی بزورگ هەبوو ، زیاد دەستی درێژ کردو گووتی :

- ئەوەش کولانەکەیانە .

عەلی ویستی دەست‌بەسەر سەگێکیاندا بهێنێ . بەلام ئەو لەجێی خۆی راپەڕی‌و بەتوندی دەستی بەوەڕین کرد . عەلی ترساو چەند هەنگاوێ بەرەو پاش کشا . بەلام زیاد پێکەنی‌و رووی لە سەگەکە کرد : هوس . ئەوە هاوڕێمە . سەگەکەیش لەسەر دووقاچی پشتەوەی دانیشت‌و بەسەرنجێکی درندانەوە ئەیڕوانی‌یە عەلی‌و خێسەی لێ ئەکرد . عەلی تەماشای سەگەکانی ئەکرد ، کابرایەکی بە سالاچوو بەرۆیەکی سپی لە پێشەوەی پانتۆلەکەیەوە بەستبوو ، هات‌و پەتی ملی سەگەکان کەبەزەوی‌یەوە بەسترابوون کردیەوە . زیاد پێی گووت :

- مام جەمیل بۆکوێیان ئەبەی ؟
- کاتی نان خواردنە .

زیاد بەعەلی‌ی گووت :

- وەرە .. سێریان کە چۆن نان ئەخۆن .

بە دوای سەگەکانەوە رۆی ، عەلیش بەدوایەوە .

پیاوەکە چووە ژوورێکی لاتەنیشتەوە ، سەگەکانیش بە مرە مرەوە وەدووی کەوتن ، کەفی سپیش بەدەم‌و لیوێیانەوە بوو .

پیاوەکە شوشەبەندێکی مسینی لە زەویەکە دانا ، شوشەبەندێکی دیکەش کە شیری تیابوو ، یەکێکی دیش ئاوی تیابوو ، شوشەیەکی دیکەشی دەرهێنا چەند پارچە گۆشتێکی گەورە گەورەی تیابوو ، پارچەیەکی فرێدایە ناو شووشەبەندە مسینەکەوە سەگەکان بە هەلەداوان بۆی چوون .

عەلی گووتی :

- ئەوە چی‌یە ؟

زیاد گووتی :

- گۆشتی مەڕە .

عەلی وای هەست کرد کەشتێك رووی‌دا ، چوار قاچی لێ‌پەیدابوو . ئەیویست قسە بکات بەلام دەنگی بەوەڕین ئەچوو ، زۆری برسی‌بوو ، بەتاو بەرەو شوشە بەندە مسینەکە چوو تا ئەویش لە تەك سەگەکانی دیکەدا شتێکی بەرکەوێ . بەلام سەگەکان هەستیان کرد کەوا سەگێکی نامۆ خۆی خزانۆتە نێویانەوە ، هاتن بەگژیدا ، سەگە نامۆکەش هەلات‌و چووە دەرەوە ، سەگەکانیش بەدوایەوە تا لە باخچەکەیش وەدەریان نا .

عەلی لە ترساندا هەڵئەلەرزی ، شەقامەکەی جێ‌هێشت نەیزانی بەرەو کوێ ئەڕوا ، ئەیویست ئەو رێگایەی بۆ مالی خۆیانی ئەبات بدۆزێتەوە ، بەلام بێ‌هوودە بوو ، چونکە ئەو هەموو رێگاکانی بیرچو بووە .

---

* لە کۆمەلە چیرۆکی (العصافیر ـ یاسین رفاعیة) .

# سێیەم کوڕ

چیرۆکی : پلاتۆنۆف

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە :
شێرزاد حەسەن

لە یەکێ لەو ناوچانەی کە سەر بە پایتەختن .. پیرەژنێك کۆچی دوایی کرد . مێردە پیرو کەنەفتەکەشی تەمەنی گەیشتبووە حەفتا ساڵ .. پیرەمێرد کرێکارێکی خانەنشین کراو بوو .. ڕووەو پۆستەخانەیەك ملی‌ناو شەش بروسکەی وەکویەکی بۆ چەندەها هەرێم‌و شاری جیاجیا نارد :
**«دایکتان کۆچی دوایی کرد .. بگەڕێنەوە ماڵێ .. باوکتان .»**

یاریدەدەری پۆستەخانەکە پیرەژنێکی بەتەمەن بوو .. زۆری پێ‌چوو تا پارەکەی ژمارد ، چەند جارێکیش لە کۆکردنەوەدا کەوتە هەڵەوە .. پیرەژن پسوولەکانی بڕی‌و بە دەست‌وپلێکی لەرزۆکەوە بروسکەکانی مۆر کرد .

پیرەمێردەکەش لەژێر چاوە سووربوووەکانی‌یەوەو لە پەنجەرەکەوە ـ زۆر نەرم‌و نیان ـ لە پیرەژنەکە ورد دەبۆوەو دیقەتی دەدا .. گەلۆرانەش بیری لە زۆر شتی دیکە دەکردەوە .. بەو هیوایەی باری گرانی خەمی دڵی سووکتر بێ . وای هەست دەکرد : ئەم پیرەژنەش هەناسەساردو دڵشکاو بێ .. دەشێ خاوەنی ڕۆحێکی پڕ گرێ‌و هەمیشەشێواو بێ ـ ڕەنگە بیوەژن بێ .. یا ئەوەتا ژنێکی تەنیاو جێماوی مێردێکی دڵڕەق‌و بێ‌بەزەیی بێ .. !

ئەوەتانێ پیرەژن .. خاوو خلیچکەو لەسەرخۆ دەجووڵێتەوە ، ئەم دەست‌و ئەو دەست بە پارەکە دەکا ، پیرەژنێکی زەین‌کوێرە .. خەیاڵی دەڕواو بیری دەچێتەوە چی بکا . مرۆڤیش .. هەر مرۆڤێك بۆ هەر کارێك کە دەیکا : لە ناخەوە هێمنی گەرەکە .. ئەگەریش‌چی ئەو کارە زۆر سادەو بێ‌گرێ بێ .

دوای ناردنی بروسکەکان پیرەباوك گەڕایەوە ماڵێ ، لەسەر کورسی‌یەکی نزیك مێزە درێژەکەو لەبەر پێ‌ی ساردوسڕی ژنە مردووەکەی لێ‌ی دانیشت ، جگەرەیەکی داگیرساند ، لەژێر لێوەوەو بەخەم‌و حەسرەتەوە چرپاندی .. سەرێکی هەڵبڕی‌و سەیرێکی ئەو مەلە تەنیاو بۆرو عەنتیکەی ناو قەفەزەکەی کرد .. مەلەکەش لە باڵەفڕێ نەدەکەوت‌و بەسەر دارە باریکەکانی ناو قەفەزەکەوە هەڵدەبەزییەوەو دادەبەزییەوە .. تاوتاویش بە کپی دەگریاو فرمێسکی دادەباراند .. پاشان خۆی دەگرت‌و هێور دەبۆوە .. یا سەعاتەکەی بەرباخەڵی دەردەهێناو قورمیشی دەکرد .. ڕووەو پەنجەرەکە دەیڕوانی‌و لە دونیای دەرەوە ڕادەما .. بەردەوامیش ئاووهەواکەی دەگۆڕا ـ ساتێ گەڵای درەختەکان هەڵدەوەرین .. بەیەکەوە لەگەڵ کلووی بەفری تەڕو ماندوودا دەبارین .. تاوێ دەیکردەوە باران .. ئەمێستاکەش خۆری ئێوارەی دەمکەل وەك ئەستێرەیەکی ساردوسڕ دەدرەوشایەوە . پیرەمێردیش هەر چاوەڕوانی کوڕەکانی بوو .

یەکەمجار .. بۆ ڕۆژی دواتر کوڕە هەرە گەورەکەی بە فرۆکە گەیشتەجێ . پێنج کوڕەکانی دیکەی لەمیانەی چل‌و هەشت سەعاتی ئایندەداو یەك لە دوای یەك گەیشتنە ماڵی

باوكيان و كۆبوونەوە .

يەكێ لە كوڕە گەورەكانی ـ سی یەمیان ـ خۆی و كچە چكۆلانەكەی گەیشتنەجێ .. تەمەنی كیژە هەر شەش ساڵ دەبوو .. لەمەوپێش باپیرەی نەدیبوو .

سێ ڕۆژ پترە .. دایكیان لەسەر ئەم مێزە ڕاكشاوە ، كەچی بۆنی مردن لەو تەرمە ڕاكشاوەی نەدەهات ، نەخۆشی و لاوازی كوشندە لاشەی پیرەژنیان پاك كردبۆوە ، بەدرێژایی سالانێك ژیانێكی تێرو تەسەل و پڕتەندروستی بە كوڕەكانی بەخشیبوو .. بۆیە ئەوەی بۆ پیرەژن مابۆوە : لاشەیەكی چكۆلانەو لاوازو بێكەڵك بوو كە توانیبووی بە هەوڵی مەردانە خۆی بەپێوە بگرێ ـ ئەگەریش چی بە حاڵێكی زۆر ناخۆش و نالەبار بوو بێ .. حاڵێك بووبێتە مایەی بەزەیی .. تەنها لەپێناو ئەوەی میهرو خۆشەویستی بەسەر كوڕەكانیا ببارێنێ و شانازیان پێوە بكا ـ تا ئەو ڕۆژەی سەر دەنێتەوە .

پیاوە كەتەكان ـ لە بیست ساڵ كەمترو لە چلیش پتر نەدەبوون ـ كپ و مات بەچواردەوری تەرمە ڕاكشاوەكەی سەر مێزەكە وەستان . هەر شەش كوڕ بەیەكەوە .. حەوتەمینیان پیرەباوك بوو ، كورت و لاواز ، بگرە لە كوڕە هەرە چكۆلانەكەی خۆیشی كورت و لاوازتر بوو . پیرەمێرد كوڕەزاكەی گرتبووە باوەش .. كچەش لە ترسی تەرمەكە چاوەكانی دەنووقاند .. لاشەی پیرەژنێكی غەریب : هەر دەتوت لەژێر پێلووە نیمچەداخراوەكانی یەوە بەچاوێكی سپی و بێتروكە سەیری كچە چكۆلانەكە دەكا .

تاو نا تاوێ كوڕەكانی دەگریان ، بەلام نەیاندەهێشت فرمێسكەكان داباریێنە سەر ڕوومەتیان .. هەر خۆیان دەخواردەوە .. تا باری ئەو خەمە قورسە هەلبگرن و بەكپی و پیاوانە پرسەكەی ڕاگرن لە ناوەوە هەر پیشیان دەخواردەوە .. لە حەزمەتاندا دەم و چاویان گرژ ببوو . باوكیان لە گریان و قوڕپێوان ژیر ببۆوە .. بەرلەوەی ئەوان بگەنەجێ ئەو بەتەنیا بەقەد هەر شەشیان و پتر شینی خۆی گێڕا بوو .. كوڵ و كۆی دامركا بوو .. ئێستاش كە سەیری ئەو شەش كوڕە بەهێزو بازوو ئەستوورانەی خۆی دەكا خۆشی و كەیفێك لە دلیا دەگەڕێ كە لەم پرسەیەدا وەختی نی یە .. كە دیقەتیان دەدا لە ناخەوەو بەدزییەوە دەكولێ . دوانیان : دەریاوانن و بوونەتە كاپتنی پاپۆڕەكانیان .. یەكێكی دیكەشیان ئەكتەرێكە لە مۆسكۆ .. ئەوی تریان : باوكی كچە چكۆلانەكە فیزیایی یە .. لە هەموویان بچوكتر : دەیخوێند تا ببێ بە ئەندازیاری كشت و كاڵ .. كەچی برا گەورەكەیان لە كارگەیەكی فرۆكەدا ـ سەرۆك بەش ـ بوو .. وەك كرێكارێكی دەست ڕەنگین و لێهاتوو نیشانەیەكیان پێ بەخشیبوو كە بەسەر سنگی یەوە دەدرەوشایەوە . هەر شەش براو پیرە باوك بێ ئەوەی ورتەیان لە دەم بێتەوە بێ بەچواردەوری تەرمەكەدا وەستابوون و كپ و بێدەنگ لە پرسەدا بوون ، بێئومێدی و خەفەتیان لە یەكدی دەشاردەوە ، یادگارەكانی سەردەمی منالی و ... شادی ون و لەدەستچووی ئەو خۆشەویستی و میهرەی كە هەمیشە وەكو كانی لە دلی دایكیانا هەلدەقولا .. بێ ئەوەی داوای پاداشت و چاكەیان لێ بكاتەوە .. خۆشەویستی یەكی ئەوەندە زۆرو فرە بوو سێبەری دەگەیشتە هەر شەشیان ـ تەنانەت گەر لە دووری هەزاران میلیشەوە بوو بن : هەر ئەو میهرە دایپۆشیبوون .. وەك هەر شتێكی خۆرسك بەردەوام هەستیان بەو میهرو سۆزە كردووە .. هەر ئەو هەستەش ورەو هێزی پێ بەخشیبوون .. وای لێكردوون ئازایانەو بەدلێكی پڕبڕواوە بەسەر هەموو هەورازەكانی ژیاندا سەركەون . ئەمێستاكە دایكیان لاشەیەكی ساردو سڕە .. ئیتر ناتوانێ هیچیانی خۆش بوێ .. ئەوەتانێ وەك غەریب و نەناسیاوێكی بێباك ڕاكشاوە .

ئەمێستاكە هەر یەك لە كوڕەكانی پیرەژن هەست بە ترس و تەنیایی دەكا . كت ومت لەوە دەچوو چرایەكی بەر پەنجەرەی مالێكی كۆنینە بێ و لە گوندێكی زۆر تاریك و نوتەكدا ! هەر بسووتێ و نەكوژێتەوە .. شەوی تاری ڕۆشن كردبێتەوە .. نەك هەر شەوو بەس .. بەلكو پەپوولەو زیندەوەرە باڵگرتووەكانیش .. شیناوەردو سەوزایی گیاوگوڵ .. پورەی میشوولەی ناو هەوای شەو ـ گشت جیهانی دەوروبەری مالی كۆنینەی سەردەمی منالیان .. ئەو مالەی تیایدا لە دایك بوون و جێیان هێشت .. هەمیشە دەرگاكانی ئەو مالە لەسەر پشت بوون تا بلوێ بۆ ئەوانەی مالئاواییان لێكرد .. بگەڕێنەوە ، بەلام نەخێر .. هیچ كامێكیان نەگەڕایەوە .. ئەمێستاكەش هەر

دەڵێی کتوپڕ چرای بەر پەنجەرەکە کوژایەوەو تاریک داهات .. راستیش بوو بە خەون و خەیاڵ .

هەرچەندە پیرەژن لاشەیەکی بێگیانەو لەو ناوە کەوتووە ، بەڵام ئەو زۆر زووتر بە مێردەکەی راگەیاند بوو قەشەیەك بدۆزێتەوە تا کفن و دفنێکی پوختەی بۆ بکاو بەو مەرجەی تا تەواو تەلقینیشی نەدا تەرمەکەی لە ماڵ نەبەنە دەرەوە .. پاشان ڕووەو گۆڕستانەکە هەڵیبگرن و ئیتر بۆ ناشتنەکەی پێویست ناکا هیچ قەشەیەکی دیکە بانك بکرێ .. ناشبێ کوڕەکانی خۆیان سەغڵەت بکەن و خەم دایانبگرێ .. بەڵکو لە باتی ئەوە دەتوانن تا گۆڕستانەکە لە دوای تەرمەکەیەوە بڕۆن . ئەوەندە لەمێژیش نی‌یە پیرەژن باوەڕی بە خوا هێناوە .. بۆیە حەزی دەکرد مێردەکەی ـ ئەو مێردەی بەدرێژایی تەمەن پیرەژن هەر خۆشی‌ویستووە ـ حەزی دەکرد پتر وەختی تەلقین و نوێژلەسەرکردنەکە خەمی بۆ بخواو بتلێتەوە .. لەو کاتەی تیشکی مۆمەکان دەڕژێتە سەر ڕووە مردووەکەی ی و ڕۆشنی دەکاتەوە .. نەیدەویست بێ‌هیچ شکۆمەندی و یادێك ماڵئاوایی لە ژیان بکا . دوای گەیشتنی کوڕەکانی .. پیرەمێرد بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەدوای قەشەیەکدا گەڕاو سووڕا .. پاشان لەکۆتاییدا دەمەو ئێوارە بوو کە پیرەمێردێکی کورتەبنەی هێنایەوە ماڵ ـ وەکو خۆی پیرو کورتەبنە ـ جلەکانی بەریشی مولکیانە بوون .. قەشەیەکی (ڕووەکی) خۆر بوو .. بۆیە سوور دەچووە .. کە دەیڕوانی نیگای چاوە گەشەکانی تیژو خێراو پڕمەبەست بوون .. بەخۆی ی و بە جانتایەکی قایشی ئەفسەرانەوە هاتە ژوورێ .. جانتاکە بەسەر نێکی‌یەوە تەکەتەکی بوو .. هەموو کەل و پەل و پێوستی‌یەکی کەلیسای خستبووە ناو جانتاکەی ـ بخوور .. چەند مۆمێکی باریك و درێژ .. کتێبێك .. عەبا .. لەگەڵ بخوردانێکی چکۆلانەی زریزەدار . کابرای قەشە زۆر بەپەلە مۆمەکانی بەچواردەوری تەرمەکەدا بڵاو کردەوەو هەمووشیانی داگیرساند ، بخوورەکانیشی خستنە ناو بخوردانەکەو ڕێکی‌خستن .. کە بەدەوری تەرمەکەشدا دەخولایەوە .. کتوپڕو بێ‌ئەوەی کەسیان ئاگادار بێ دەیڕوانی‌یە کتێبەکەو لەژێر لێوەوە دەیچرپاند . هەموو کوڕەکانیش کە لەو ژوورەدا بوون بەیەکەوە هەستانەوە سەرپێ ، سەغڵەت و بێ‌ئارام ، تۆزێکیش شەرم دایگرتبوون . بێ‌جووڵەو یەك لەدوای یەك بەرامبەری تەرمەکە وەستا بوون .. چاویان بڕی‌بووە زەوی‌یەکە . لەپێشی پیشەوەشدا .. پیرەقەشە نوێژی دەکردو خێراخێرا لەژێر لێوەوە کەوتبووە منەمن و هەروەکو بڵێی گاڵتە بکاو بەڕاستی نەبێ ، بەردەوامیش لەژێر چاوە گچکەو زیرەکەکانی‌یەوە نیگای دەبڕی‌یە کوڕەکانی پیرەژن کە وەك پاسەوان بەدیار تەرمەکەیەوە وەستابوون . لەلایەکەوە تۆزێ لێیان دەترساو .. لەلایەکی دیکەشەوە ڕێزیانی دەگرت .. هەڵبەتە حەزی نەدەکرد لەگەڵیانا بکەوێتە گفتوگۆو بگرە ئەوەندە پەرۆشیش نەبوو بە دڵگەرمی‌یەوە لە بنیاتنانی سۆشیالیزم بدوێ . وەلێ کوڕەکانی کپ و بێ‌دەنگ بوون .. هیچ کامیان .. بگرە مێردی پیرەژنەکەش نوێژی بۆ نەکرد .. ئەوان هەرگیز خۆیان بۆ بۆنەیەکی ئاینی و پیرۆز ئامادە نەکردووە .. تەنها ئەوەیە چاودێری تەرمەکەی دەکەن .. ئێشك‌گرن و بەس .

دوای ئەوەی قەشە فەرمانەکەی خۆی بەدەست و بردی بەجێ‌هێنا ، خێراتر کەل‌وپەل و پێوستی‌یەکانی کۆ کردەوە ، پاشان مۆمەکانی کوژاندنەوە کە تا ئەو حەڵە لە نزیك تەرمەکەوە هەردەسووتان .. دوایی هەموو شتەکانی پێچایەوەو خستنی‌یە ناو جانتاکەی گۆڕین . باوکی کوڕەکانیش هەندێ پارەی خستە دەستی ، قەشەش خێراو چوست‌وچالاکانە بەبەینی هەر شەش پیاوەکانا ڕێگەیەکی بۆ خۆی کردەوە .. هیچ کامێکیان چاوی لە قەشەکە هەڵنەبڕی ، ئەویش بەترس و دوودڵی‌یەوە لەودیو دەرگاکەوە ون بوو . پڕبەدڵ حەزی دەکرد بۆ نانی‌شێوان بمێنێتەوەو باسی جەنگ و شۆڕشیان لەگەڵدا بکاو دەتوانێ بەدرێژایی ئەو شەوەو بەوپەڕی خۆشی‌یەوە لەگەڵ نوێنەرانی ئەم جیهانە تازەیە بدوێ کە بەدزییەوە پێی سەرسام بوو .. بەڵام هەرگیز نەیدەتوانی و نەیدەوێرا بچێتە ناوی .. لە ساتانی تەنیایی و خەڵوەتدا هەمیشە خەونی بەوەوە دەدی ڕۆژێ لە ڕۆژان پاڵەوانانە کارێکی مەزن ئەنجام بدا .. تا بەگوڕێکەوە بچێتە ناو داهاتوویەکی ڕۆشن و تێکەڵ بە تاقم و دەستەی ئەم تازەیە بێ ؛ هەر بەم نیازەوە داوای لە یەکێ لە

فرۆکەخانەکان کرد وەك سەرکێشێك قبوڵیّ بکەن‌و ئامادەشە لە تلقی ئاسمانەوەو بیّ‌ئەوەی ڕووپۆشی ئۆکسجینەکەش لەسەر بنیّ بە پەڕەشووتیك خۆی هەڵبدا بەلام چدەکەی کە هیچ وەلامێکیان نەدایەوە .

ئەو ئێوارەیە باوکەکە شەش پێخەفی لە ژوورەکەی دیکە داخست‌و لەتەنیشت خۆیەوە جێگەیەکیشی بۆ کچە چکۆلانەکە کردەوەو نواندی .. هەر لەو شوێنەی ژنە ڕەحمەتی‌یەکەی بۆ ماوەی چل ساڵی ڕەبەق لەتەکیا دەنووست . هەر هەمان ژوورە فراوانەکەی جارانەو لەباتی پێخەف تەرمەکەی ئەوی تیایە ؛ کوڕەکانیشی چوونە ژوورەکەی تر . باوکە لەناو دەرگاکە وەستا تا منالەکانی جلیان داکەندو خزانە ناو جێگا ، پاشان ئەویش دەرگاکەی داخست‌و گلۆپەکانیشی کوژاندەوە .. ئینجا گەڕایەوە ناو پێخەفەکەی تا لەتەنیشت کوڕەزاکەی خۆیەوە بخەویّ . کوڕەزاکەی لەسەرئەو پێخەفە پان‌و بەرینەدا بەتەنیا خەوی لیّ‌کەوتبوو .. لەژێر بەتانیەکەدا خۆی شارد بووەو سەریشی داپۆشیبوو .

پیرەمێرد لەژێر ڕۆشنایی شەوداو بۆ ساتەوەختیّ بەدیار تەرمی ژنەکەیەوە وەستا ، بەفری سەر جادەکانیش ڕووناکی کەم‌و پەرت‌و بلاوی ئاسمانی کۆ دەکردەوەو لە پەنجەرەکەوە دەڕژایە ژوورەوەو تاریکی ئەو ناوەی ڕاودەنا . پیرەمێرد پتر لە تەرمی سەرواڵا نزیك کەوتەوە ، هەردوو دەستی ژنەکەی خۆی ماچ کرد .. نێوچەوانی .. دەم‌ولێوی‌و ئەوسا پیّ‌ی‌وت : «دە ئیتر ئارام بەو .. ڕاکشیّ .» .. پاشان بەهێمنی‌یەوە لەتەك کوڕەزاکەی ڕاکشاو چاوەکانی داخست .. بەو هیوایەی هیچی لە دڵدا نەمێنیّ‌و هەموو شتێکی بیربچێتەوە . تۆزیّ خەو بردی‌یەوە .. بەلام کت‌وپڕ وەئاگا هاتەوە . لەژێر درزی دەرگای ژوورەکەی دیکەوە ڕووناکی دەڕژایە دەرەوە : کوڕەکانی گلۆپەکانیان نەکوژاندبووەو ژوورەکە لە هات‌و هاوارو مشت‌و مڕو پێکەنینی ئەوان دەنگی دەدایەوە . لەو هات‌و هاوارە کچە چکۆلانە کەش ڕاچەنی .. ڕەنگە ئەویش نەتوانیّ بنویّ ، بەلام ئەوەبوو نەیدەوێرا لەژێر بەتانیەکەوە سەر بێنێتەدەر .. چونکە پڕ بەدڵ لە شەوو پیرەژنە مردووەکە دەترسا .

کوڕە هەرەگەورەکەی بەکوڕو زەوقێکەوە دەدواو باسی پانکەی مێتاڵ‌و ناوبەتاڵی فرۆکەی بۆ دەکردن .. بەدەنگی‌یەوە دیار بوو کە پایەبەرزو لەخۆڕازی‌یە .. هەستت دەکرد : ددانەکانی ساغن‌و گەرووشی سوورو قووڵە . دوو دەریاوانەکەش جۆرەها یادو سەرکێشی خۆیان دەگێڕایەوە کە لە بەندەری وڵاتانی دونیا ڕوو بەڕوویان بوونەتەوە .. پاشانیش بەوە پێکەنین کە باوکیان هەمان کۆنە بەتانی داونەتیّ کە بەمناڵی بەسەر خۆیان دا دەدا . هەردوو لای بەتانیەکان بە پارچە خامی سپی نەخشێنرابوون‌و لەسەر لایەکیان نوسرا بوو [سەر]و ئەوی‌دیکەشیان [پیّ] .. بۆ ئەوەی بەهەڵە بەسەر خۆیانی دانەدەن‌و ئەو ڕۆخە چڵکن‌و ئارەقاوی‌یەی لای پیّ‌یان بەر دەم‌وچاویان نەکەویّ . پاشان یەکیّ لە دەریاوانەکان ئەکتەرەکەی گرت‌و لە بنە خۆی ناو بەسەر زەوی‌یەکەدا تلیان بەیەکدی دەدا ـ هەر وەکو سەردەمی منالیان ـ ئەو سەردەمەی هەموو بەیەکەوە دەژیان . بچوکترین برایان هانی‌دەدان‌و بەڵێنیشی‌دا کە تەنها بەدەستی‌چەپ ئامادەیە لەگەڵ هەردووکیان بکەوێتە زۆرانبازی . هیچ گومان لەوەدا نەبوو کە ئەو شەش برایە چەندیان یەکدی خۆش‌ویستووەو چەندیش بەم دیدەنی‌یە خۆشحالن . ئەوان سالانێکی دوورودرێژە بەم چەشنە کۆ نەبوونەتەوە ، هەروەها کەسیش نازانیّ کەی لە داهاتوودا جارێکی‌تر کۆ دەبنەوە .. ڕەنگە تەنها بۆ پرسەی باوکیان ئەبەم چەشنە کۆ ببنەوە ؟ کردیان بە ئەوپەڕی فەرتەنەو زرمەزلیّ ، ئەو دوو برایەی لەسەر زەوی‌یەکە کەوتبوون‌و یەکدیان دەگەوزاند کت‌وپڕ بەسەر کورسی‌یەکدا بەربوونەوە .. لە ترسانا بۆ ساتەوەختیّ ئارام بوونەوە .. بەلام دوایی کە بیریان هاتەوە دایکیان مردووەو دونیاش کپ‌و خامۆشە .. کەوتنەوە شەڕو زۆرانبازی . پاش تۆزێکی‌تر برا گەورەکەیان داوای لە ئەکتەرەکە کرد لەسەرەخۆ گۆرانی‌یەکیان بۆ بلیّ ـ هیچ نەبیّ .. دەبیّ چەند گۆرانی‌یەکی خۆش لە ـ مۆسکۆ ـ فێر بووبیّ .. بەلام ئەکتەرەکە وتی هەروا زەحمەتە .. جگە لەوەی بیّ وشەو دانانی خۆیشی ناسازیّ . پاشان وتی : «شتێکم بەسەردا دەن ..» ئەوانیش سەرپۆشێکیان بەسەر دەم‌وچاوی‌دادا .. ئیتر کە شەرم‌و عەیبەی لا نەما لەژێرەوە کەوتە گۆرانی‌چڕین . لەو کاتەی ئەو

گـۆرانی دەوت .. بچوکتـرینیان حـاڵێکی وای کرد یـەکێ لە براکانی لە پێخەفەکـەیەوە بکـەوێتە خـواریێو بەسـەر برای سێیەمدا بەرببێتەوە کە لەسەر زەوییەکە ڕاکشـابوو . هـەر یەکەی لە ئاستی خۆیەوە کەوتە قاقاو تریقەی پێکەنینو داوایان لە برا چکۆلانەکەیان دەکرد ئەگەر پیاوە تەنها بە دەستی چەپ برا کەوتووەکەی هەڵبگرێتـەوەو بیخاتـەوە ناو پێخـەفەکـەی خـۆی . ئەویش بـەهێمنیو لەسـەرخـۆ وەڵامێکی دانـەوە ، دوانیان وەها بەدەنگ پێکەنین کچە چکۆلانەکە سـەری لەژێر بەتانیەکەوە هێنایەدەرو پڕ بەو ژوورە هاواری کرد :

**«باپیرە .. باپیرە .. تۆ نوستوویت ؟»**

پیرەمێردیش بەشەرمەوە کۆکیو وتی : «نا .. نەخێر .. من نەنوستووم .. هەر ئاوا ڕاکشاوم .»

کچە فرمێسکەکانی بێڕانەگیراو دایە پرمەی گریـان . پیرەمێرد زۆر بەنەرمی دەستی بەسەروچاوی کچەکەدا هێنا .. دەمو چاوێکی تەڕ .

پیرەمێرد بەچرپەوە لێی پرسی : «ئەوە بۆ دەگری ؟»

کوڕەزاکەشی وتی :

**«من بەداخەوەم بۆ داپیرە .. ئـەوەتانێ ئـەوان دەژینو پێدەکەنن .. کەچی داپیرە بەتەنیا مرد .»**

پیرەمێرد هیچی نەوت . تاوتاویش هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشاو یان ئەوەتا دەکۆکی . کچـە چکۆلانـەکەش وای لێهاتبوو دەترساو هەستایەوە تا چاکتر باپیرە ببینێو دڵنیابێ لەوەی کە نەنوستووە . لە نزیکەوە دیقەتی دایەولە دەموچاوی ورد بۆوە .. پاشان لێی پرسی :

**«بەڵام بۆچی تۆش دەگری ؟ .. خۆ ئەوەتا من ژیر بوومەتەوە .»**

بـاپیـرە دەستێکی بـەسـەری کـوڕەزاکـەیـدا هێنـاو چرپاندی :

«ئەوەتا ... من ناگریم .. تەنها ئەوەیە ئارەقە دەکەم .»

کچە چکۆلانەکە لەتەك سەرینی پیرەمێردەکەولەسەر پێخەفەکە دانیشتو لێی پرسی :

**«لەدوای ئەو هەست بەبێکەسی دەکەی .. ها ؟ »**

پاشان پێیوت : «تو خوا مەگری .. تۆ پیر بوویتو هەر بزانە مردیت .. ئیتر ئەوسا بەهیچ شێوەیەك چیتر ناگریت .»

پیرەمێرد بەهێمنییەوە وەڵامی دایەوە :

«نا .. نەخێر ..»

زۆر کتوپڕ هاتوهاوارو زەنای ژوورەکەی ئەودیو نەماو دونیا کپوخامۆش بۆوە . هـەر زوو بەر لەو کپییـە یەکێ لە کـوڕەکان قسـەیەکی وای کـرد هەمـوویانی بێدەنـگ کرد . یەکێکی دیکەشیان زۆر بەنەرمی ورتەیەکی لە دەم هاتەدەر . پیـرەمێرد دەنگی سێیـەم کوڕی خـۆی ناسییـەوە : کابـرای فیزیائیو باوکی کچە چکۆلانەکە . تا ئەو ساتە نە کەمو نە زۆر دەنگی لێوە نەهات .. وەك براکانی دیکەی قسەی نەدەکـردو پێنـەدەکەنی . وای کـرد بـراکـانیشی کپو بێدەنـگ بن .. ئەوانیش چیتر متقیان نەکردو فزەیان لێوە نەهات .

دوای ساتەوەختێ دەرگـای ژووری خەوتن کـرایەوەو کوڕی سێیەم هاتە دەرێ .. ڕێـكوپێك جلەکـانی لەبەر کـرد بـوون . ڕووەو ژوورەکەی دیکـە ملینـاو لە تەرمـەکە نـزیك کەوتەوەو بەسەر ڕووە لێڵوتاریکەکەی دایکیدا نووشتایەوە .. ئەو ڕووەی ئێستا بۆ هیچ کەسێ هەستو سۆزی لێ نەدەباری .

شەوی خامۆش هەمـوو دونیای گـرتبووە بـاوەش . نە ئوتمبێلو نە پیادە بەسەر جادەکانەوە نەما بوون . هـەر پێنج براکانی دیکەش لەو ژوورە مات ببوونو جووڵەیان نەدەکرد . پیـرەمێـردو کـوڕەزاکـەی لە کـوڕو ـ هـەم بـاوکـە ـ ورد دەبـوونەوە .. وا بـەدیقەت سـەیریـان دەکرد هـەناسـەیان نەدەدا .

لەنـاکاو کـوڕی سێیەم خـۆی قیت کـردەوە ، بـەنـاو تەمیتاریکیدا هەردوو باسکی درێژ کـردو تونـد بە هـەر دوو دەست لایەکی تەرمەکەی گرت .. بەڵام بەچاکی دەستی لێ گیر نەبوو .. تۆزێ لەسەر مێزەکە جوولاندیو بەلایەکدا ڕایکێشا .. لەپڕ دەستی ترازاو بەسەر زەوییەکەدا کەوتەخوارێ . وەك هەر شتێکی بێگیان سەری بەر تەختەداری زەوی ژوورەکە کەوت .. بەڵام کوڕە ئۆفێکی نەکردو دەنگی لێوە نەهات ـ تەنها کچەکەی پڕبەدەم قیژاندی .

هەر پێنج براکەشی بەهەڵەداوانو بەجلی شەوەوە هاتنە دەرێو هەڵیانگرتەوەو بردیانەوە ژوورەکەی خۆیان تـا هۆشی

ـیتەوە بەرو ئارام بێتەوە . پاش ماوەیەکی زۆر کورت .. دوای
ئەوەی هۆشی هاتەوەبەر .. هەموو کوڕەکانی دیکەش خێرا
حیێ لەبەرکرد .. هەرچەندە سەعات نەگەیشتبووە دووی
پش نیوەشەو . یەك لە دوای یەك و بەدزییەوە بە ژوورەکانا
ـەمتن و دەچوون .. بەناو حەوشەکەو لەژێر تاریکی شەودا
یسەیان دەکرد .. ئەو شەوەی ماڵەکەی گرتبووە باوەش : ئەو
ملەی سەردەمی منالیان تیا بەسەر برد .. ئا لەوێدا گریان ..
قسەی بێسەرو بەریان کرد .. کەوتبوونە ناڵەناڵ و
ـمکروزانەوە .. هەروەك بڵێی دایکە لەسەر سەری هەر
یەکێکیان وەستا بێ .. گوێی شل مردبێ و داخ بۆئەوە بخوا کە
مرووەو وای کرد منالەکانی بەحەسرەتەوە بتلێنەوە : ئەگەر
ـیتو نیایە بۆ هەتاهەتایە لە دونیا دەمایەوە ، تا کەس سەغلەت و
ـکیر نەکا .. لەش و دڵی کوڕەکانی دانەڕزێنێ .. ئەو دڵ و
ـەشلنەی ئەو کوڕو ژیانی پی بەخشیون . بەڵام دایکە ئەو هێزە
ـە کوێ بینێ تا زۆر بژی .
بۆ سەر لە بەیانی دواتر هەر شەش کوڕەکەی تەرمی
ـ یکیان خستە سەر شان و ڕووەو گۆڕستانەکە ملیان نا تا
بینێژن ، لەو کاتەی پیرەمێرد کوڕەزاکەی لە باوەش کردو کەوتە
ـوای کوڕەکانی .. ئا لەو کاتەدا زۆر بەتاسەوە بوو بۆ پیرەژن و
ـمتلایەوە .. لە ناخەوەش ڕازی و سەربلند بوو کە ڕۆژێ لە
ڕۆژان ئەم شەش پیاوە بەهێزە ئەمیش ـ وەك ئەم پیرەژنە ـ
ـەنێژن .. شەش پیاوی بەهێز .. شەش پیاوی ساغ .

## پلاتۆنۆڤ کێیە ؟

ئەندرێ پلاتۆنۆڤ یەکێك بووە لەوانەی لە شەڕی ناوخۆییدا بەشدار بووە .. لە ساڵی (1927)دا لەژێر ناوی (The Epifan Sluices) دا یەکەم کۆمەڵە چیرۆکی بڵاو کردەوەو هەر زوو خەڵکی قۆزتیانەوەو سەرجەم پەسند کران . بەڵام دوایی لە هەندێ چیرۆك و نووسینەکانی دیکەیدا بەئاشکرا هێرشی بردە سەر (بیرۆقراتیەتی) نیو وڵات و دژی ئەم دیاردەیە وەستا .. ئەم جۆرە نووسینە پڕ هێرشانەی پلاتۆنۆڤ بوونە مایەی بێزاری و توڕەیی دەستەلاتدارو فەرمانڕەواکان .. بۆیە هەر دوای ئەوە بەدرێژایی ساڵانێکی زۆر وای لە خۆی کرد کە بەدەگمەن چیرۆکەکانی بڵاو بکرێنەوە .

زۆربەی چیرۆکەکانی پلاتۆنۆڤ کارەسات و ڕووداوی ڕۆژانەن و لە دەروونی کەسانێکی ڕەمەکی و چینی ژێرەوە هەوێنی ئەو چیرۆکانەی گرتۆتەوە .. ژیانی ئەم چەشنە مرۆڤە سادانە دەخاتە سەر کاغەز تا تێیان بگەین و بزانین چۆن دەژین .. فۆرمی چیرۆکەکانیشی چڕوپڕە .

مەبەستی سەرەکی چیرۆکەکانیشی لایەن و بەهای ئەخلاقی دەگرنە خۆیان .

کوڕی سێیەم ـ یان ـ سێیەم کوڕ یەکێکە لەو چیرۆکانەی لە ساڵی (1937)دا نوسیویەتی و هەروەها چیرۆکنووسی ئەمریکیش «ئێرنست هێمنگوای» زۆر ستایشی ئەم چیرۆکەی کردووەو بە دڵی بووە چونکە زۆر وەستایانە شێوەیەکی (ڕیالیزمی سایکۆلۆجی) پەیڕەو کردووە .. یانێ زۆر ڕاستگۆیانەو زۆریش هونەرمەندانە ناخ و دەروونی پاڵەوانەکانی خستۆتە ڕوو .. ئەم چیرۆکە نمونەیەکی سەرکەوتووی هونەری ڕەنگینی پلاتۆنۆڤ ـ ە .



### لەم کتێبە وەرگیراوە :ـ

The Penguin Book of Russian Short Stories

Edited by : — David Richards

چاپی یەکەم (1981)

لە بریتانیا کۆ کراوەتەوەو چاپکراوە .

لاپەڕە (280) هەتا (287)

The Third Son

Platonov



وەرگێڕان

# سروود بۆ بلبلێك ..

**Ode to a nightingale**
**by**
**John keats**

هەڵبەستی شاعیری ڕۆمانتیکی ئینگلیز
جۆن کیتس
کۆڕینی لە ئینگلیزی یەوە لەگەڵ شی کردنەوەو
پێشکێش کردنی : عومەر دزەیی

## 1 — کورتەیەکی ژیانی کیتس

جۆن کیتس لە ساڵی 1795 دا لە شـاری لەندەن لە دایـك بووە . باوکی مەیتەر بووەو هیچ کەسێك لە خێزانەکەی ، کەم و زۆر ، پەیوەندیان بە شیعرو ئەدەبەوە نەبووە . جـۆن هێشتا منداڵ دەبێ کە دایکی دەمـرێ ، خوێشی مـاوەیەك پـزیشکی دەخوێنێ بەڵام حەزی لەو زانستە نەدەکردو مەراقی کەوتـە سـەر خوێنـدنەوەی میتـۆلۆژیـای گـریکی و ڕۆمـانی و ژیـانی تـەمـەنـەکـانی نـاوەنـدی Middle Ages . لە ئـەنجامی زۆر خـوێندنـەوەی شاکـارەکانی شـەکسپیرو سپێنسـەر ، جۆن وەستاییەکی بێ هاوتای پەیدا کرد لە داڕشتنی وشەو زاراوی جوان جوان و ڕازاو . بەم جۆرە دەستی دایـە شیعر نـوسین و زۆربەی هەرەزۆری هەموو شیعرە باشەکانی لە ماوەی سێ ، چووار ساڵی دوایی ژیانیدا نـووسی ، واتا لە تـەمەنی نێـوان 20 — 25 ساڵاندا . لەبەر ئەوە جۆن کیتس ، بـەبێ سێ و دوو لێکردن ، بە گەورەترین شاعیری ئینگلیز دادەندرێ کە توانیبێ بەم لاوی یە ، لەو ماوە کورتەدا ، ئەو هەموو هەڵبەستە ناسکانە دابنێ کە پایـەی ئەدەبییـان شان بـە شانی شـاعیرە هـەرە گەورەکانی ئینگلیز بڕوات .

نەخۆشی بەرهەنگ ، کە ئەوسا ترسناك و کوشندە بوو ، لە دایکەوە پەڕیبـووە ناو ئـەو خێزانـەو جۆنی بـەستەزمـانیشی گرتبۆوە . ئەوە بوو کـە لە دەورووبەری 1819 دا ئـەو دەردەی گـرت . ڕۆژگار ، نـەك هەر ئـەو دەردە ، بەڵکو چەنـدەهـا کـارەساتی دیکـەشی ـ کـە دواتـرێ بـاسیـان دەکـەم ـ بـۆ هەڵگرتبوو . لە پایزی 1820 دکتۆرەکانی ئامۆژگارییان کرد کـە ئینگلتەرەی سارد بەجێ بێڵێ بۆ وڵاتێکی گەرمتر . ئەوە بوو کە

چوو بۆ ئیتالیا بەلام ئەوەندەی پێ نەچوو بێچارە لە 23 / 2 / 1821 لە رۆما ، گیانی سپاردو تەمەنی تازە خۆی لە 25 سالان دەدا .

## 2 – کیتس و رۆمانتیزم

جۆن خاوەنی هەستێکی ئێجگار ناسك و تەنك بووە . حەزێکی بێ پایانی لە ژیانی سەردەمە بەسەرچووەکانی مێژوو کردوە . بۆیە پیاو کە شیعرەکانی دەخوێنێتەوە ، هەر دەڵێی شاعیر وادەستی گرتوەو بە ناو کون و قوژبن و پێچ و پەنای مێژوودا دەیگێڕی . رۆمانە ئەنتیکەکان ، سەردەمی بە دیارکەوتنی خریستیانەتی و تەمەنە تاریکەکان و چەرخەکانی ناوەندی ، کەم و زۆر ، خۆیان لە زۆربەی شیعرەکانی دا دەنوێنن . وەك هەموو شاعیرە رۆمانتیکەکان ، جۆن ژیانی سەردەمی خۆی ناکاتە بابەتی شیعرەکانی چوونکە ئەمانە ، بەگشتی ، رابوردوو پەرست و دوژمنی ریالیزم « واقع » بوون .

جوانی ، بۆ کیتس ، هەموو شتێك بوو ، بەراستی هەموو شتێك بوو . کە شتێکی جوانی بەدی دەکرد ، ساهی شۆخێك ، دیمەنێك ، موزیکەیەك ، بلبلێك یان هی هەر شتێکی تربا ، هەر پێنج هەستەکانی بە جاری گوێقولاغ دەبوون ، مووچرکێك ، لە تەوقی سەریەوە تا بنی پێی ، دای دەگرت . بەراستی جوانی نەبوو بە سەریدا تێپەڕبێ .

جۆن کیتس لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە شیعرنووسین پێویستە هەر بە تەنها هەستی دەروون بەرامبەر بە جوانی و سروشت دەربڕێ ؛ شاعیر نابێ لە بابەت بگەڕێ بۆ شیعرەکەی ؛ بابەتی شیعر ئەوەتا لەناو دەروونی خودی مرۆڤ دایە . شیعر بە هیچ جۆرێك نابێ بکرێتە پرد تا بە هۆیەوە بگەیتە ئامانجێکی تر . واتا شیعر نابێ خزمەتی هیچ ئامانجێك ، بیرێك یان فیلۆسۆفیایەك بکا جگە لە ئامانجە سەرەکی و تاکەکەی خۆی کە « دەربڕینی هەست و خوستی هەناوە بەرامبەر بە سروشت و جوانی » .

بیرو ڕوانگەی کیتس وادەگەیێنێ کە تەنها سروشت و جوانی ڕاستن و حەفت و هەشتیان لە سەردا ناکرێ ؛ کە هەموو بیرێکی فیلۆسۆفێك و هەموو بزوتنەوەیێکی کۆمەلایەتی ـ کە لەو بیرە فیلۆسۆفیکانەوە هەلدەقولێن ـ پووچن یان لەوانەیە چەوتییان تێدابێ . خۆ ئەگەر ڕاستیش بن ئەوە قەت ناشێ ئەم ڕاستی‌یە تاسەر بێ ، ڕۆژێك هەر دێ کە تێیدا بە هەڵە دەربچن . جا لەبەر ئەو بیرو بینینەی خۆی ، جۆن کیتس ، دانوولەی ، بە هیچ جۆرێ ، لە گەل کەلە شاعیرە رۆمانتیکەکانی هاوچەرخی وەك :

وۆردسوۆرث ـ Wordsworth ، کۆلریج ـ Coleridge ، بایرۆن ـ Byron و شێلی ـ Shelly دا نەدەکولا ، کە گوایا لە فرمانی ڕاستەقینەی شیعردا لایان دابوو . یەکەمیان کەوتبووە ناو گێژەنی چاکردنی باری کۆمەلایەتی دووەم ، دەستی دابووە میتافیزیکس ؛ بایرۆن هەر خەریکی خۆپەرستن و بە خۆداهەلگوتن ؛ شێلیش خۆی هاویشتبوە ناو دنیای شۆڕش و بیرو باوەڕی ئازادی و یەکسانی و دیموکراسی کە ڕێ و پێکیان دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی شۆڕشی فەرەنسەیی « 1789 » .

لای کیتس ، مخابن بوو شیعر بکرێتە بارکێشی ئەو جۆرە بیرو باوەڕانە . فرمانی ڕاستەقینەی شیعر ئەوەیە کە بچێتە ناواخنی جوانی و بیخولقێنێ ؛ ئەمەیش ، بەلای ئەوەوە ، بە ڕێگەی هێنانەوە بەرچاوو ڕامانەوە imagination and contemplation دێتە دی .

لە هەلبەستەکانی کیتس دا ، سەرەڕای گیانێکی گەش، لێرەو لەوێ پیاو هەست بە خەفەتباری و دڵتەنگی دەکات . ئەمەش ڕەنگە هەر دەنگدانەوەی ژیانە پڕ لە پەژارەو مەینەت و غەمبارەکەی خۆی بێ .

هەتا مرد ، کیتس هەر لە لایە تاریکەکەی ژیاندا ژیا : هەر لە منداڵی یەوە دایك و بابی مردن ؛ برایێکی لە تەمەنی 17 سالاندا بە بەرهەنگ چوو ؛ برایێکی دیکەی سەری خۆی هەلگرت و کۆچی کرد بۆ ئەمەریکا ئیتر یەکترییان نەدیتەوە ؛ ئەو کچە شۆخەی جۆن ئەویندار ی بیوو وە ببووە هەوێنی زۆربەی شیعرە خۆشەکانی ، ئەمی نەدەویست . هەمیشە بێ پارە ، بە لەش لاوازو نەساخ ، هەتا بە نەخۆشی بەرهەنگ سەری نایەوە .

جا لێرەدا پیاو دەتوانێ بلێ کە هەموو مەرجەکانی رۆمانسیەت (پەرستنی سروشت و جوانی و رابوردوو) ، لە قالبێکی خەماویدا ، لە جۆن کیتس دا کۆ ببوونەوە .

**3 – کیتس و سروود**

گوتمان شیعرە هەرە باشەکانی جۆن کیتس لەو سێ ، چوار ساڵەی دوایی ژیانیدا نووسراون . سەرتۆپی ئەمانەش هەمووی سروودەکانیەتی کە گشتیانی لە ساڵی 1819 دا داناوە .

من لێرەدا وشەی « سروود » م بەکار هێناوە ، بەلام « گۆرانی » ، « ستران » و « بەند » یش دەتوانن هەمان واتا بدەنەوە . خۆی وشە ئینگلیزیەکەی « ئۆد ـ ode » ە کە لە بنەڕەتدا گریکی‌یەو بەواتای « پارچە هەڵبەستێك کە بۆ بۆنەیێکی تایبەتیەوە داندراوە » دێ .

ئۆد ، بەگشتی ، بریتی‌یە لە چەند « stanza » یەك واتا « کەرت » یان « پارچە » کە باسی بەشێك لە بابەتی هەڵبەستەکە دەکا . ژمارەی دێڕەکان دەبێ لە هەموو « ستانزا » کاندا یەك بێ ، هەرچی دانانی سەرواکەیە ، ئەوە دەمێنێتەوە بۆ زەوق و وەستایی شاعیر . لە دوای هەر ستانزاییێك پشوودانێك هەیە بەر لەوەی بچیتە ناو بەشێکی تری بابەتی شیعرەکەوە .

« سروود بۆ بلبلێك » بریتی‌یە لە هەشت ستانزا ؛ هەر ستانزاییێك لە دە دێڕ . سەروادانانی ئەو دە دێڕانە بەم جۆرەیە : چواری یەکەمیان لەسەر شێوازی « سۆنێت » ی شەکسپیرانە واتا « abab » و شەشەکەی دواییشیان لەسەر شێوازی « سۆنێت » ی پێترارکانە[1] واتا « cde cde » داندراون .

کەواتە دەتوانین بڵێین کە « ئۆد » ەکانی کیتس لەسەر بناغەی « سۆنێت » دا داڕێژراون . بەلام وادیارە دڵی کیتس بە سۆنێتەکانی شەکسپیرو پێترارکاوە دانەکەوتووە ، بۆیەکا هەستاوە تێکی هەڵکێشاون و بەم جۆرە نموونەیێکی نوێی « ئۆد » ی لێوە دروست کردوە .

بەراستی ، جۆن کیتس ، لە ئۆدنووسیندا لێزانێکی ناقۆلابووە . زۆر هونەرمەندانە توانیویە رۆمانتیزم و کلاسیك لێکدا بتوێنێتەوە . رۆبەرت بریجز Robert Bridges بە خۆرایی‌ی نەگوتووە « جۆن کیتس ، ئەگەر بە تەنها ئۆدەکانی بۆ بەجێ‌هێشتباین ، ئەوە بەس بوو بۆ ئەوەی بیگەیێننە ریزی شاعیرە هەرە گەورەکانی ئینگلیز »[2] .

کیتس ، بۆ رازاندنەوەی « ئۆد » ەکانی ، کۆمەڵێك هونەری بەکار هێناوە لەمانە :

« alliteration » واتا پێکچوونی پیتێك یان پتر لە چەند وشەیەکی جۆراوجۆر . ئەمەیش ، بێ گومان ، موزیکاو دەنگدانەوەیێکی دڵگیر دەداتە هەر دێڕە شیعرێك بۆ خۆی . وەك کە لە ستانزا (3) دێڕ (1) دا ـ بە نموونە ـ دەڵێ :

« سەرم هەڵگرم ، ون‌بم ، لەبیرکەم » لێرەدا ، ئەو هەموو « میمە » هارمۆنیێکی خۆش دەدا بەو تاکە دێڕە .

جگە لەوە ، کیتس بۆ موزیکاندنی هەڵبەستەکانی ، تەکنیکی « assonance » یشی بەکار هێناوە کە ئەمەیشیان بریتی‌یە لە پێکچوونی نەك چەند پیتێك لە وشەی جیاجیادا ، بەڵکو پێکچوونی چەند وشەیێك لە رووی موزیکاوە وەك کە لە ستانزا (2) دێڕ (6) دا دەڵێ :

**« پرۆڤانسالی ، ئاڵی کەف بەسەر »**

یان لە ستانزا (8) دێڕ (9) دا :

**« دەنگی مەلووڵی مەل دوور کەوتەوە » .**

**سەروای ناوخۆ Internal rhyme هونەرێکی ترە لەو هونەرانەی کیتس بەکاری هێناون بۆ رازاندنەوەی هۆنراوەکانی . بڕوانە ستانزا (7) دێڕ (9 ، 10) :**

ڕەنگە شۆخێکی بەندی ناو تەلار
تۆی کردبێتە یار تادێ شۆڕەسوار

ئەگەر پیاو سەرنج بداتە دێڕی دووەم ، دەبینێ کە سەروای ناوخۆی وای لێ کردوە وەك کوپلەیەك لە گوێ‌یدا بزرینگێتەوە نەك وەك تاکە دێڕێکی تەپ .

لە پێناوی موزیکاندنی شیعرەکانی ، دەرگای هونەر نەماوە ، کیتس ، لێی نەدابێ . « ئۆنۆماتۆپۆئیا ـ onomatopoeia » یش ، واتا ناونانی شتێك بە دەنگەکەیەوە وەك « گفەی با » ، « خورەی ئاو » ، « شەقەی باڵ » یەکێکە لەو دەرگایانە کە کیتسی هونەرمەند ، بێ منەت ، بە ناوی‌دا چووە وەك کە لە ستانزا (5) دێڕ (9) دا بە جوانی دەری خستوە :

« فنگە فنگی مێش ، گزەی مێشوولە »

**سەرنج** : من لە وەرگێڕدراوە کوردیەکەدا هەندێ نموونەی ئەو

هونەرانەی کیتسم هێناوەتەوە کە مەرج نی یە شاعیر لە هەمان ـستنزاو هەمان دێڕی دەقەکەی خۆیدا بەکاری هێنابێ .

لە دوای پێشکەش کردنی کیتسی شاعیر ، کیتسی ڕۆمانتیك کیتسی سروود نووس ، وابزانم ئێستا کاتی یە بێینە سەر یەکێك ـە گۆرانی یە هەرە خۆشەکانی .

**٤ – سروود بۆ بلبلێك Ode to a nightingale**

**● سەرچاوەکەی :**

لە بەهاری 1819 دا جۆن کیتس میوانی چارلس براون ی ـرـەری دەبێ کە لە هامستیدا لە باکوری لەندەن دا دەژیا . چـارلس براون ، کـارەکەرێکی لا ئیش دەکـرد ناوی « فـانی ـر ون »* بوو . کیژۆڵە تابلێی ناسك و نازدارو دڵتەڕبوو . جۆن ـر بە دڵ ئەویندارى « فانی » دەبێ و جارەها داوای لێ دەکات کە مێردی پێ بکا ، هەرچی فانی یە هەرچەندە کە ڕووی خۆی ـمـاتی و حەزحەزۆکێ ی لە گەڵدا دەکات ، وادیارە بە تەواوی ـۆ نەچوتە جۆنی لات و لەڕ بـۆیە خـوازبێنی یەکـەی شاعـیر ـمخاتە پشت گوێ و هەر دەڵێ ئەمساڵ نا ساڵێکی تر .

بلبلێـك ، هێـلانـەکـەی لەسـەر لکێکی بـەرزی دار هـەلووژەیەکدا کـردبوو کـە دەیڕوانی یـە ماڵەکـەی چارلس براون . بلبلە جوانکیلە هەموو ڕۆژێ پڕ بە زار دەیخوێندو ئەو ـوەی پڕ کردبوو لە موزیکا . لە و دەنگ و ئاوازەدا ، پیاو هەستی بە گیانێکی شادو بەختەوەر دەکرد . ڕۆژێك لە ڕۆژانی مانگی گـولان ، سەرلەبـەیـانی ، کیتس کـورسی یێـك رادەکێشێتـە ـمرەوە ، لەبن دار هەلووژەکە بۆی دادەنیشێ و گوێ بـۆ ئەو ـەنگو ئاوازەی مەلە چکۆلانـەکە شـل دەکات . چـەند تیلمـە کاغەزێکی ناڕێك لە گیرفانی یەوە دەردێنێ و ئەم « سـروود بۆ بلبلێك » ە یان تێدا دەهۆنێتەوە .

ئەگەر ڕاستیت دەوێ ، هەڵبەستەکە ئاوێنەیێکی ڕوونی ژیانە پڕ مەینەت و تاڵەکەی خۆیەتی . کیتس لەو کاتەدا دوچاری ئەوەندە ناخۆشی و دڵ ساردبوونـەوە بوو لە ژیـاندا ـ مـردنی « توم » ی برای بە جوانەمەرگی ، کۆچ کردنی « جورج » ی برای بو ئەمێریکا ، فانی نەیدەویست ، بێ پوول و کارو کاسبی و تـەندروستی یـەکی خراپ ، هێـرشی ڕەخنە گـەران بۆ سـەر شیعرەکانی و قسەی ناشیرینیان ـ بە ئەنـدازەیەك کـە گیان و تـەن و هەستی تـەنکی بابـایێکی وەك جۆن خـۆیانیـان لەبەر ڕانەدەگرت .

لە کاتی دانانی ئەم هەڵبەستە ، کیتس وەك دەڵێن بـە تەواوی چووبووە ژێری ؛ بە ڕاستی ئارەزووی هـەلاتنی لەم دنیایە دەکرد ؛ بە دڵ حەزی دەکرد بە گەڵ ئەو بلبلە بەختیارو دڵشـادە بکەوێ بـۆ جیهانی ئـەو ، دارستانی دوور . ئینجـا لێرەدا ، وەك پێشترێ باسمان کرد ، هێنانە بەرچاو « تخیل ـ imagination » ڕۆڵی خۆی دەنوێنێ بۆ وەدی هێنانی ئەو ئاواتەی کیتس . بە خەیاڵ ، شاعیر فعلاً بۆ تاوێك لەم دنیا دەردەچێ و دەکەوێتە ناو دنیای خەیالات .
دەبا بزانین چۆن :

**● شی کردنەوەی بست بە بست :**

**ستانزا ـ 1 ـ**

چۆن دەروێش لە کاتی زیکر کردندا لەم دنیا دەردەچێ ، « حاڵ » دەیگرێ و دەلەرزێ ، شاعیریش ئـە ئاوای بـەسەر دێ . خـۆی لە بـەرایی دا دەڵێ چـۆن ژەهـر یـان ئـەفیـونی خواردبێ و بەرەو بێهۆشی و مەرگەوە بچێ ئەوهای لێهاتوە . دەڵێ زۆری نەماوە بگەمە ڕوباری « لێتە ـ Lethe » و قومە ئـاوەکە بخۆمەوە .

« لێتە » یان « لێت » لە میتـۆلۆژیای گـریکی دا ڕووبارێکـە ، مردوو یەکەم شت کە لەو دنیادا دەیکات خواردنەوەی فرێك لە ئاوەکەیەتی . ئیتر بەمە ژیانی سەر دنیای پێشووی بە تەواوی لەبیر دەچێتەوە . کیتس بە دڵ و گیان حەزی دەکرد ئەو بلبلە باو لە جێگاکەی دابا . دەڵێ مەلە جوانەکە من بە غیلی بە تۆ نابەم ، بەڵکو خۆشی من لە خۆشی تۆدایە . شاعیر ناوی « پەری داران ـ Dryad » لە بلبلەکە دەنێ دیسان بـە پێی ئەفسـانە ، پـەری دارستان هەبووە کە لەگـەڵ داران دا ژیاوەو لە گـەڵیشیانـدا مردوە . واتا بێ دارستان نەیتوانیوە بـژی . ئەمـەیش دیارە

نموونەیەکە لە ڕۆمانسیەت و حەز لە سروشتکردنی کیتس .

## ستانزا ـ 2 ـ

لێرەدا کیتس بە شوێن ڕێگایەکدا دەگەڕێ کە بتوانێ بە هۆیەوە ئەم دنیایە بەجێ بێڵێ و بە گەڵ بلبل کەوێ . لە پێشاندا بیری بۆ شەراب دەچێ واتا هەوڵی ئەوە دەدا بەڵکو مەستی بتوانێ ئەم دنیایەی لە بیر باتەوە . جا لێرەدا ئەم بیرکردنەوەیەی لە شەراب ڕای دەکێشێ بەرەو بیرکردنەوە لە زۆر شتی تر کە پەیوەندیان بە شەرابەوە هەیە . یەکەم شت لەمانە ناوچەی « پرۆڤانس ـ Provence » ە لە خوارووی فرانسە ، کە لە سەردەمە ئەنتیکەکانەوە بگرە تا ئێستەش ، هەر بە شەرابی چاك نێوبانگی دەرکردوە . کیتس هەر بە شەرابی پرۆڤانساڵی واز ناهێنێ بەڵکو دەیەوێ شەرابەکە خەست ، سارد ، کۆن و لە تاریکایی ژێر زەمیناندا هەڵگیرابێ . ئەمانەش ، بە نۆرەی خۆیان ، شتی تر ڕادەکێشن : کە پیاو ئەم چەشنە شەرابەی دەست کەوێ ، لە وڵاتێکی وەك پرۆڤانسدا بژی ، باشتر نی‌یە بە جارێ بشگەڕێتەوە سەردەمی ڕۆمانە کۆنەکان ! باشتریش نی‌یە بگەڕێتەوە بۆ ڕۆژێکی پیرۆز کە جەژنی « فلۆرا » یە !

« فلۆرا ـ Flora » بە لاتینی واتا گوڵ . لەو ڕۆژەدا ڕۆمانەکان ـ وەك کوردو نەورۆز ـ شایی و زەماوەندیان دەگێڕا . کیتس بەمەش دڵی داناکەوێ ، ئاواتەخوازە ئەو جەژنە لە کۆشی سروشتدا واتا لە لادێ لەگەڵ گوندیاندا ڕاببوێرێ .. ئینجا شاعیر دێتەوە سەر نۆشینی شەرابەکە . وەسفێکی جوانی پەرداخە پڕەکە دەکات . خۆی ڕاستە شەرابی ئاڵی چاك کە تێ دەکرێ ، کەفێکی سپی ی شاش و واش هەڵدێنێ ؛ بە ناو کەفەکەشدا نمنم وردە بلق ، بۆ تاوێکی کورت ، دەپەڕنە سەر لچ و لووتی ئەوەی دەیخواتەوە تا شەرابەکە بەتەواوی لە پەرداخەکەدا دادەمرکێتەوەو ئارام دەگرێ . هەروەها شەرابی خەست لێوی پەرداخەکە ، لە دوای هەر قومێکدا ، سوور هەڵدەگەڕێنێ کە ئەمەشیان نیشانەی چاکی و کۆنەییە . لێرەدا پیاو دەتوانێ ببینێ کە چۆن جۆن کیتس ڕۆمانتیك و ئەنتیکی لێکدا تواندوێتەوە . ئینجا لە دوای سازکردنی ئەو ئەتمۆسفێرە ، شاعیر ئاوات دەخوازێ و دەڵێ ئای کە خۆشە ئەو شەرابە بەکرێ نۆش کەیت و لە گەڵ بلبلدا بدەی لە شەقەی باڵ و بزربیت لە ناو تارمایی نیوە شەودا .

بەڕاستی دیارە شاعیر بە خەیاڵ فیعلەن لەم دنیایە دەرچووە .

## ستانزا ـ 3 ـ

لێرەدا شاعیر دەڵێ سەرم هەڵگرم ، بارکەم و ئەو هەموو خەم و پەژارەیە ، ئەو هەموو پیاو خراپانە و دنیا هیچ و پووچە ـ کە هەمووێ باسی ژیانی خۆیەتی ـ لە پاش خۆمدا بەجێ بێڵم . جا لە پاشاندا باسێکی وردی لاوی و نەخۆشی و مردن دەکا کە گوایا لەمەیشدا مەبەسی برا جوانەمەرگەکەی خۆیەتی .

## ستانزا ـ 4 ـ

لەم بەشە هەڵبەستەدا شاعیر ، لەپڕ ، دەست لەو ڕێگایە ـ ڕێگای مەستی ـ بەردەدا کە یەکەم جار هەڵیبژاردبوو بۆ کۆچکردنەکەی . هەڵدەستێ ئەمجارە ڕێگای شیعر تاقی دەکاتەوە . دەڵێ نا .. من بە هۆی « باخوس ـ خوای شەراب » ەوە ناچمە هەواری بلبل ، بەڵکو بەسەر باڵە سووکەکانی « خواوەندی هەڵبەست » . شاعیر دەڵێ ڕاستە کە هێشتا بیرو هۆشم نەکراونەتەوەو لەسەر خۆ نیم ، بەلام زۆری نەماوە لە مەی ئازادبم و بە گەڵی کەوم . لە دوای ئەوە ئیتر باسی نیوە شەو و مانگ و ئەستێرەو دارستانی ڕەش دەکا کە چۆن شنەی با ، جار جار ، گەڵاو لکان لادەداو تریفەی مانگەشەو ئەو تاریکستانە دەدڕێ .

## ستانزا ـ 5 ـ

بەم ستانزایە وا دەردەکەوێ کە شاعیر گەیشتبێتە تازەهەواری خەیاڵاتی . زۆر وەستایانە باسی دارستانی نیوە شەوان دەکات . دەڵێ ڕاستە بەم تاریکی‌یە ئەنگوستە چاوە ناتوانم بەرچاوی خۆم ببینم ، نازانم چ دارو گوڵ و گوڵیلك لەسەر ڕێگامن . بەلام ـ هەر قسەی شاعیرە ـ بە بۆنەکانیان هەموویان دەناسمەوە . کیتس تەنانەت دەنگی مێش و مەگەزو

میشووله‌و بێ ده‌نگی په‌پووله‌ی ناو دارستانیش ناخاته پشت گوێ .

### ستانزا — 6 —

راسته ، شاعیر به جیهانی نوێی شاده‌بێته‌وه ، خۆی له ترۆپکی به‌ختیاری‌و شادمانیدا ده‌بینێته‌وه ، به‌لام مه‌ترسی گه‌رانه‌وه بۆ دۆزه‌خی سه‌ر زه‌مین وای لێ ده‌کا خۆی هێشتا پتر دوورخاته‌وه‌و رێگای گه‌رانه‌وه‌ی ئیتر بۆ نه‌بێ . بۆیه‌کا هانا وه‌به‌ر مردن ده‌با که گوایا هه‌ر به هۆی ئه‌وه‌وه به ته‌واوی ده‌گاته مرازی . شاعیر ده‌لێ به‌لام له دوای مه‌رگم ، توخوا ، ده‌نگه خۆشه‌که‌ی بلبل با هه‌ر به‌رده‌وام‌بێ ، هه‌رچه‌نده که خۆم گوێم لێ نابێت . ده‌لێ خۆ هه‌ر نه‌بێ به‌سه‌ردولکه‌یێکی به‌سۆزو کول ده‌لاوێندرێمه‌وه .

### ستانزا — 7 —

لێره‌دا کیتس دووباره ده‌مانباته‌وه ناو مێژووی کۆن‌و هی سه‌ده‌کانی ناوه‌ند . ئه‌مجاره ئه‌نتیك‌و کلاسیك‌و رۆمانتیك تێك هه‌لده‌کێشێ .

شاعیر که ده‌لێ « مه‌له چکۆله‌ی نه‌مر » ! هه‌لبه‌تا مه‌به‌ستی نه‌مری‌ی بلبل نی‌یه چونکه بلبلیش ، وه‌ك هه‌موو گیانداریکی تر ده‌مرێ . به‌لام مه‌به‌ستی شاعیر لێره‌دا ده‌نگی بلبله‌که‌یه . ده‌لێ که ئه‌و ده‌نگه هه‌ر له‌گه‌ل دانانی دنیاوه بیستراوه ؛ که ئه‌و ده‌نگه هه‌ر هه‌مان ده‌نگ بووه بۆ پاشاو گه‌دا ، بۆ میرو یه‌خسیر . بۆ پتر روونکردنه‌وه‌ی هه‌ستی خۆی ، جۆن کیتس دوو نموونه‌ی سه‌یرمان بۆ دێنێ . له یه‌که‌میاندا ده‌لێ له‌وانه‌یه رۆژێك بووه « رووت »[4] ی چاره‌ره‌ش ، له دوور ولاتی‌و ته‌نیایی‌دا ، سه‌بووری به ده‌نگی بلبله‌که‌وه هاتبێ . له دوه‌میشیاندا ده‌لێ بۆی هه‌یه کچه شازاده‌یه‌کی سه‌ر ده‌می ته‌مه‌نه‌کانی ناوه‌ندی ، سه‌بووری به ده‌نگه خۆشه‌که‌ی تۆوه هاتبێ که له کولانکه‌ی دژو[5] ته‌لاره به‌ردبه‌نده‌کانی ئه‌و رۆژگاره‌وه هاتبێته گوێ‌و تۆی کردبێته یارو هاوده‌م هه‌تا شۆره‌سواری رزگارکه‌ری به شیرو تیرو که‌مه‌نده‌وه به هاواریه‌وه دێ[6] .

### ستانزا — 8 —

له‌وانه‌یه ئه‌م « ئۆد » ه‌ی کیتس له (8) ستانزایان درێژتر با ئه‌گه‌ر بلبل نه‌فڕیباو خه‌یاله‌که‌ی لێ تێك نه‌دابا . به‌لام ، به‌داخه‌وه ، بلبل له ناکاو دای له شه‌قه‌ی بال . شاعیر وه‌ك له خه‌وێکی خۆشدا به‌ده‌نگی زه‌نگول راپه‌ڕیبێ ئاوای لێ دێ ، له به‌رزایی شادی‌و خۆشی‌یه‌وه به‌رده‌بێته‌وه سه‌ر زه‌مینی ناخۆش ، ده‌گه‌ڕێته‌وه ناو راستی‌و راپالیته[7] . لێره‌دا شاعیر به‌دلێکی سارده‌وه ده‌لێ خه‌یال وه‌ك له‌مه چێتر ته‌فره‌ی دام .

له‌و کاته‌ی که شاعیر له‌سه‌ر شه‌پۆلی هه‌وری فانتازیه‌وه ده‌که‌وێته خواره‌وه ، بالداری هه‌میشه دلگوشاد هه‌ر به‌رزترو دوورتر ده‌بێته‌وه ، ده‌نگو ئاوازه مێلانکولیکه‌که‌شی هه‌تا دێ نزم ده‌بێته‌وه ، شاعیری بێچاره‌ش ، سه‌رسام‌و داماو ، تاتاوێك ، نازانێ ئه‌مه خه‌ونه یا راستی‌یه .

### 5 — ده‌قی « ئۆد » ه‌که

— 1 —

دلم ده‌له‌رزێ ، گشت گیانم سڕه
وه‌ك مه‌رگه‌مووشم خواردبێ ئه‌وهام
یانه به ئه‌فیون هۆشم واهوڕه
هێنده‌ی ئه‌ماوه‌و « لێت » ه سه‌ر ئه‌نجام[8]
ئه‌مه‌ش نه‌ك گوایا به‌غیلیم پێته
به‌لکو چوون شادیم له دلشادی‌یه
په‌ری‌یه سووکه‌له‌ی ، خنجیله‌ی داران
که له‌ناو گه‌لای سه‌وزی به‌هاران
یان له‌سه‌ر لك‌و بۆیی به‌رزو چڕ
ده‌نگی زولالت دنیای کردوه پڕ

— 2 —

ئاخ چی‌بکه‌م له‌بۆ یه‌ك فڕ ئاوی ره‌ز[9]
خه‌ست‌و ساردو کۆن ، هی ژێر زه‌مینان

له جه‌ژنی فلۆرا ، له نێو شوان‌و پەز[10]
مه‌ست‌بم له خۆشی‌و له پێکه‌نینان
ئاخ له‌بۆ جامێك شه‌رابی باشوور[11]
پڕۆڤانسالی ، ئاڵی که‌ف به‌سه‌ر[12]
لێوی کاسه‌که‌ی بێ ببێته سوور
بلقۆکه‌ش جارجار سه‌ر بهێنێته ده‌ر
ئینجا نۆشی که‌م زۆر به ئاسپایی
ون‌بم له گه‌ڵ تۆ ، له ناو تارمایی

—3—

سه‌رم هه‌ڵگرم ، ون‌بم ، له بیرکه‌م :
ئه‌و خه‌فه‌تانه‌ی تۆ قه‌ت نه‌تبوونه
نه که‌س په‌ستم‌کا ، نه که‌س دڵگیرکه‌م
له‌م دنیا هیچه‌و پیره گه‌ردوونه ،
چه‌ند پیری له‌رزه‌ك ، سه‌راپا بادار ،
چه‌ند جوانکه‌ی ره‌نگ زه‌رد ، لاواز ، به‌رهه‌نگدار ،
چه‌ند چاو ئێستا پووت ، جاران پرشنگدار ،
چه‌ند له‌شی شلك ، ئێستا ده‌رده‌دار .
ئه‌مانه هه‌بن له‌سه‌ر ڕووی زه‌مین
ساتوخوا ته‌مای چیت هه‌بێ به ژین !

—4—

نا ، من به باخوس ناچمه هه‌وارت[13]
به‌ڵکو به باڵی سووکی خوای هه‌ڵبه‌ست
هه‌ر بزانه بوومه هاوژین‌و یارت
هه‌رچه‌ند که هۆشم هێز نه‌بووه سه‌ربه‌ست[14] .
به‌ڵام که ئێستا له مه‌ی ئازادم
به‌و شه‌وی فێنك گه‌یمه مرادم
چۆن شاژن له‌ناو که‌نیشکان دیاره
ئه‌وهاش مانگ له‌ناو گه‌لی ستاره
دارستان ڕه‌شه ، به‌ڵام شنه‌ی با
جارجار ڕووناکی مانگی بۆ ده‌با

—5—

ڕاسته ، که چاوم به‌ڕێم نابینێ
نازانم چ گوڵ په‌رش‌و بڵاون !
نازانم ڕه‌نگیان چۆن خۆی ده‌نوێنێ !
نازانم ته‌نیان یان تێکه‌ڵاون !؟
به‌ڵام به‌و بۆنه‌ی لێره‌و له‌وێ دێ
ده‌زانم مسکه ، گوڵه ، نه‌سرینه ،
ده‌زانم چ دار ، ده‌وه‌ن وان له ڕێ
ده‌زانم گوێژن ، توونه یان بی‌نه
فنکه فنکی مێش ، گزه‌ی مێشووله
تێکه‌ڵاون به بزه‌ی په پووله

—6—

ئای چه‌ند خۆشه له‌و تاریکستانه !
گوێ شل بکه‌یت بۆ ده‌نگ‌و ئاوازت
له‌و په‌ڕی شادی ، له‌و گولستانه ،
چه‌ند خۆشه بمریت ، بگه‌یته مرازت !
چه‌ند خۆشه بمریت به‌م نیوه‌شه‌وه
بچیه جیهانی بێ خه‌م‌و خه‌فه‌ت
ڕزگاربیت له ده‌س ئه‌م زینده‌خه‌وه
نه‌گه‌ڕێیته‌وه بۆ کۆشی مه‌ینه‌ت
به‌ڵام له دوای من ده‌نگت هه‌ر بابێ
هه‌رچه‌نده گوێم له سه‌ردوولکه‌ت نابێ

—7—

مه‌له چکۆله‌ی نه‌مری شادان[15]
ڕۆژ هاتن ، ڕۆژ چوون به‌ڵام ده‌نگی تۆ
له گوێی یه‌خسیرو پیرو ئازادان

هەر بیسراوە لای میرو ڕەنجەڕۆ
ڕەنگە ئەو دەنگە دڵی غەمناکی
بەد بەختێکی وەك « رووت » ی پێکابێ[16]
کە لە غەریبی ، بە تەیناو تاکی
لەناو پەرێزان جێی پووشکەو کابێ
ڕەنگە شۆخێکی بەندی ناو تەلار[17]
قوی کردبێتە یار تا دێ شۆڕەسوار

— 8 —

ئەبر خانەخوێم دای لە شەقەی باڵ
وەك لە پرێکا لێی دابێ زەنگوڵ
منیش کەوتمەوە سەر زەمینی تاڵ
ماڵاواییمکرد لە ماڵی بلبل
دیارە خەیاڵیش کەلێك فێڵبازە
وەك لەمەچێتر دەس دەوەشێنێ[18]
خۆی بۆت دەگۆڕێ بەصەد ئەندازە
کەچی لە ناکاو ملت دەشکێنێ
دەنگی مەلوولی مەل دوور کەوتەوە
ئێستەش تێ ناگەم ڕاستە یان خەوە

## پەراوێزەکان

(1) نیسبەت بە شاعیری گەورەی ئیتالیا پێتراركا

(2) ... ـــ S.C. Agarwal , John Keats

(3) بە ڕێکەوت ناوی « فانی براون » و هی ئاغاکەی « چارلس براون » ، وەك یەكن ئەگینا هیچ خزماتیەك لە نێوانیاندا نی‌یە .

(4) رووت، رووت : ئافرەتێکە لە تەوراتدا باسی چیرۆکەکەی کراوە کە بریتی‌یە لەوەی کە رووت لە دوای کوشتنی مێردەکەی ، لە گەڵ خەسووی‌دا دەکەوێتە وڵاتی غەریبیان : لەوێدا خۆی‌و خەسووەکەی بە تێلەکێشی‌و گیشە کەری‌ی بەڕێوە دەبات . بەڵام ئاگری غەریبی بۆ وڵاتەکەی خۆی بە هیچ ئاوێك نەدەکوژایەوە

(5) دژ = دز : قەلا

(6) دیارە شاعیر بەرەبەرە لە سەردەمی خۆمانەوە نزیك دەبێتەوەو ئەمجارە هەڵوەستێك لە تەمەنەکانی ناوەندی ـ Middle ages دا دەکات . لێرەدا باسی کچێك یان میرزادەیەکی ئەو سەردەمە دەکا کە چۆن لە ناو تەلارێکی دوور وڵات ، لە لایەن دوژمنانی باوکیەوە ، بەند کراوەو چاوەڕێی شاسواری خۆی دەکا کە بە شیرو تیرو کەمەندو قەلغانەوە بێتە هاواری . هەڵبەتا ، هەمووومان دەزانین ، لە زۆر فیلمی مێژوویش دیومانە ، کە ئەم جۆرە وێنەیە زۆر باو بووە لە صەدەکانی ناوەندی .

(7) ڕیالیتە : واقع

(8) لێت ، لیث ، لیثێ : لە میتۆلۆکیای گریکی‌دا ، ڕووبارێکە ، مردوو یەکەم شت کە لەو دنیادا دەیکەن خواردنەوەی قومێك لە ئاوەکەیەتی ،ئیتر پاش ئەوە ڕابردووی سەرزەمینیان بە تەواوی لەبیر دەچێتەوەو دەست بە ژیانی نوێیان دەکەن ـ ژیانی مردووان .

(9) ئاوی ڕەز : مەی ، شەراب

(10) جەژنی فلۆرا : فلۆرا ، لە میتۆلۆکیای ڕۆمانی‌دا خواوەندی گوڵو گولیلکان بووە . جا هەر لەو سەردەمەش‌دا ، هەموو بەهاران ، وەك نەورۆزی خۆمان ، ڕۆژێکیان بۆ تەرخان دەکردو ئاهەنگو زەماوەندیان بۆ دەگێڕا . بەلاتینیش فلۆرا واتا گوڵ .

(11) بەشوور : مەبەس لە باشووری فەرەنسەیە کە زۆر لە کۆنەوە تا ئێستەش بە شەرابی چاك نێو بانگی دەرکردوە .

(12) پرۆڤانس : ناوچەیێکە لە باشووری فەرەنسەو شەرابی ئەوێ بە تایبەتی خۆشە . پرۆڤانساڵ یان پرۆڤانساڵی واتا هەر شتێك تایبەتی ئەو ناوچەیەبێت .

(13) باخوس : خواوەندی شەراب

(14) هێز : هێشتا

(15) نەمر : مەبەستی شاعیر لێرەدا دەنگی بلبلە نەك مەلەکە خۆی چونکە بلبل دەمرێ‌و دەنگەکەی هەزاران ساڵە هەر هەمان دەنگە .

(16) رووت : بڕوانە پەراوێز ژمارە (4)

(17) بڕوانە پەراوێز ژمارە (6)

(18) لەمەچێتر : جنۆکە

## سەرچاوەکان

Sources

1) S . C. AgarwaL , John Keats , seLected poems

2) F. T. PaLgrave , The goLden treasury

3) Ifor Ivans , A short history of English Literature

4) Dorothy Hillyers , A short history of English literature

# نهێنی خەندەکەی مۆنالیزا

فاضل شەورۆ
لە ئینگلیزیەوە وەریگێراوە
1984/7/27

من ئافرەتم ، ئافرەتێکی هێمن و بە ئارام ، بەلام کە دەبینم بە گەورەترین شاکاری دونیاو بە بەرزترین نمونەی هونەر ، تەنانەت بە سیحرو معجیزەشم دادەنێن ، خۆم پێ ناگیرێ ، بزەیەك دێتە سەر لێوانم و خەندەیەك دەمگرێ ... سا خەلکەکەش سام دەیان گرێ و بەسەرسوڕمانێکەوە تێم دەڕوانن کە پڕە لە نەشئەی خۆشی و نیگای تێنەگەیشتن .

«ئای کە خەندەیەکی تەمومژاوییە !» بە یەکتری دەلێن . (تۆ دەتوانی تێی بگەیت ؟ ئێمەش تێی ناگەین ! هەموو سیحرو جوانی یەکەشی لەمەدایە !)

من بێزار بووم لەم ووشانەو لەم تێروانینە قوول و سەرنج ڕاکێشەرانەی کە هیچ مانایەك ناگەیەنن . بۆیە بریارمدا کە پەردە لە رووی نهێنی خەندەکەم لا بدەم و هەموو شتێ ئاشکرا بکەم - هەرچەندە لە راستیشا ، هیچ نهێنی یەك لە ئارادا نی یە - من بە تەوسەوە پێدەکەنم ! بەلێ بەتەوسەوە ، ئەمەش شتێکی باوە لەم سەردەمەی ئێمەدا - ئەم سەردەمەی کە ئێوە ، بەم دوایە ناوتان ناوە سەردەمی گەشاوەی ڕێنەسانس - هەلسەنگاندنەکەتان بۆ سەردەمی ئێمە پڕ بەپێستی یەتی و شتێکی رەوایە ، بەلام ئەم واتەیەم ئەوە ناگەیەنێ کە هەموو شتێکی ئێمە تیپیکەلە (تاکە نمونەیەکی تەواوە) . بۆ روونکردنەوەی ئەم قسەیەم ، فەرموون من بکەنە نمونە : من حەزم لە لیۆناردۆ دا فنشی کردو ئەویش حەزی لە من کردو شێت و شەیدام بوو . بەلام من نەمتوانی بگەمە ئاکامێ ، بریاری شووکردن بدەم بە پیاوێکی هونەرمەندو زانا . بووم بە ژنی بازرگانێکی دەولەمەند . بەلام زیندەگی و گوزەران کردنم لە گەل پیاوێ کە خۆشم نەویستبوو بوو بە مایەی ئازارو ئەشکەنجەیێ کە لە ژێریا خۆم پێ ڕانەگیرا .... لیۆناردۆش ، خۆم ئاسایی ، ئازارێکی زۆری چێشت . ئەی چی بوو سێبووری ئێمە دەدا ؟ تەوس پێکردن ! کاتی زۆر نمونەی کارەساتی عێشق و ئەوینی دل تەزێنترمان هاتەوە یاد ، پێکەنین ! ئەمە بۆ من شتێکی سووکو ئاسان بوو ، چونکە ژنێکی هەژارو کلۆل نەبووم ، بەلام بۆ لیۆناردۆ کارێکی سەخت و جەرگبڕ بوو . ئەوەی راستی بێ ، هەر ئەم گالتەو تەوس پێکردنە بوو وورەی ئەوی بەرز کردەوەو هانی داو وای لێ کرد دەست بۆ فلچەکەی بەرێ . سا بەم جۆرە پۆرترێتی (تابلۆی) منی هێنایە کایەوە ، بەلێ ، پۆرترێتێك و بەس ! شێوەو روخساری دەموچاوەکە هی منەو - روحەکەشی - هی لیۆناردۆ ، وەك بلێی راستەوخۆ بەدوای ئەم خەندەیە رادەکا . هێندەی نەماوە فرمێسك زەنگول زەنگول لە چاوەکانم بێتە خوار - چاوەکانم پڕن لە گریان - من ئافرەتێکی ئاسایی بووم ، بەلام لیۆناردۆ مرۆڤێکی بەهێزو خۆ ڕاگربوو' ... .

بە هەرحال ، لیۆناردۆ لە ژیانی رۆژانەیدا هێندە دل ناسك بوو ، تەنانەت بوو بە مرۆڤێکی عاتیفی ئەوتۆ کە نەی دەتوانی هەست و سۆزی خۆی بشارێتەوە ، کە تابلۆکەی منی ، دوای چوار سالی رەبەق لە کاری سەختی پڕ وورده کاری ،

تەواو کرد ، هێدی هێدی سەری نزم کردەوەو دایە قوڵپی گریانێکی پڕ جۆش و کاریگەر ، ئەسرینی خۆشی و پەژارە تێکەڵ بەیەکتری بوون و بەسەر کوڵەکانیا جۆگەیان بەست ، بەلام دوای تاوێ ، سەری بەرزکردەوەو تەماشایەکی منی کردو پێکەنی ، هەردووکمان بەیەکەوە پێکەنین و خەندەیەك رووی گرتین ... ئا ، لەم ساتانەدا ئێمە دوورکەوتبووینەوە لە عورف و عەدەت ، لە سەرەوەی هەموو ویست و ئارەزوویەکی مرۆڤا بووین . من ، پێکەنینم بە ژیانی تاڵی ژنە بازرگانەکە هات و لیوناردۆش هەموو غەم و کارەساتەکانی خۆی لە بیر چۆوە . تەنانەت حەزو دڵداریە خنکاوەکەشی نەیتوانی لە ئامێزی ئەم شەدی و سەرفیرازیە دەرمان ـ بێنێ . بۆ ئەم جۆرە ساتانە ، مرۆڤ هەموو ژیانی خۆی بەخت دەکا . خەڵکینە ! من دەمەوێ کە سەرنجم لێ دەدەن و تێم دەروانن لێم تێبگەن . دەسا ئێوەش ئەم رووخسارو دیمەنە خەیالاویە لە رووی خۆتانا بسڕنەوە ، هەتا ئەگەر گەیشتنە هەموو ئەو شتانەی لە رۆژایەکا ئاواتتان بۆ دەخواست . تۆ مرۆڤێکی هەژارو دەستەزمانی گەر خاوەنی گاڵتەو تەوس نەبی ... دەی ، بەدەم تەوسەوە تەماشایەکی خۆت بکە تاتێم بگەی .... تێبگەی کە کۆمەڵێ مرۆڤی مەزن و پایەدار هەیە کە نە ناویان هەبووەو نەموڵك و سامان ، کەچی بە درێژای سەدەکانا ناوبانگیان دەزرینگێتەوە ، سا گەر تۆیش نەبوویت بە خاوەنی پایەو مەقامێك وابکات نەوەکانت یادت بکەنەوە ، نارەحەت مەبە ، پێ بکەنە ! ئاخۆ تۆ دەزانی ناوی چەندەها مرۆڤی مەزن لە بیرچۆتەوە ؟

«ژیان ئاوایە !» وەك خۆمان لە سەردەمی رێنەسانس دەمانووت . ئێمە نەك تەنیا دەمانزانی چۆن بە تەوسەوە پێ بکەنین ، بەڵکو شتێکیشمان بۆ نەوەکانمان بەجێ هێشتووە . من ، خۆم ئافرەتێکی متەوازیع نیم ، دەمانتوانی کاری مەزنتریش ئەنجام بدەین ، ئەگەر زۆرتر گاڵتەچی بوو باینایە . سا گەر تۆیش دەتەوێ ئەو خەیاڵە بکەی کە هێندەت نەماوە ببیت بە گیانێکی تەواو تەکمیل ـ بوەستە ! بۆی هەیە ئەمە درەکەت لێ تێك بدا . کەواتە خێراکە خەندەیەك بێنەسەر لێوەکانت ... لێوەکانت بەخەندەیەکی بەتەوسەوە ویکبێنەوە !



لەوە مەترسە بە خۆت پێ بکەنی و بەسەر ستوونی پەیکەریشا هەڵەگەرێ ، چونکە بەردیش شتێکی نەمرو ئەزەلی نی یە ! رۆژێ دێ کە منیش تەفروتوونابم ، گرنگ نی یە چەندە ئاگادارم بن و بایەخەم پی بدەن یا لە چ پلەیەکی گەرمایی دا هەڵم گرن ، ئەوەی کە نەمرو زیندووە خەندەو تەوس پی کردنەکەیە . سا ئەگەر تۆیش هەر بە زەحمەتی دەزانی و بۆت ناکرێ خەندەیەك بێنیتە سەر لێوەکانت ، ئەوە چاوەڕوانی لیوناردۆی خۆت بکە ... !

لەم گوڤارە وەرگیراوە

Sputnik

1977 January (1)

P. P. 138 - 139

By Varlen Strongin.

وریا ئەحمەد

# حاجی عەبدوڵڵای دەف زەن

میللەتانی جیهان شانازی بە کەلە هونەرمەندو ئەدیبو زاناو پیاوە بلیمەتو ناودارەکانی خۆیان دەکەن ... ساڵ بە ساڵ لە یادی ڕۆژی لەدایك بوونیاندا ئاهەنگ دەگێڕنو یادی کۆچکردنیان دەکەنەوە ، میللەتی ئێمەیش وە نەبێ پیاوی گەورەو کەڵە زاناو ئەدیبو هونەرمەندی ڕەسەنو لێهاتووی نەبووبێ ، بەڵکو بەدەیان بگرە بە سەدان خزمەتگوزارو لە خۆبوردووو داهێنەرو بلیمەتو ناوداری هەبووە ... لێرەدا ناوی هەندێ لە دەنگخۆشو ئاواز خوانانی بلیمەتی کۆچکردووی هەندێ لە شارو شارۆچکەکانی کوردستان بەنموونە دێنینەوە :ـ

● (قوندیل) ناز ناوی دەنگخۆشێ بووە ، ناوی تەواوی (مەلا عەبدوڵلای ڕەواندزی) بووەو دۆستی شاعیری نەمری کورد (وەفایی) بووە .

● (حەبیبوڵلای ئەکبەر دەلاك) باپیری گۆرانی بێژی ناودار (ناسری ـ ڕەزازی) بووەو «واتە باوکی دایکی» ، خەڵکی شاری سنە بووەو گەلێ دەنگخۆشو لێهاتووبووە ، هەر لە شاری ناو براودا دەنگخۆشێکی ناوداری دیکە هەبووە بە ناوی (ئاورەحمان دەواغچی) .

● لە سلێمانی (دەروێش عەبدوڵڵای شمشاڵ ژەن) هەبووە کە شاعیری نەمر گۆران لە شیعرە بە ناو بانگەکەیدا «دەروێش عەبدوڵڵا» ناوی هێناوەو بە ووردی باسی دەنگخۆشی ئەو هونەرمەندەی هۆنیوەتەوە ، ئەوەتا دەڵێ :

ئەوەندەم بیست لە مۆسیقا خرۆشی ڕۆحی بێگانە
میزاجی کوردەواریم تێکچووە ، دەروێش عەبدوڵڵا
لە بیتهۆڤن گەلێ زیاتر بە ڕۆحم ئاشنای وەڵڵا
دە ئەی دەروێش ؛ سکاڵایێك لەگەڵ ڕۆحی کڵۆڵمکە

ـ هەر لە شاری سلێمانیشدا (دەروێش عەبدوڵلای دەف زەن) ژیاوە کە ساڵی (1940) لەتەمەنی (40) ساڵیدا بە خۆیو (سەیزادە)ی ژنی هاتۆتە شاری سلێمانی ، بەڵام ئەمەیان (دەف زەنو دەنگخۆش) بووەو ، ئەوی گۆران (شمشاڵ ژەن) بووە ، دەروێشی دەف زەن کاسێتێکی لە دوا بەجێ ماوە کە بریتی‌یە لە ستایشو گۆرانیو شتی ئایینی ، هەر دیسان لە سلێمانی (ئەحەی ناسر) هەبووەو گەلێ دەنگخۆشو بلیمەت بووە .

● لە (سابلاخ ـ مەهاباد) دا دوو دەنگخۆشی گەلێ بە ناوو دەنگ هەبوون ، یەکەمیان : ناوی (حوسەینی قاقی)و ئەوی تریان (سەعیدی ماملێ) بووە کە دەکاتە باوکی هونەرمەند نەوە بە نەوە فۆلکلۆری ڕەسەنی سەدەکانی پێشووی نەتەوەکەمان بپارێزنو بە ئێمەی بگەیەنن .

ـ شاری هەولێری خۆشەویستیش وەکو هەموو شارو دێهاتەکانی تری کوردستان بێ دەنگخۆشو بلیمەت نەبووە .

خوێنەرانی ئازیز : والەم نووسینەمدا بە پێی توانا هەوڵی ئەوە دەدەم لە گەڵ هونەرمەندێکی دەنگ خۆشو مەقام زانو دەف زەنی شاری هەولێردا ئاشناتان بکەم ، بۆ ئەوەی ئەستێرە بەرزەکەی ئەو هونەرمەندە نەمرەمان لە ئاسمانی هونەری کوردیماندا هەمیشە درەوشاوە بێت ، ئەویش



هونەرمەند «حاجی عەبدوڵڵای دەف زەن»ە .

- (حاجی عەبدوڵڵای دەف زەن)ی رەحمەتی ساڵی (1902)ی ز لە شاری هەولێردا چاوی کردۆتەوە ، باوکی ناوی (دەروێش یونس) بووە .

لە دیوانەکەی شاعیری نەمر (ساف هیرانی)دا نووسراوەو دەڵێ :ـ

[ ساف ، هەمیشە چەن دەروێشێکی دەنگخۆشی لە لابووە بەتایبەتی (فەقێ خدرو دەروێش مستەفاو حاجی عەبدوڵڵای دەف زەن) کە لە کۆڕی شاعیری ناوبراودا دەنگیان هەڵدەیناو باڵندەیان بە هەواوە دەوێستان ، بە تایبەتی کە هەڵبەستە تەڕو ئاودارەکانی (ساف) یان دەخوێند ، ناوبراویان بە جارێ دەخرۆشاندو بۆیان دەهەژاوەو وەکو ڕێژنە باران فرمێسکی بەسەر ڕوومەت و ریشدا هەڵدەوەراند .

هەرکاتێکیش ساف بچووبایە هەولێرو دەشتی دزەییاتی یا ناوچەی زینوێ شێخی و شوێنانی تر .. بە بێ هاوەڵی دەنگخۆش ڕێگای نەدەگرتە بەر . حاجی لە تاف لاوێتیدا زۆر هاتووچۆی ساف کردوو و لای ماوەتەوەو ژنی دووەمیشی لەوێدا هێناوە کە کچێك یا زیاتری لەو ژنە لە پاشدا بە جێ ماوە ، چونکە بنەماڵەی حاجی ئێستا لە شاری هەولێر لە گەڕەکی (عارەب) دادەنیشن و دوو کوڕی لە دوا بەجێ ماوە یەکیان (ستلار) و ئەوی تریان (موحەمەد) ە ئەم وێنەیەی (حاجی) یشمان هەر لای ئەو دوو کوڕەی دەسکەوت ، وەکو باسیان کرد وێنەکە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی (1960) ](*) .

مەقامی (شووروودیوان دەشت و حوسەینی و قۆریات و .. هی تریش) ی خوێندووە ، دەنگی حاجی لەو کاسێتەی دەستم کەوت لە گەڵ دەنگی خوالێخۆشبوو (سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی) دا جیا ناکرێتەوە ، بەڵام بەداخەوە دەوروپشت و بنەماڵەی حاجی هانیان نەداوە بۆ ئەوەی دەنگی خۆی لە ئێسگەدا یا لەسەر (گرامەفۆن ـ قەوان) تۆمار بکات ، ئەگینا ئێستا ناوی وەکو کەڵە دەنگخۆشە ڕەسەنە کۆچ کردووەکانمان لە مەیدانی هونەردا بە نەمری دەمایەوە ، چونکە دەنگی حاجی وەکو دەنگی (سەی ئەسکەر) بڵندو بەرز بووە بەڵام ناسکتربووە ، ئەمە قسەی هاوەڵ و برادەرانی (حاجی) یە ، کە کاتی خۆی لە مەولوودو قورئان خوێندندا پێکەوەبوون ، لەوانە (مەلا جەردیس و سەید ئیسماعیل و مەلا سابیرو .. هی تر) وە هەر لەوانم گوێ لێ بووە کە (حاجی) گوتن و شێوەو ئسووڵی مەقام لە (عەلی کۆر) فێربووە ، کە دەنگخۆش و ناودار بووە لە شاری هەولێرداو ، خاڵی (حاجی) بووە .

دەگێڕنەوە دەڵێن لە (نەوەکانی) پێش (حاجی) یشدا دوو دەنگخۆشی زۆر بە ناوودەنگ هەبووین لە هەولێردا یەکیان ئەو (عەلی کۆر)ە بووەو ئەوی تریانی (شەهابە) ، دەربارەی شەهابە دەڵێن وەختی خۆی مەقامزانی عیراق (گوبانچی) زۆری بە دڵ بوەو زۆر ڕێزی لێگرتووە ، گوایە کەم مەقام زان و مەقام شوناسی وەکوو شەهابە هەڵکەوتووە ، ناوبراو هەتیوو بێکەس بووە (سەید مەردان) ناوێك کە دانیشتووی شاری هەولێربووە بە خێوی کردووە .

شەهابە هەرگیز گەرم نەدەبووو ساز نەدەدرا ، شوشەی مەی هاوسەری بووەو دەم نادەم بەسەریەوە ناوەو ئەوجا چریکەی دەنگی بە جۆشی بەرزبۆتەوەو بووە بە خۆراك بۆگیانی تینووی گوێگرانی ، یەکێك لە قوتابیانی شەهابە لە هەولێردا (شەوکەت)ە ، کەناوی هونەریی (مشکۆ)یەو لە مەقامی حوسەینی و بەیات و قۆریاتدا گەلێ لێهاتووە .

بگەڕێینەوە بۆ بەسەرهاتی (حاجی) ، دوای هاتنی ئینگلیز بۆ عیراق (حاجی) ماوەیەکی لەناوچەی هەریرو باتاس

بە (پۆلیس)ی بردۆتە سەرو لە پاشاندا بووە بە بانگدەر واتە (مۆذن) لە مزگەوتی (ئالتی بەرماغ) واتە (شەش ئەنگوست)و سەرەڕای خوێندنی ستایش و قورئان و مەولوود گۆرانی دلداریشی واتە (غەزەل)ی خوێندووەو زمانی تورکی و عارەبی و فارسی زانیوەو مەقام و گۆرانی پێخوێندوون . زۆربەی جار مەولوودی بە (مەولە جانەم) دەست پێکردووە کە لە هەڵبەستی (ئەمین شنۆیی)و لە سەر مەقامی (شووڕ)ە ، تا ئێستاش (سەید ئیسماعیل) لەسەر هەمان ڕێو شوێنی حاجی ی مامۆستای دەرۆات و مەولوود هەر بەو شیعرە دەست پێدەکات . (کانی) شاعیری ئەمری هەولێر ، دۆست و برادەری (حاجی) بووە ئەوەتا لە شیعرێکیدا کە بە ناونیشانی کەرە دێزەوەیە گوتوویەتی :-

پێستیشی دەغاریێ لە بۆ دەف بیدەمە حاجی
دەکرێتەوە ئەوجا لە مەقام حاجی میزاجی
لێدە دەفی کەر (پاپخەکوێر) کەتیە ڕەواجی .

(حاجی) ناو ناویش لە سەرەتای مەولوودخوێندنەوەدا ئەم شیعرەی (کانی) بەمەقام دەخوێندەوەو ، کاری دەکردە سەر هەموو گوێگرانی و لەتاوانا موچڕک و تەزوویان بە ناخدا دەهات و مووی لەشیان وەکو نەشتەر ڕادەوەستا :-

بەبێ سووچ و گوناە بۆ عاجزی لێم ئەی ستەمکارم
دەخیلت بم ئەگەر عەفووم نەکەی زۆر دڵ بە ئازارم

مامۆستا (مەلا جەردیس) بۆ مێژووی کۆچی حاجی دەڵێ :-

سەرلەربەیانی ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربانی ساڵی (1963) حاجی ماڵئاوایی لەشاری هەولێرو هەموو خەڵکی کوردستان کردووەو دەڵێ خۆشم ئامادەی ناشتنی بووم ، بەڵام بە گوێرەی ئەو زانیاریانەی لە کاك (موحەمەد مەلا مستەفا)م وەر گرتووە ، مێژووی کۆچی حاجی بەرۆژی (1964/4/10) دەزانێ .

خوالێخۆشبووی بلیمەت ، حاجی یەکجار دەستکورت بووەو کوێرەوەری زۆری چێشتووە لە ژیانیا کەوابێ شاعیری بەرز هێمن ڕاست دەکات کە دەڵێ :-

هونەرمەندو ژیانی خۆش مەحاڵە
هونەرمەند ڕەنجەڕۆیە ژینی تاڵە
ئەتۆ بزانە ئەوەی ئەهلی هونەربێ
دەبێ یا دەسبەسەر یادەربەدەربێ

بەڵێ کورد دەیان بەڵکو سەدانی وەکو (حاجی) ناودارو بلیمەتی هەبووە بەڵام بەداخەوە دوا کەوتوویی و نەخوێندەواری و دەستکورتی ... ناوی بزرکردوون .

## پەراوێزەکان :-

1 - تەمموورە :- ئامیرێکی کۆنی سازو ئاوازی کوردی یە ، لەوەوە بۆمان دەردەکەوێ کە (خدر بارام) نەك هەر دەنگخۆش و مەقام زان بەڵکو مۆسیقاژەنیش بووە .
2 - مەلا فەندی : یەکێك بووە لە پیاوە ناودارو دەست ڕۆیشتووەکانی شاری هەولێر .
3 - حاجی - مەبەستی حاجی عەبدوڵلای دەف زەنە ، لە بەیتی یەکەم و دووەمی ئەم شیعرەدا (کانی) دەیسەلمێنێ کە حاجی هەم دەف زەن و هەم مەقام زان بووە .
4 - پاپخەکوێر : دەف زەنێکی شاگردی حاجی بووەو لە قەڵاتی هەولێردا دانیشتووە - (قەڵاتی بووە) .

## سەرچاوەکان :-


1 - گۆرانیەکانم (عەلی مەردان)
2 - ڕۆژنامەی ژین ژمارە (55) ساڵی دووەم لە (1972/2/3)دا .
3 - گۆڤاری بەیان ژمارە (53)ی کانوونی دووەمی ساڵی (1979) لاپەڕە (70 - 76) .
4 - مەقامەکانی سێوەی هونەرمەند .
5 - دیوانی (ساقی هیرانی) لاپەڕە (10) .
6 - دیوانی (کانی) لاپەڕە (36) .
7 - دانیشتنێکی (1) کاتژمێری لە گەڵ هونەرمەند (ناسری ڕەزازی) کە بەکاسێت تۆمارم کردووە .
8 - دیوانی گۆران لاپەڕە (119) ، بۆ فریشتەی مۆسیقا (دەروێش عەبدوڵلا) .

# ئەتنۆگرافیا

رشاد میران

لەمێـژوودا چ لەئەنجامی شەڕو شـۆڕو کـارەسـاتی سروشتیدا ، چ بەهۆی باری ئابووری و سیاسی یەوە زۆرجاری وابوە کەگەلان جێ گۆڕکێیان کردووە یا لەناوچـوون ، ناو یـا زمانیان گـۆڕاوە ... هتد . هـەروەها خـواستی میللەتان بـۆ ناسینی ڕەسەن و نەژادی خۆیان و مێژووی دروست بـوونیان وەك میللەت و زانینی سەرچاوەی ئەو خووڕەوشتـە کۆنـانەی کەئیمڕۆ بۆیان ماوەتەوە جگەلەوەش هەولدانیـان بۆ نـاسینی خەلکی دەوروپشت خۆیان جا چ بەنیازی شەڕو دوژمنایەتیەوەو چ بەمەبەستی هاوسێیەتی و پەیـوەندی بـاشەوە ... ئـەوانە هـەمووی وایـان کرد کـەلەناوەڕاستی سـەدەی نـۆزدەمـدا زانستێکی سەربەخۆ بەناوی (ئەتنۆگرافیـا)وە لەدایك ببێت . ئەم ڕووداوو دیاردانەی کەلەسەرەوە باسمان کردن پێویستیان بەلێکۆلینەوەی وورد. لەسەر بنچینەیەکی تیۆری زانستیانەوە هەیە . ئەوکارەش وەکو زانستێك ئەتنۆگرافیا لەئەستۆی خۆی گرتوە .

ئـەتنۆگـرافیـا(میللەتنـاسی) ـ زانستێکی مێـژوویی یـە دەربارەی میللەتانی جیهان[1] . لەڕەسەن و مێـژووی دروست بوونی میللەتان و جۆری ژیانی ئابووری و کۆمەلایەتی و سیاسی ، کولتوری مادی و کولتوری گیانیانەوە[2] دەکۆلێتەوەو دەرخستن و ڕوون کردنەوەی هەموو جۆرە گۆڕانێك کەبەدرێژایی مێـژووو بەسەر میللەتاندا دێت .

ووشەی ئەتنۆگرافیا ووشەیەکی گریکی (یـۆنانی)کـۆنە لەدووبـەش پێك هـاتووە . (ئـەتنۆس) ـ میللەت یـاقـەوم ، (گرافێن) ـ باس کردن ، وەسف کردن . هەربەو مانایەشەوە بەکوردی ووشەی(میللەتناسی)پـڕبەپێستی خـۆیەتی ، بـەلام بەکارهێنانی ووشەی ئەتنۆگرافیا بەجێ ترە چـونکە لەلایـەن زۆربەی گەلانی جیهانەوە جێگەی خۆی گرتووە . لەهـەندێ ووڵاتـانـی ئـەورووپـای ڕۆژئـاوادا ووشـەی (ئەتنۆلۆگیا)بەکـاردەهێنن کەئـەویش هەر لەگـریکی کۆنـەوە وەرگیراوە ، بەلام (لۆگیا) مانای زانستە جا ئەتنۆلۆگیا ئەبێتە (زانستی میللەتان) . زۆر جاران بۆتە دەمەتەقێ و مشتومڕ کەگوایە ئەرکی سەرشانی ئەتنۆگرافیا تـەنها وەسف کـردنی میللەتانەو بۆ لێکۆلینەوە ، تیۆرێکی زانستی تـایبەت بـەخۆی نی یـەو بەلکـو ئـەم ـ واتـا لێکـۆلینـەوەی زانستی ئـەرکی سـەرشانی ئـەتنۆلۆگیـایە ، بـەم جۆرە سنـووریان لەبـەینی ئەتنۆ ـ گرافیاو ئەتنۆلۆگیا داناوە ، بەلام ئێستاکە گومان لەوە ناکرێ کە ئەتنـۆگرافیـا زانستەو لەگـەل ئەتنـۆلۆگیادا هیـچ جیاوازی یەکیان لەبەیندا نی یە .

لەبـەر ئـەوەی ووشـەی (میللەت) لەزۆربـەی زمـانـە ئەوروپایی یەکاندا بۆ زۆر مەبەست بەکاردێت وەکو :خەلك ، ئاپۆرە ، چین ، دانیشتووانی ووڵات ..هتد[3].بۆیە ئەتنۆگرافەکان لەجیاتی ووشەی میللەت ووشەی (ئەتنۆس)ی گـریکی کۆن بـەکار دێنن بـۆ دەربڕینی مـانای ئـەو کۆمـەلە خەلکانەی کەچەند مەرجێکی ئەتنۆگرافیان تیا بەدی دەکرێن وەکو : ناوی میللی (ئەتنۆنیم) ، زمان ، خاك و هۆشیاری میللی ،

لێرەدا پێویستە بڵێین کەوا ووشەی (ئەتنۆس) بۆ هەموو قۆناغە مێژووییەکان بەکاردێت ـ خێڵایەتی ، کۆیلایەتی ، دەرەبەگی ، سەرمایەداری ، سۆشیالیستی واتا ئەتنۆس وەکو بۆخێڵ و عەشیرەت یا یەکێتی چەند هۆزێکی قۆناغێکی مەشاعی بەکاردێ (سکیف و سەرماتەکانی دەوروبەری دەریای ڕەش ڤیکۆنگەکانی ئەسکەندەناڤیا ، گۆتەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا ، کاردۆخەکانی کوردستان ... هتد)[٥]

هەروەها بۆ ئەوانەش بەکاردێت کەئێستا نەتەوەن و لەقۆناغی سەرمایەداری یا بەرەو سۆشیالیستییەوە تێپەڕبووینە (فەرەنسایی ، ئەڵەمان ، ڕوس ، پۆلۆنی ... هتد) . شایانی باسە کەوا ئێستاکە بۆدیارکردنی نەتەوەکان مەرجێکی ئەتنۆگرافی تریش دانراوە کەئابووری هاوبەشە ئەوەش مارکسی‌یەکان بەگرینگترین مەرجی دادەنێن . بەکورتی وەکو گوتمان ناوی (ئەتنۆس) بۆجیاکردنەوەی کۆمەڵەو گرووپی خەڵك لەیەکتری بەکاردێت جا لەهەر قۆناغێکی پێشکەوتن دابن .

● **پەیوەندی ئەتنۆگرافیا لەگەل زانستەکانی تردا .**

هەرچەند ئەتنۆگرافیا زانستێکی سەربەخۆیە ، بەلام لەهەمان کاتیشدا زانستێکی مێژوویی‌یە چونکە باسی مێژووی کۆن و تازەی میللەتان دەکات و لێیان دەکۆڵێتەوە . لەم ڕووەوە ئەتنۆگرافیا گەلێ سوود لەزانیاری‌یە مێژووییەکانەوە وەردەگرێت کەزانستی مێژوو[٦] بەجۆرێکی سەرەکی لەسەرچاوە نوسراوە کۆنەکانەوە وەریان دەگرێت ، بەلام مێژووی میللەتان تەنها لەسەرچاوە نووسراوەکاندا نی‌یەو هەموو میللەتێکیش خاوەن نووسین نەبووەو هی وا هەیە کەهیچ ئاسەوارێکی تۆمارکراوی لەپاش بەجێ نەماوە بەڵکو مێژووی میللەتان لەخووڕەوشت و تەقالیدو بیروباوەڕو ئاینەکانیشیان دایە هەروەها لەخانوو جل و بەرگ و نەخشی سەر تاق و دیوارو کێلی گۆڕستان و داستان و ئەفسانەو گۆرانیەکانیشیان دایە . واتا ئەتنۆگرافیا شان بەشانی سەرچاوەی نووسراوە کولتوری مادی و گیانی میللەتان بۆ خۆی دەکاتە سەرچاوەو زانیاری مێژوویی‌یان لێ وەردەگرێت . بۆ ئەو مەبەستەش ئەتنۆگرافیا ڕێ ڕەوی تایبەتی خۆی هەیە کە پێی دەگوترێت (لێکۆڵینەوەی مەیدانی) ، ئەمەش بەش بەحاڵی خۆی یەکێکە لەخاسیەتەکانی ئەتنۆگرافیا .

لێکۆڵینەوەی مەیدانی ـ لێکۆڵینەوەی میللەتێکە لەناو میللەتەکە خۆیدا ، واتا لەنزیکەوە چاوەدێری کردنی ژیانی ئابووری و کۆمەلایەتی و کولتوری ، زانینی خووو ڕەوشتیان ، تۆمارکردنی گۆرانی ، پەند ، ئەفسانە ، داستان ، زەماوەند ، جەژن ، ئاهەنگ ، پرسە ، جل و بەرگ ، خانوو ، نەخش و نیگار ، خواردن ، ئایین ... هتد لەمانەدا دەست نیشان کردنی شتی کۆن و تازەو ، دیارکردنی ئەوانەی ڕەسەنن و ئەوانەی لەمیللەتانی‌تر وەرگیراوون ، جگە لەمانەو گر نگترین شت زانینی بیروڕای میللەتەکە دەربارەی خۆی و مێژوو و کولتوری خۆی . بۆ ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە لەوولاتە پێشکەوتووەکاندا سالانە دەیەها گرووپی پسپۆران(بعثة) پێك دێن بۆ لێکۆڵینەوە لەمیللەتانی ناوەوەو دەرەوەی وولات .

**ئەنترۆپۆلۆگیا :**

کەزانستێکە تایبەت بە لێکۆڵینەوە لە ڕەگەزەکانی ئادەمیزاد ،پەیدابوون وبلاوبوونەوەیان بەسەر زەمیندا ، سەرچاوەیەکی زۆر بەنرخی ئەتنۆگرافیایە چونکە ئەنترۆپۆلۆگیا دیراسەی پەیوەندی مێژوویی و تێکەلاویی کۆمەلانی خەلك دەکا بۆ نموونە پەیدابوونی ڕەگەزی مەغۆلی لەناوەڕاستی ئاسیادا بەتایبەتی لەکازاخستان و تورکمێنیادا (کازاخی و تورکمێنیەکان پێش ئەوە سەر بەڕەگەزی ئەورووپایی بوون)[٧] پەیوەندی بەکۆچ کردن و بلاوبوونەوەی مەغۆل و قەومە تورکەکانەوە هەیە کەئەمەش خۆی لەخۆیدا بابەتێکی ئەتنۆگرافی‌یە .

**ئەرخیولۆگیا(علم الاثار) :** لەڕێگەی ئەو شتە مردوانەی کەلەشوێنە هەلکەندراوەکاندا دەیاندۆزیتەوە ، دەست نیشانی جۆری کولتوری مادی و ژیانی ئابووری ئادەمیزادو میللەتانی کۆن دەکات .زانیاری دەربارەی بلاوبوونەوەی کولتورە کۆنەکانە بەسەر زەمیندا یارێدەی ئەتنۆگرافیا دەدات بۆ زانینی

جۆری ئابووری میللەتانی کۆن و تێکەلاوی و جێ گۆڕکێیان ، هەر لەبەر ئەوەش زۆر جاران ئەرخیولوگیا دەلێن - پەلیۆ ئەتنۆگرافیا ، واتا ئەتنۆگرافیای کۆن .

بێ گومان زمان یەکێک لەمەرجە ئەتنۆگرافیە هەرە گرینگەکانە بۆ دیارکردنی کەسایەتی کۆمەلانی خەلك ، بۆیە زمانەوانی (فیلۆلۆگیا) سوودی زۆری بۆ ئەتنۆگرافیا هەیە بۆ دەست نیشان کردنی نزیکایەتی و خزمایەتی - لەرێگەی زمانەوە - لەبەینی میللەتانی جیهاندا جگە لەمەش یەکێك لە بنکە هەرە سەرەکی یەکانی ئەتنۆگرافیا دابەش کردنی میللەتانە لەسەر بنچینەی زمان ، وەکو خێزانە زمانەکانی هیندۆ ئەوروپایی، ئەلتایی ، چینی تێبتی ، سامی ، درافیدی.. هتد .

ئەتنۆگرافی و جوگرافیا دوو زانستی زۆر لەیەك نزیکن بەلکو پێش ئەوەی کە ئەتنۆگرافیا وەکو زانستێکی سەربەخۆ بناسرێت بەشێك بوو لە جوگرافیا (وەکو بۆ نموونە لەروسیادا) بۆ لێکۆلینەوە لەهەر میللەتێك ئەبێ پێش هەموو شتێك جێ نشینەکەی دیاربکرێت ، هەروەها جۆری خاك و ئاوو هەواکەی بۆ دەست نیشان کردنی جۆری ژیانی ئابووری و کولتووری مادی ئەو میللەتە بۆ نموونە ئاوو هەوا تارادەیەکی زۆر کار ئەکاتە سەر جۆری جل و بەرگ و خانووو کشت و کال و ترانسپۆرتیان جگە لەوەش کار ئەکاتە سەر نەفسیەت و خووڕەوشتیان ، خۆ زۆر جاریش ناوی جوگرافی وولاتێك (تۆپۆنیمیا) هەمان ناوی میللەتە (ئەتنۆنیم) دەگرێتەوە : وەکو کوردستان ، ئەرمینیا ، پۆلۆنیا ، چیکۆسلۆڤاکیا ...هتد .

هەر لەدێر زەمانەوە لەو کاتەوە کە دەولەت دامەزراون و سنووری سیاسیان دیارکراون ، ئەم سنوورانە هەرگیز لەگەل سنووری ئەتنیکی (ئەتنۆگرافی)میللەتاندا یەکیان نەگرتۆتەوە چونکە دەولەت و سنوورە سیاسی یەکان تەنها رەچاوی بەرژەوەندیەکانی چینی دەسەلاتدار یا میللەتی دەسەلاتدار ئەکەن نەك بەرژەوەندی میللی میللەتان . لەمەیدانی دیارکردنی سنووری ئەتنیکی میللەتاندا ئەتنۆگرافیا توشی هەندێ تەنگو چەلەمەو گیروگرفتی سیاسی توندو تیژ دێت چونکە لێکۆلینەوەی ئەتنۆگرافی لەچوارچێوەی دەولەتێکدا ئەبێ ژیانی ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتی هەموو میللەتانی ئەم دەولەتە بگرێتەوە تەنانەت هی کەمایەتیەکانیش ئەمەش لەزۆر حالەتدا دەسەلاتدارەکانی دەولەت نیگەران دەکا ، هەروەها ئەتنۆگرافیا زۆر بەئاشکرایی و بەتوندیەوە دژایەتی شۆڤێنیزم و رەگەز پەرستی دەکات بۆیە بەهیچ جۆرێك ئەتنۆگرافیا لەسیاسەت جیاناکرێتەوە .

هەروەکو باس کرا رەسەنی میللەتان بابەتێکی گرینگی ئەتنۆگرافیایە ، مەسەلەی رەسەن و دروست بوونی میللەتێك و مێژووی کۆن و تازەی پرۆسێسێکی ئاسایی و راست و رەوان نی یە ، هەروەها جێگاو کاتی تایبەتی و دیارکراوی نی یە بەلکو ئەمە پرۆسێسێکی دوورو درێژو پڕ لەگۆڕان و زۆر کۆن و کەلەبەری تاریکی تێدایە کەئەبێ روون بکرێنەوە .

ئەم پرۆسێسە (عملية) بەزاراوەی ئەتنۆگرافیا پێی دەگوترێ (مێژووی ئەتنیکی میللەتان) لەوماوە دوورو درێژەی مێژووی ئەتنیکی میللەتاندا کەلێ ئال و گۆڕو شتی وا روئەدەن کەتەنها بەچاو پێداخشاندنێك مرۆڤ سەریان لێ دەر ناکات بۆ نموونە : لەزەمانی کۆندا فەرەنساییەکان بەیەکێك لەزمانەکانی کیلتی[8] قسەیان دەکرد کەچی بەکارتێ کردنی رۆمانیەکان زمانی رۆمانیان وەرگرت و ئێستاش زمانی فەرەنسی یەکێکە لەگروپەی رۆمانی سەر بەخێزانی زمانە هیندۆئەوروپاییەکان . ئازربایجانەکان بەیەکێك لەزمانە ئێرانی یەکان دەپەیڤین ، بەلام بەهۆی شەپۆلی یەك لەدوای یەکی قەومە ئەلتاییەکانەوە[9] زمانێکی سەربەگروپەی تورکی یان بەسەردا سەپێنرا . قەومە کۆنەکانی زاگرۆس (گووتی ، لۆلۆبی ، کاسی)بەزمانە زاگرۆسی یەکان دەئاخاوتن ، کە میدی و فارسەکان لەسەدەی نۆیەمی پ . ز . لەرۆژهەلاتەوە بۆ رۆژئاوای ئێران کۆچیان کردو لەوێدا نیشتەجێ بوون زمانە

ئێرانی‌یەکان بەسەر ئەم ناوچانەدا زاڵ‌بوون‌و زمانە زاگرۆسی‌یەکان وون بوون نەك هەر زمان بگرە ناوی میللەتانیش (ئەتنۆنیم) ئاڵ‌و گۆڕیان بەسەرداێ بۆ نموونە : فەرەنسایی‌یەکان ناویان (گال) بوو ، بەڵام پاش ئەوەی فەڕەنگەکان ــ کەخێلێکی جێرمانی بوون وولاتی گالیان داگیرکرد ، ناوی گاڵ لەناوچووو فەڕەنگ مایەوە ، بولگارەکان میللەتێکی سلاڤین ، بەڵام ناوی خێلێکی تورکی‌یان بەسەرساغ بوویەوە کەلەسەدەی حەوتەمی زاینی ئەم وولاتەیان داگیرکرد ، بولگارەکان ئەم ناوەیان وەرگرت کەچی خۆیان‌و زمانیان وەکو سلاڤیمانەوە [10] . بەپێچەوانەشِ جاری وابوە ناوی میللەتێکی ژێرکەوتوو زاڵ‌بووە بۆنموونە : پروسی‌یەکان میللەتێکی بالتێکی [11] بوون‌و لەسەر کەناری خوارووی ڕۆژهەلاتی دەریای بەڵتیك دەژیان کەئەلەمانەکان لەسەدەی دوازدەمدا پروسیایان داگیرکرد پروسی‌یەکان لەناوچوون یاخود بەتەواوەتی توانەوە کەچی دەوڵەتی ئەلەمانەکان ناوی پروسیان بەمیرات بۆ مایەوە . سلاڤی‌یەکانی خواروو لەسەدەی شەشەمدا بەرەو مەکدۆنیا کۆچیان کرد . مەکدۆنی‌یەکان سلاڤی نەبوون ، بەڵام بەتەواوەتی لەناو ئەم سلاڤیانەدا توانەوەو کەچی ناوی مەکدۆنیا هەتا ئیمڕۆش هەرماوەو بەسەر سلاڤیەکاندا چەسپیوە ، لێرەدا بێ بایەخ نی‌یە گەر بڵێین زمانی مەکدۆنی‌یە کۆنەکان هیچ پەیوەندی بەزمانە سلاڤی‌یەکانەوە ـ کەئێستا زمانی مەکدۆنی یەکێکە لەوان ــ نەبووە . بەم جۆرە ئەتنۆگرافیا هەموو جۆرەگۆڕانێك یازیادو کەمی‌یەك کەبەسەر مەرجە ئەتنۆگرافیی‌یەکانی میللەتاندا دێت دەرئەخات‌و هۆیە کاریگەرەکانی ئەخاتە ڕوو .

هەروەها لەڕێڕەوی مێژووی ئەتنیکی میللەتانەوە بەرە بەرە بەرەو پێش چوونی کۆمەڵگاکان ڕووئەدا . لەچەرخی دوایی قۆناخی مس‌شاعی‌دا یەکێتی هۆزەکان پێك دێن ئەو دەورەش واتا دەوری یەکێتی هۆزەکان [12] بەدەورێکی ناوەندی دەژمێردرێت لەبەینی کۆمەڵگای بێ چین‌و کۆمەڵگای چینداروو بەیەکەم بناغەی دروست بوونی دەوڵەت دائەنرێ . کاردۆخەکان بەپێی زانیاریەکانی زەینەفۆن لەساڵی (٤٠١پ ، ز

دا یەکێتی هۆزەکانیان هەبوو چونکە وەکو زەینەفون باسی ئەکات لەگوندو شاری جیاجیاو دوور لەیەك ئەژیان ، بە لەکاتی شەڕدا هەموویان پێکەوە هێرشیان دەبرد وا کاردۆخەکان لەکۆمەڵگای چیندار نزیك ببوونەوە . لەگ پچڕانی یەکێتی هۆزەکان‌و نەمانی پەیوەندی خێڵایەتی میللە (قەوم) دروست بوون ، بەڵام ئەمەیان لەکۆمەڵگای چیندار واتا قۆناغەکانی کۆیلایەتی‌و دەرەبەگی‌دا . لەچەرخی ئێستا زۆر جۆری میللەت هەن کەسەر بەقۆناغی مێژوویی جیاجیا وەکو میللەتی قۆناغی دەرەبەگی (فیودالی) ، میللەتی قۆناغ سەرمایەداری‌و میللەتی سۆشیالیستی [13] . ئینجا لەئەنجام پەرەسەندنی پەیوەندنی سەرمایەداری نەتەوە (الامة) گە دائەنێ‌و نەتەوەش دوو جۆری هەیە : سەرمایەداری سۆشیالیستی کەلەبارەی ئابووری‌و پەیوەندی کۆمەلایەتی ئە دوو نەتەوەیە جیاوازی زۆر هەیە ، ئەم کۆمەڵگایانە لەسە بناعەی هەر پەیوەندیێك بن (خێلایەتی ، فیودالی سەرمایەداری ، سۆشیالیستی)نیشانەو ئاسەوار پەیوەندی‌یەکانی دەوری پێشووتریان تیا بەدی ئەکر کەبەرەبەرە ڕەوو نەمان ئەچن ئینجا نیشانە پەیوەندی‌یەکانی دەوری پاشتریان تێدا دەرئەکەوێ .

لێکۆلینەوە لەهەیکەلی کۆمەلایەتی کۆمەڵگای بێ چ لایەنێکی گرینگی ئەتنۆگرافیایە لەبەر ئەوەی زۆربەی میللەتا کۆن نووسینیان نەبووەو هیچ ئاسەوارێکی نووسراویا نەگەیشتۆتە ئەمڕۆ ، ئەرخیۆلۆگیاش شتی مردوو ئەدۆزێتە کەلەسەر ڕۆشنایی‌یانەوە ئەتوانرێ تەنها دەست نیشا کولتوری مادی‌و ئابووری میللەتانی کۆن بکرێت بۆیە تەن ئەتنۆگرافیا توانی پەردە لەسەر جۆری ژیانی کۆمەلایە ئادەمیزادی کۆن لابدات وەکو : دەسەلاتداریەتی ئافرە (مەتریارخات) جۆری خێزان‌و چۆنیەتی پێك هاتنی ، هەیکە دەسەلاتداریەتی ، ماف‌و یاساو زاکۆنەکانی کۆمەلگا ب چینەکان . ئەم جۆرە زانیاریانە وەگیرکەوتن چونکە تا ڕۆژ ئەمڕۆش لەزۆر شوێنا ئاسەواری کۆمەڵگای بێ چین ما (لەئوستralia ، ئەمەریکا ، ئەفریقیا) ئەتنۆگرافی ئەمەریک

لویس هینری مۆرگان ۱۸۱۸ ـ ۱۸۸۱ لەکاتی لێکۆڵینەوەکانیا دەربارەی خێڵە هیندیەکانی ئەمەریکا توانی چەند دەورێکی قۆناغی ژیانی کۆنی ئادەمیزاد دیاریکات وەکو دەوری دروندەییو دەوری بەربەری، هەروەها چۆنیەتی دروست بوونی خێزانو خێڵو هۆزەکانی روونکردەوە . فریدریك ئەنجلس سوودی زۆری لەزانیاریەکانی مۆرگان وەرگرت

لەکتێبەکەیدا (رەسەنی خێزان ، مولکیەتو دەوڵەت)ئەمیش زانیاری تازەی زۆری خستە سەر زانیاریەکانی مۆرگان ، بەلام ئەمەش هەروا بە ئاسایی نابێت . پاشماوەی ژیانی کۆن کە لە لایەن میللەتە دواکەوتووەکانی ئێستاماینەوە دەقاودەق ژیانی ئادەمیزادی کۆن ناگەیەنێ هەموو نموونەیەك بۆ هەموو بارودۆخێك نابێت بۆیە بەکارهێنانی ئەم جۆرە مەتریالانە ئەبێ بە ئەو پەری ئاگاداریەوە بێتو ئەبێ زۆر بە وریایی رەچاوی باری جوگرافیو مێژوویی و ئەنترۆپۆلۆگی وگەلێ لایەنی تر بکرێت هەر بۆیەش هەتاکو ئێستا ئەتنۆگرافیا تووشی گەلێ تەنگەو چەلەمەوە دەمەتەقێ بووەو زۆر شتیش هێشتا بەتەواوەتی ساغ نەبووینەوە .

پرۆسێسی ئەتنیکی واتا ئەو ئاڵو گۆڕانەی کەلەئەنجامی پەیوەندیو تێکەڵاوی بەینی میللەتانەوە روو ئەدات ، پرۆسێسسێکی هەمیشە هەر بەردەوامەو پەیوەندیو کۆنتاکتی هەمیشەیی لەبەینی میللەتاندا ئەم پرۆسێسە ئاو ئەدەن ، جالەبەر ئەوەی لەهەموو جیهاندا گۆڕانو بەرەو پێش چوون بەردەوامەو هەر بەردەوامیش ئەبێ بۆیە دەوری ئەتنۆگرافیا هەر ئەبێو ئەشمێنێ ، پرۆسێسی ئەتنیکی لەچەرخی ئێستادا بەتایبەتی لەوولاتە فرە نەتەوەکاندا زۆر گرینگە واتا لەو شوێنانەی کەنزیکیو تێکەڵاوی بەهێز لەبەینی میللەتاندا ئەبنە رێ خۆشکەرێك بۆ دروست بوونی کۆمەڵێکی ئەتنیکی تازەو گەورەتر ... یا بە ووتەیەکی تر یەك گرتنی (یەك بوونی) چەند میللەتێکی بچووكو پێکهاتنی نەتەوەیەکی تازە . لەداغستاندا هەتا پێش ماوەیەکی نزیك زیاتر لە ۳۰ میللەت ئەژیان ، بەلام ئەم ژمارەیەبەرەبەرە ئەوا کەم ئەبێتەوە ، لەناوچە شاخاویەکانی

تاجیکستانی سۆڤیەتیش بەهەمان جۆر ، لەئەندۆنیسیادا بەدەیەها میللەتی گەورەو بچووك ئەژین ، کەچی ئەوا پرۆسێسی دروست بوونی نەتەوەیەکی گەورە روونەدات وزمانی (مالایی)ئەوا خەریکە هەموو ووڵاتەکە ئەگرێتەوە ، ئەتوانین هەمان راش دەربارەی هیندستانو گەلێ ووڵاتی تریش دەرببرین ئەبێ ئەوەش بڵێین کەوا ئەتنۆگرافیا نەمانی میللەتانو دروست بوونی تازە پەسەند دەکات تەنها ئەگەر لەرێگەی پرۆسیسێکی ئاساییو بێ زۆرو ستەمکاری بێت ئەگینا ناویان بهێنێت رەگەز پەرستیو شۆڤێنیزم . دیراسەکردنی ئەم جۆرە دیاردانەی چەرخی ئێستا بایەخێکی زۆریان هەیە چونکە دروست بوونی میللەتو نەتەوەی تازە لەبەر چاوی خۆماندا روونەدات .

● **ئەتنۆگرافیای کوردی :**

لەووڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەراستدا هەروەکو لەهەموو ووڵاتانی جیهانی سێیەم ئەتنۆگرافیا تا ئێستا نەبۆتە زانستێکی سەربەخۆی خاوەن بنکەو تیۆرێی تایبەتی ، بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کەوا لەم ووڵاتانەدا دیراسەو لێکۆڵینەوەی ئەتنۆگرافی نین چونکە مەیدانی ئەتنۆگرافیا گەلێ فراوانە کەلایەنی مێژووییو ژیانی مادیو گیانی میللەتان ئەگرێتەوە ، بۆیە ئەتوانین بەسەدان لێکۆڵینەوە دەستنیشان بکەین کەبشێن بەناوی (کاری ئەتنۆگرافی)ناو ببرێن ، بەلام کەمو کوڕی ئەم کارەئەتنۆگرافیانە لەوەدایە کەبناغەیەکی تیۆریان نیەو لەلایەن دەزگا یا قوتابخانەیەکی ئەتنۆگرافی پسپۆرەوە سەرپەرشتی نەکراوون کە رێرەوێکی روونو ئاشکرایان پێ ببەخشێ .

ئەکرێ هەمان رایش بەرامبەر بەئەتنۆگرافیای کوردی دەرببرین ، مەتریالی ئەتنۆگرافی زۆر لەمێژە ئەوا لەکوردستاندا لەخۆیەوە (واتابەجۆرێکی عەفەوی) کۆئەبێتەوە . سەدەی هەڤدەم ئەتوانین بەسەرەتای سەرهەڵدانی ئەتنۆگرافیای کوردی دابنێین ، ئەحمەدی خانی مەزن

١٦٥٠ ـ ١٧٠٧له(مەم‌و زین)دا زۆر وەستایانە باسی گەلی لایەنی ئەتنۆگرافیی کوردەواری ئەو دەمەی کردووە وەکو : ڕاوکردن ، زەماوەند ، پرسەو جەژنی نەورۆز ، هەروەها باسی جل‌و بەرگ‌و خواردن‌و گەلێ خووڕەوشتی سەردەمی خۆی کردووە .

لەسەدەی نۆزدەمدا مەلا مەحموودی بایەزیدی ١٧٩٧ ـ ١٨٥٨ بەکارێکی ئەتنۆگرافی زۆر بەنرخ هەلساوە لەکتێبەکەیدا(عادات‌و رسوماتنامەئی ئەکرادیە)کەلەسالی ١٩٦٣دا چاپ کراوە ، ١٩٠٦ خووڕەوشت‌و عاداتی کوردی باس کردووە . م مێژوونووسی هێژا محمد امین زەکی بەگ ١٨٨٠ ـ ١٩٤٨ یەکەم کوردەکەلەکتێبەکەیدا (خلاصەیەکی تأریخی کوردو کوردوستان ـ بەرگی یەکەم ـ ١٩٣١)زۆر زانستیانە هەولی داوە مەسەلەی (ئەتنۆگنێزی کورد) واتا پرۆسیسی دروست بوونی میللەتی کورد ڕوون بکاتەوەو تا ڕادەیەکی زۆریش سەرکەوتوو بووە ، هەروەها مامۆستا حوسێن حوزنی موکریانی ئەمیش لەوبارەیەوە واتا لەمەسەلەی ئەتنۆگنێز ـ شیری خۆی وەشاندووە . لە کتێبەکەیدا (کوردستانی موکریان ـ ئاترۆپاتین)١٩٣٨باسی ئاترۆپاتین‌و دەستووروو زمانیان ، لۆلۆ ، گووتی ، کاسی ، ماد ، کاردۆخ .. هتد ئەکات . مامۆستا سالح قەفتانیش لە(مێژووی گەلی کورد لەکۆنەوە تائیمرۆ) ١٩٦٩هەمان هەولی داوە . خزمەتەکانی مامۆستا عەلائەدین سەجادی بۆ ئەتنۆگرافیای کوردی گەلێ بەهادارن‌و لەژماردن نایەن ، هەر لە(گەشتێک لەکوردستاندا ـ ١٩٥٦و هەموو بەرگەکانی ڕشتەی مرواری کەبەرگی یەکەمی لە١٩٥٧دا دەرچووەو کتێبی(کوردەواری)١٩٧٤پڕن لەمەتریالی ئەتنۆگرافی‌و کەلەپووری کوردی ، هەروەها گەشتەکانی مامۆستا شاکیر فەتاح ئەتنۆگرافیای کوردیان دەولەمەند کردووە ،

گەشتی شارباژێر ١٩٧٢ ، گەشتی سرۆچک ، گەشتی پێنجوین ، گەشتی هەلەبجەو هەورامان ـ ١٩٧٣ ، یەزیدیەکان‌و ئاینی یەزیدی ١٩٦٩ جگە لەمانەش ئەو کارە ئەتنۆگرافیانەش کە بەپێی ئاگاداری ئێمە تاکو ئێستاکە هەن هەندێکیان لێ دەستنیشان ئەکەین : د . عیزەدین مستەفا رەسول ، ئەدەبی فولکلۆری کوردی ١٩٧٠و هەروەها ئەو ئەفسانەو داستانە کوردیانەی کە لە گۆفارەکاندا بلاوی کردۆتەوە ،شێخ محەمەدی خال پەندی پێشینان چ١ ـ ١٩٥٧ چ١ ـ ١٩٧١ محەممەد توفیق وردی ، فولکلۆری کوردی ١٩٦١چ٢ ،محەمەدی مەلاکەریم ، کۆمەلێک لاوک‌و حەیران ١٩٦٨ ، سالح عەلی سالح ، فولکلۆرو یاری‌و وەرزشی کورد ١٩٧٤ . ئەمانەو گەلێ کاری ئەتنۆگرافی تریش هەن ، بەلام بەداخەوە لەتوانادا نەبوو هەموویان تۆماربکەین . ئەوەی شایانی دلخۆشی‌و شانازی‌یە لەماوەی دواییدا هیچ گۆفارێکی کوردی دەرناچێت بێ ئەوەی ووتارێک یا چەند ووتارێکی ئەتنۆگرافی تیانەبێت ئەمەش خۆی لەخۆیدا دەست‌و بردێکی گەلێ پیرۆزە بۆ پاراستنی کەلەپووری نەتەوەییمان‌و خزمەتێکی گەورەی ئەتنۆگرافیای کوردی‌یە[١٤] .

لەکۆتاییدا ئەبێ دەوری زاناو ڕۆشنبیرەکوردەسۆفیەتی‌یەکانیش لەم بارەیەوە لەبیرنەکرێ ، ئەو بەرهەمانەی ئەوان گەلێ بەنرخ‌و بایەخیان زۆرە بەتایبەتی زانایان قەناتی کوردۆیف ، عەرەبی شەمۆ ، حاجی جوندی ، ئۆردیخانی جەلیل‌و ، جەلیلی جەلیل ، ئەمینێ عەفدال‌و نوری جەواری‌و ... هتد . بەرهەمە ئەتنۆگرافیە هەرە بەرچاوەکانیان ئەمانەن :حاجی جوندی‌و ئەمینێ عەفدال (فولکلۆرا کرمانجا)١٩٣١ . حاجی جوندی(کلامێ جماعەتا کورمانجا)١٩٣٦ . حاجی جوندی (فولکلۆرا کرمانجا)١٩٥٧ . نوری جەواری(کلامێد جماعەتا کوردا)١٩٦٠ . نوری جەواری(کلامێد جماعەتاکوردایی یا گوفەندە)١٩٦٤ . ئۆردیخانی جەلیل (دلۆکێت جماعەتا کوردا)١٩٦٤ . ئۆردیخانێ جەلیل‌و جەلیلی جەلیل (زارگۆتنا کوردا)١٩٧٨چ١ ـ چ٢ . ق . کوردۆ ـ م ـ ڕۆدینکۆ ، ع . شەمۆ ، ئێ . تسوکەرمان (گۆرانی‌و حیکاتێد کوردی)١٩٦٩ . ع . شەمۆ (قەلای دمدم )١٩٧٤و گەلێکی تریش .

پەراوێزەکان :

١ ـ لەئەتنۆگرافیادا مەبەست لەووشەی (میللەت)ئەو کۆمەڵە خەڵکەن کەبەهۆی نیشانەو ماکی تایبەتی‌یەوە لەیەك جیادەکرێنەوە ، جالەهەر قۆناغێکی پێشکەوتندا بن(خێڵایەتی ، کۆیلایەتی ، دەرەبەگی ، سەرمایەداری ، سۆشیالیستی) .

(٢) ـ کولتوری مادی ـ هەمووشتێکی مادی‌و دەستکردی میللی وەکو : جلو بەرگ ، خانوو ، خواردن ، ئامێری ئیش کردن ، ئامێری هاتووچۆ(ترانسپۆرت)کردن‌و ... هتد .

(٣) ـ کولتوری گیانی ـ ئاین ، بیروباوەڕ ، خووڕەوشت ، جەژن ، زەماوەند ، پرسە ... هتد.

(٤) ـ وەکو : Peopleی ئینگلیزی ، Volk ئەڵەمانی‌و Narodی روسی .

(٥) ـ دیارە کەکۆمەڵانی خەڵك هەن هەتا ڕۆژی ئیمڕۆش هەر لەقۆناغی مەشاعیدا دەژین .

(٦) ـ مەبەست زانستی مێژووی گشتی‌یە .

(٧) ـ زانستی ئەنترۆپۆلۆگیا هەتاکو ئێستا سێ ڕەگەزی لەنێوان میللەتانی جیهاندا دیاری کردووە : ڕەگەزی مەنگۆلی (مەغۆلی) ، ڕەگەزی ئەوروپی‌و ڕەگەزی زنجی‌هەندێ جارانیش دوو ڕەگەزی تریشیان ئەخەنە سەر : ڕەگەزی ئوسترالی کەلەزنجییەکان جیای دەکەنەوەو ڕەگەزی ئەمەریکی کەلەمەغۆلیەکانەوە جیائەکرێتەوە .

(٨) ـ زمانەکانی کیلتی گروپەزمانێکن سەربەخێزانی زمانی هیندۆ ئەوروپایین ، ئەم گروپە زمانانەش ئەمانەن : بریتۆنی ، ئێرلاندی ، وێلزی .

(٩) ـ خێزانی زمانە ئەڵتاییەکان ، لەم گروپەزمانانە پێك هاتووە : گروپی تورکی ، گروپی مەنگۆلی ، گروپی تونگوس‌و مەنشوری . هەر یەکێك لەم گروپانەش بۆسەر چەند زمانێك دابەش دەبن .

(١٠) ـ سلاڤیەکان لەبارەی زمانەوە گروپەیەکی زمانە هیندۆ ئەوروپایین ، لەو زمانانە پێك هاتووە : روسی ، ئۆکرانی ، بێلەڕوسی ، پۆلۆنی ، چیکی ، سلوڤانی ، بولغاری ، سربی ، خەرواتی ، مەکدۆنی‌و زمانەکانی یۆغسلاڤیا .

(١١) ـ گروپە زمانی باڵتیکی هەر سەر بەزمانە هیندۆ ئەوروپاییەکانەوەیەو پێك هاتووە لەزمانەکانی لاتڤی‌و لیتۆنی .

(١٢) ـ هەروەها دەوری دیموکراتی جەنگی(الدیمقراطیة الحربیة)ی پێ دەگوترێ .

(١٣) ـ میللەتی سۆشیالیستی ـ مەبەست لەو میللەتانەیە کەبەبێ ئەوەی بگەنە قۆناغی سەرمایەداری یەکسەر لەدەرەبەگی‌یەوە بەرەو سۆشیالزم چووینە یا ئەچن‌و جارێ نەبوون بەنەتەوە وەکو : مەنغۆلیا ، قەومەکانی ڤێتنام‌و داغستان .. هتد .

(١٤) ـ سەیری ڕۆشنبیری نوێ ژ . ٨٣ ـ ١٩٨١ د . جمال ڕەشید چەمکی کوردو کرمانج لەمێژوودا . د . شوکریە ڕەسول ـ ڕۆڵی فۆلکلۆری کوردی لەدیاری کردنی ڕووداوی مێژوویی‌دا ـ هەمان سەرچاوە . هەروەها ڕۆشنبیری نوێ ژ . (٩٨) ـ ١٩٨٣ د . جمال ڕەشید ، دەوری کەرتیان لەمێژووی کورداو نزیکەی هەموو ژمارە دواییەکانی گۆڤاری کاروان .

سەرچاوەکان :


١ ـ گ . مارکۆڤ ، ئەتنۆگرافیا . مۆسکۆ ١٩٨٢ ـ روسی .

٢ : یو . برەملێی ، کورتەی تیوریای ئەتنوس . مۆسکۆ ١٩٨٣ ـ روسی .

٣ ـ یو . برەملێی ، ئەتنوس لەکۆمەڵگای بێ چین‌و کۆمەڵگای چینداری زوو . مۆسکۆ ١٩٨٢ . بەزمانی روسی .

٤ ـ ب . پوتیلوف . فۆلکلۆرو ئەتنۆگرافیا ١٩٨٤مۆسکۆ بەڕوسی .

٥ ـ س . کالتاخکیان ، تیوریای مارکسیزم ـ لینینیزم دەربارەی نەتەوەو چەرخی ئێستا . مۆسکۆ ١٩٨٣ روسی .

٦ ـ کەمال مەزهەر . مێژوو . بغداد ـ ١٩٨٣ .

٧ ـ د . عیزەدین مستەفا ڕەسول ، ئەحمەدی خانی (شاعرا و مفکرا و فیلسوفا و متصوفا) . بغداد ١٩٧٩ .

٨ ـ ئەریمان ، مستەفا سەید ئەحمەد ، بیبلۆگرافیای کتێبی کوردی ١٧٨٧ ـ ١٩٧٥ ، بەغدا ١٩٧٧ .

دکتور عبدالکریم محمدعلی

# نەخۆشی یە هاوبەشەکانی گیانەوەرو ئادەمیزاد

## Zoonotic Diseases (Zoonosis)

**سەرەتا** : ـ پەیوەندی لە نێوان ئادەمیزادو گیانەوەر هەر لە کۆنەوە هەبووە ، ئەم پەیوەندیەش تاکو ئەمرۆ هەر بەردەوامە ، چونکە ئادەمیزاد خواردن‌و خۆراك بە دەست دێنێت (شیرو بەرهەمەکانی شیر) لە هەندێ لە گیانەوەران « حیوانات » Animals وەك مانگا ، مەڕ ، بزن‌و حوشتر بەلام جۆرێکی‌تر هەیە لە گیانەوەران ، بەکاردێن بۆ گەشت ، گواستنەوەو سواریی . ئەسپ‌و ماین هەر لە دێر زەمانەوە ، جوان‌و خۆشەویست‌و ناسراوبووە ، مێژوی دورو درێژی لە پاڵەوان‌بازی ، سوارچاکی ، ڕاوو ڕاوچی بە خۆیەوە بەستوە .

گیانەوەرە ووردەکان Small animals و باڵندەکان ئەمانیش ڕۆڵی خۆیان هەبووەو پەیوەندیان هەر نەبڕاوە لە گەڵ ئادەمیزاد ، بە دەگمەن ئەگەر وا ڕێك کەوتبێ لە ماڵێکدا پشیلەیەك یا سەگێك یان باڵندەیەك نەبێت ، یاخود مەڕ یان بزن یان ئاسکێك نەبێت ، بویە تاکو ئێستا ئەم پەیوەندیە هەر ماوە لە زۆربەی خێزانەکانی گشت وولاتانی جیهان . ئەم پەیوەندیەی نێوان گیانەوەرو ئادەمیزاد ، هەر چەندە کە کەلك‌و سودو قازانجی هەیە ، بەلام زیانیشی هەیە !! ئەگەر هاتو ئەم پەیوەندیە بە شێوەیەکی ڕاست‌و دروست چاودێری نەکرا ، چونکە کۆمەڵێ دەردو نەخۆشی هەیە کە دەگواسترێنەوە (دەڕوات) لە گیانەوەرە وە بۆ ئادەمیزاد ، ئەم جۆرە نەخۆشی‌یە پێی دەوترێ (نەخۆشی‌یە هاوبەشەکان) Zoonotic Diseases لەنێوان گیانەوەرو ئادەمیزاد ، کە تاکو ئێستا زیاتر لە دووسەد نەخۆشی هاوبەش زانراوە .

***پەیوەندی ئادەمیزادو گیانەوەر*** : ـ ئادەمیزاد ، بە گوێرەی پەیوەندی‌و تێکەڵبوونیان لە گەڵ گیانەوەرو بەرهەمەکانی گیانەوەر دەکرێن بە سێ بەشەوە : ـ

**یەکەم** : ـ ئەو کەسانەن کە ژیان‌و پیشەیان پێویست دەکات کە لە گیانەوەر دانەبڕێن ، وەك شوان‌و گاوان کە بە شەو ڕۆژ بە دوای ئاوو لەوەڕدا وێڵن‌و پارێزگاری ڕانەکانیان ، دەکەن‌و تێکەلاوی ساغ‌و ناساغیان دەبن ، بۆیە لەم گیانەوەرانەوە توشی دەردو نەخۆشی دەبن ، هەروەها پزیشکە گشتی‌یەکان Physician ، پزیشکەکانی گیانەوەر Vetrinerian ئەوانەی کە لە تاقیگە Labratories و لە کێڵگەکاندا کار دەکەن زۆر جار دووچاری دەردو نەخۆشی هاوبەش دەبن ، چونکە لە گیانەوەرو بەرهەمەکانی گیانەوەر نزیك دەبنەوە .

**دووەم** : ـ ئەو کەسانەن کە کرێکارن لە قەسابخانەو کارگەی گۆشت‌و شیرو بەرهەمەکانی شیر ، یان ئەوانەی لە کارگەی پێست (دەباخانە) کاردەکەن ، لەوانەیە توشی نەخۆشی ببن بە هۆی ئەو برین‌و ڕوشانەی کە لەسەر پێستی دەست‌و دەموچاویان هەیە ، بۆیە ئەم میکرۆبانە دەچێتە لەشیانەوە بە نزیکبوونەوە یان هەڵگرتن‌و دانانی گیانەوەری نەخۆش ، هەر وەها لە ڕێی هەناسەدانەوە ئەم میکرۆبانە دەچێتە لەشیانەوە ، وەك کە توشی ئەو کرێکارانە دەبێت کە لە کارگەی (خوریی جیاکردنەوە لە پێست) کار دەکەن ، چونکە ئەم جۆرە خوریی‌یە لە وانەیە کیسەلەی Spores (سپۆرات) نەخۆشی (ڕەژوەتا) ی بە سەرەوەبێت ، بۆیە توشی نەخۆشی (خوریی جیاکردنەوە) Wool sorter disease دەبن‌و سینەیان (سنگیان) هەو دەکات .

**سێیەم** : ـ ئەو کەسانەن کە دانشتوی شارو پایتەختەکانن ،



توشی نەخـۆشی‌یە هـاوبەشـەکان دەبن ، بـە هۆی خـواردن‌و خواردنەوەی بەرهەمەکانی گیانەوەر وەك خـواردنی گۆشت ، شیر ، پەنیرو کەرە ، یـان خواردنی سـەوزە Vegetables کە لە لادێوە دێت بۆ شارو لەوانـەیە بـە پاشـەڕۆك (أفرازات) ی گیانەوەری نەخۆشەوە پیس‌بووبێت ، هەر وەها ئەم کەسـانە ـەوانەیە توشی نەخۆشی هاوبەش ببن لەو گیانەوەرانەی کە لە ماڵەوە ڕایی‌دەگرن‌و پەروەردەی دەکەن بۆجوانی وەك پشیلە ، سـەگ‌و باڵندەکان Pet animals گیانەوەری هار Raboid animal (واتە کە توشی نەخۆشی هاریی‌بوو) وەك سەگ‌و پشیلەی هار ، ئەمانە ـۆر جێی مەترسین بۆ هەمو ئەندامانی ئەو خێزانە بە تایبەتی منال چونکە زیاتر لە گەڵ ئەم جۆرە گیانەوەرانە یاریی دەکەن‌و ـمیگرنە باوەش‌و لە تەکیا دەخەون .

ـۆر جار منالان توشی نەخۆشی دەبن ، کە کرم Worms لە لەشیاندا پەیدا دەبێت ، بە تایبـەتی کرمی ئسکـارس Ascarsis ، لە ڕێی ـممەوە بیگومان ، هەندێ لە (کێچ) ی Fleas ئەم گیانەوەرانە قووت دەدەن‌و دەچێتە گەدەیانـەوە ، وەك کێچی Pulex Irritans ئەمیش بە زۆری گەرایی (هێلکە) ova کرمە لولەکێکانی Round worm پێوەلکاوە ، کە پێی دەوترێ تۆکساکاراکینز Toxacara canis ـە سەگداو پێی دەوترێ تۆکساکاراکاتی Toxa cara cati پشیلەدا .

ـەخۆشی ترسناکی‌تر هەیە کە لە باڵندە جوانەکانی ناو مـاڵەوە ـەگواستریتـەوە بۆ ئـادەمیزاد وەك نـەخۆشی ئـۆرنیسۆسس Ornithoses ئـەمیش زۆر ترسنـاك‌و کوشنـدەیە ، نیشـانەکـانی Symptoms نـەخۆشی نـاو براو لە بـاڵنـدەی تـوش‌بـوودا بـەم جۆرەیە : ـ کەم بوونەوەی جموجۆڵ‌و چالاکی ، کەم خۆراکی Loss of appetite سك‌چوون ، ڕەوانی ، Diarhea ، ئاو بەدەم‌و لوتیا ـمچۆڕێتەوە .

**جۆرەکانی نەخۆشی‌یە هاوبەشەکان :ـ**

نەخۆشی‌یە هاوبەشەکان ، بە گـوێرەی زیـانیان کـە تەنیـا بۆ گیانەوەرە یان بۆ ئادەمیزادە یاخود زیانیان بۆ هەر دوو لایـە ـەکرێنە سێ بەشەوە (مەبەستمان لە زیان لێرەدا توش‌بوون بە نەخۆشی‌یە) : ـ

**بـەشی یەکـەم :** ـ ئەو دەردو نـەخۆشیـانەی کـە زیـان بـە ئادەمیزادو گیانەوەر دەگەێنن وەکو یەك ، بۆ نمونە : ـ دەردە

هاریی یان نەخۆشی هاریی Rabise یاخود پێی دەوترێ نەخۆشی لە ئـاوترسـان Hydrophobia . میکرۆبی ئـەم دەردە ڤـایـرۆسێکی کوشندەیە شێوەیەکی پێچاوپێچی Helical (حلزۆنی) هەیە ، بە هۆی گەستنەوە bite ، گیانەوەری تووش‌بوو گاز لە ئادەمیزاد بگرێت ، یان پیس بوونی برین‌و ڕووشانی لەش بە لیکاوی Saliva گیانەوەری نەخۆش ئەم ڤایرۆسە دەگواسترێتەوە بۆ ئادەمیزادو لە ڕێی دەمارەوە Nerve دەڕوات بۆ مێشـك‌و ئادەمیـزاد بەرەو مردن دەبات . مـەترسی دەردەهـاریی لەوەدایە ، کـە ئەگـەر نیشانەکانی دەرکەوت ئیتر هیچ جۆرە چارەسەری بۆ نیـە لە سەگی هاردا نیشـانەکـانی Symptoms ئەم دەردە بـە تەواوی دەردەکەوێت بە دوو شێوە : ـ

**شێوەی یەکەم :** پێی دەوترێ شێوەی هێمن Dumby form لەم شێوەیەدا ، نیشانەکان لەوەوە دەست پێ دەکات کە گیانەوەر خواردن‌و خواردنـەوە ڕەت دەکاتـەوەو لێی دوور دەبێتەوە ، گۆشەگیر دەبێت‌و خۆی لە شوێنی تاریکدا دەشارێتەوە ، لەڕو لاواز دەبـێت ، لیـکـاو Saliva بـەردەوام بـە دەم‌و لووتـیـا دەچۆڕێتەوە ، ڕیپۆق بەلا چاوەکانیـا ووشك دەبێتـەوەو ڕەق دەبێت ، لە کۆتایدا ماسـولکەکـانی Muscles دەم‌و چاوی ڕەق دەبێت ، بێ ئاگا دەبێت Loss of consiousness و بە مردن ژیـانی کۆتایی دێت .

**شێوەی دووەم :** ـ پێی دەوترێ شێوەی دڕو دژوار Furious form لەم شێـوەیەدا ، دەبینـین ئەو سـەگە جـوانە بـەنـازە خۆشەویستە ، خوو ڕەوشتی دەگۆڕێت ، هار دەبێت ، بە هەمو شتێك دەوەڕێت ، دەم بۆ هەمو شتێك دەبات ، تـەنانـەت بە خاوەنەکەشی دەوەڕێت لە کاتێکدا کە خـواردنی بۆ دەبـات ، وەڕین‌و حـەپین‌و نـوزەنوز تێکـەڵ دەکـات‌و ووزەو تـوانـایی نامێنێت ، حەز لە هاوڕێیەتی ئادەمیزاد ناکات ، لیکاو بە دەم‌و لوتیا دەچۆڕێتەوە ، ماسولکەکانی دەم‌و چاوی ڕەق دەبێت ، لە

کۆتایدا لەشی رەق دەبێت ، بێ هۆش دەبێت و دەمرێت ، زۆر جار رویداوە کە سەگە هار مردوەو لە ناو دەمیا بەردێك پارچە دارێك یان پارچە وایەرێك دۆزراوەتەوە ، ئەمیش وەکو باسکرا کە لەکاتی هاریدا ئەم گیانەوەرە دەم بـۆ گشت شتێك دەبات .

نیشـانـەکـانی نـەخـۆشی هـاریی لە ئـادەمیـزادا بـەوە دەست پێـدەکات ، کـە نەخـۆش بـە بـارو دۆخێکی دەرونیـا تێدەپەڕێ ، دەترسێ بەلام خۆشی نازانێ لەچی دەترسێ و بۆچی دەترسێ ، ژانە سەری Headache تونـدو تیژی تـوش دەبێت ، خواردنی پێ ناخورێ « ئارەزووی لە خواردن نامێنێت » حەزیە رشانەوە دەکات ، ناو قـورگی (گەرویی) دەکـزێتەوە ، پلەی گەرمی لەشی بەرز دەبێتەوە (1 — 3 پلەی فەهرەنهایتی) . ئەو نیشـانانـەی symptoms کە یـارمەتـین بۆ دەست نیشـانکردنی Diagnosis ئەم نەخۆشی یە ئەوەیە کە شوێنی گەستنەکە Site of bite دەست بە خوراندن دەکات و هەستیاری بەرز دەبێتەوە Hyper sensitivity نیشانەکانی تر کە بە هۆی کار لەسەرکردنی دەماری سـەمـبـسـاوی‌وە Sympathatic Nerve رو دەدات وەك لیـکـاو هاتنەخـوارەوە بەخێـرایی هەنـاسەدان ، دوایی نـەخۆش وا هەست دەکات کە زۆر بەگران دەتوانێ شت قوت بدات ، لە ئاو دەترسێ Hydro phobia (ئەمیش لە کـاتێکدا کـە ئاو دەخـواتەوە دەنگی دێ کـە دەچێتـە خـوارەوە) ، لە دواییـدا هـەنـدێ جولانەوەی نائاسـایی روو دەدات ، شپرزەیی واله نـەخۆش دەکات کە هۆشی لەلای خۆی نەمێنێ ، بێ هۆش دەکـەوێت و دەمرێت .

نمونەی دووەم ، لەو نەخۆشی یانەی کـە زیانی زۆر بـە گیانەوەرو ئادەمیزاد دەگەیێنن ، نەخۆشی (رەژوەتا) یە Anthrax « الحمیٰ الفحمیة » بەلام لە ئادەمیزادا ئەم نەخـۆشی یە پێی دەڵێن (پشکۆچەپـەڵی) « الجمرة الخبیثـة » Malegnant pastules ،میکروبی ئەم نەخۆشی یە بەکتـریایی چلکـەیی یە Bacillus کـە دەتوانێت کیسەلە بکات و Spores بەرگری لە خۆی بکات لە گشت ئاوو هەوایەکدا بژیت ، دەتوانێ بیست ساڵ لەناو خاك و خۆڵدا بمێنێتەوە ، بۆیە جێگای مەترسی یە لە لەوەرگایی گیانەوەراندا ، رەژوەتا دەناسرێت بەوەی کە گەرمایی لەشی گیانـەوەر بەرز دەبێتەوە (تا) ی لێدێت و یەکسەر بۆ ماوەیەکی زۆر کەم ئەم گیانەوەرە دەمرێت (مردنی کوتوپڕ) Sudden death خۆین لە لەشی دێتە دەرەوە ، خوێنی دەم و لوتی بەردەبێت ، خوێنێکی رەش وەك رەژو (خـەلوز) بۆیـە ناوی ئـەم نەخـۆشی یە بـەم جۆرە ووتراوە ، هەروەها ووشەی (ئـەنسراکس) Anthrax بـەواتایی رەژوە لە لاتینیدا .

ئادەمیزاد توشی نەخۆشی (پشکۆ چەپەڵی) دەبێت ، ئەگەر هاتو لەشی (بە تایبـەتی دەست و پێی) برینی پێـوەبوو یـان شەق شەق و روشابوو Abraded بەر لەشی گیانەوەری نەخۆش کەوت ئەوا توش دەبێت ، یان بە بەکارهێنانی شتومەك کە لە بەرهەمی گیانەوەر دروست کرابێ وەك فلچەی تەراش یان زینی ماین کە لە پێستی گیانەوەرێك دروست کرابێت بەم دەردە مردبێت .

نمونەی سێیەم ، نەخۆشی (وەرەم) « (سیل) « Tuberculosis کە زیان لە گیانەوەرو ئادەمیزاد دەدات ، ئادەمیزاد توش دەبێت لە رێی هەناسەدانەوە ، یان خواردنەوەی شیری مانگای نەخۆش « بە تایبەتی کە هەندێ کەس دەیدەن بە منال ئـەگەر دایـك شیری کەم بوو » کە توشی گوانی Udder مانگا دەبێت ، یانیش خواردنی گۆشتی گیانەوەر کە توشی ئەم دەردە دەبێت (ئەگەر گۆشتەکەی باش نەکولێنرا) .

بـەشی دووەم : ـ ئەو دەردو نـەخۆشی‌یـانەی کـە زیان بـە ئادەمیزاد دەگەیێنن ، وەك (تا) گەڕانەوە Undulant fever ئەمیش بە هۆی بەکتریایی تایبەتەوە (بروسیلا) Brucella abortus تـوشی ئادەمیزاد دەبێت، ئەم میکروبە دەچێتە لەشی ئادەمیزادەوە لە رێی نزیك بوونەوە لە پاشەڕۆکی گیانەوەری نـەخۆش ، یـان خواردنەوەی شیرەکەی ، ئەم بەکتریایە توانای ئەوەی هەیە کە بچێتە لەشی ئادەمیـزادەوە بێ ئەوەی هیـچ برین و روشـانێك لەسەر پێستی لەشدا هەبێت ، نیشانەی ئەم نەخۆشی یە ئەوەیە کـە ئادەمیـزاد جاروبـار (تا) ی لێـدێت دوایی (تا) یـەکەی دەڕوات ، لە پـاشان (تـا) یەکـەی دەگەڕێتـەوە . چـەشنێ میکروبی (بەکتریا) ی تر هەیە کە سەر بەم پۆلەن Species from Same Genus و دەبنە هۆی لەبارچون (بەراوێژە یان بەراویتـە) Abortion لە بزندا ، ئەم نەخۆشی یە لە ئادەمیزادا ناسـراوە بە نەخۆشی (تا) ی مالتا Malta fever چونکە بۆ یەکەم جار لە مالتا ئەم نەخۆشی یە زانراو دۆزرایەوە .

بەشی سێیەم : ـ ئەو دەردو نەخۆشی یانەی کە تەنها زیان لە گیـانـەوەر دەدات وەك نـەخـۆشی نیـوکـاسـل Newcastle کـە

ـەخۆشی یـەکی درمی کوشنـدەی تونـدو تیـژە لە بـاڵنـدەدا ، مریشك و جوجەڵە ، هۆیەکەشی ڤایرۆسێکی تایبەتیە .
ئەو کرێکارە کشتوکاڵیانەی کە لەم مەیدانەدا کار دەکەن ، زۆر لەم دەردە دەترسن ، نەك دەترسن لەوەی کە خۆیان توشی ئەم نەخۆشی یە ببن ، بەڵکو لەوە دەترسن ئەگەر هاتو تـوشی ڕەوە مریشك و جوجەڵە بوو ئەوا پـاکی دەکاتـەوەو هیچی نایـەڵێت بەساغی ، بەسەر یەکا مرداریان دەکاتەوە ، پێش ئەوەی ئەم دەردە بـڵاو بێتەوە لە نـاو ڕەوە مریشکی هێلکـەکەردا (ئـەو مریشکانەی هێلکە دەکەن) ئەوا یـەکسەر لە هێلکـە دەچنەوە ڕێژەی هێلکە کردنیان کەم دەکاتەوە ) ئەمیش نیشانەیەکـەو بـانگـەوازێکـە بـۆ هـاتنی ئـەم گـەردەلولە دەردە بـۆ ڕەوە مریشکەکان .
ئەم دەردە هەرچـەندە زیـان بەخشـە بە بـاڵندەکـان ، بەلام ئادەمیزاد توشی ئەم نەخۆشی یە نابێت ، تەنها ئەوە نەبێت کە بەدەگمەن ئـەگەر ڕووبـدات کرێکـارێك تـوشی نەخـۆشی چاو هاتبێت ، نەخۆش چاوی سورو خویناوی دەبێت و چلك دەکات ، بەلام ئەم ڕوودانە زۆر کەمە ، وە ئەگەر هاتو ڕویدا ئەوا لەکاتی بەرپا بوونی هێرشی ئەم دەردەیا دەبێت .
**خۆپاراستن** : ـ دوای ئەوەی کە زۆر بەکورتی باسی پەیوەندی ئـادەمیزادو گیـانەوەرمـانکـردو جـۆرەکـانی نـەخـۆشی یـە هاوبەشەکانمان خستە پێش چاو ، ئەمەوێ باسی ئەو ڕێگا باش و دوروستانە بکەم کە چۆن ئادەمیزاد خۆی و خێزانی بپارێزێت لەو دەردو نەخۆشی یە هاوبەشانەوتا ڕادەیەك ئادەمیزاد بتوانێ ئەم نەخۆشی یانە لە ناو بەرێت و دەستی بەسەرا بگرێت : ـ

ئەو کەسانەی کە بە زۆری پەیوەندیان بە گیانەوەرەوە هەیە ، دەبێ ئامۆژگاری تەندورستی بە تەواوی ڕچاو بکەن و زوو بەزوو کاربەدەستانی تەندورستی ئاگادار بکەن ئەگەر هاتو دەردێك یان نەخۆشێك بڵاوبۆوە یاخود هەر هەستیان پێ کرد .
ئەو گیانەوەرەی کە مرداردەبێتەوە Dead animal دەبێ زوو بەزوو بسـوتێنرێت و لە شـوێنێکی دوور لەژێر خـاکا بشـاردرێتەوەو شوێنی مردنەکەشی بە دەرمانی خاوێن کەری بەهێز Disinfectants بشـۆردرێت ، لەم ماددانـە سوودەی کـاوی یـە Caustic soda و فۆرمالین Formalin زۆر بە سودە . کوتینی Vaccination ڕێك و پێك بۆ هەندێ لەو نەخۆشیانە وەك کوتین بە پێکوتی Vaccine ڕەژوەتاو دروستکـردنی شوێنی گلدانـەوەی تەنـدروستی Qurantine بۆ ئەوەی گیانەوەری نەخۆشی تیا گلەوە بدرێ و ئەوەی کـە چاك نابێتەوە لە ناو بدرێت . هەر وەها فـەحسی تاقیگـە Lab . Exam بکرێت بۆ گیانەوەران بۆ ئەوەی باش دەردەکان بدۆزرێنەوە ، لەشی ئـەو گیانـەوەرانەی کـە نەخـۆشی یان پێـوەیـەو بـەلام نیشانەکانی دەر نەکەوتوە Carriers دەبێ تاقی بکرێتـەوە Tested ئەم تاقی کردنەوانە بۆ نەخۆشی برۆسیلا Brucella و نەخۆشی سیل Tubercullosis دەکرێت وەك تاقی کردنەوەی تیـوبرکلین Tuberculin test . ئەو گیانەوەرانەی کـە لە ناو مـاڵدا ڕادەگیرێن ، دەبێ هەمیشە پاك و خاوێن ڕابگیرێن ، دەبێ بە بەردەوامی بشۆرێن و زەهری تایبەتی بکرێ بەسەر لەشیانا (ئەم جۆرە زەهرە نابێ زیانی هەبێ بۆ گیانەوەرو ئادەمیزاد) وەك (گاماتۆکس) Gamatox ئەمیش لەبەر هەمەکانی (گاماتۆکسین) ە Gamatoxin بۆ ئەوەی گشت گەنەو Ticks کێچ Fleas لەناو بەرێت .
کوتینی ڕێکوپێك بۆ سەگ و پشیلە دژی دەردە هاریی بە پێکوتی تایبەتی گیانەوەرەکان دەبێ پیشانی پزیشکی گیانەوەر بدرێت لە کاتی هەستکردن بە نەخۆشی منـاڵەکان دەبێ هـەموکـات وافێربکرێن کە هەر دەستیاندا بە گیانەوەرانی نـاو ماڵ بچن دەستیان پاك بە سابوون بشۆن بۆ ئەوەی دوور بکەونەوە لە گشت نەخۆشی یەك .

## سەرچاوەکان : References


(1) Infectious diseases , Lec . by Dr . M . A . yhia , College of Vet medicine , B .U , 1977

(2) Animal hygeine , Lec . by Dr . A .B . Karam , College of Vet medicine , B . U . 1976

(3) Merck Vet . manual , 4th ed . 1974

(4) Meat hygeine , hec , by Dr . B , M , AL — meery , college of medical vet . B . U 1976 .

(5) Milk hygeine , Lec , by Dr . K . S . AL . Ashmawe , College of vet medicine , B . U 1976 .

(6) Viral diseases , Lect . by Dr . F . A . Banna , College of Vet medicine B . U . 1977 .

(7) Merck manual , 13 th ed . 1976 .

(8) ژمارە (148) گۆڤاری العربي 1971 .

# دیاردەی قژهەڵوەران و چەند روونکردنەوەیەك

مظفر رفیق محمد امین کۆلیجی پزیشکی

هەڵوەرانی قژ Alopecia بریتیە لە وەرین و کەم بوونەوە یاخۆ تەنك بوونی مووی سەر . ئەم دیاردەیە لە سەدەکانی پێشوودا زۆر کەم بووەو ئەو کەسەی تووشی ببوایە بە غەزەب لێگیراوو نەفرەت لێکراو لە لایەن خواوە لە قەڵەم ئەدرا بۆیە ناویان لێ ئەنا کەچەڵ (الاقرع) . بەڵام لەم سەردەمەی ئێستاماندا تا رادەیەکی زۆر تەشەنەی کردووەو خەڵکێکی زۆر دووچاری ئەبن هەر بۆیەش ووشەی کەچەڵ لە هەموو کات و شوێنێکدا بەکارنایێت . هەر ئەم تەشەنەکردنەش وای لەزانایانی پزیشکی و پێست کردوە بکەونە دوای لێکۆڵینەوەو دۆزینەوەی هۆیەکانی .

**هۆیەکانی قژ هەڵوەران :**

پرچ وەرین لە (3) سێ تیۆریدا بەم جۆرە هۆکەی لێك درایەوە :
یەکەم تیۆری ، ئەیوت نەمانی قژ نەخۆشی یەکی بۆماوەیی (وراثی) یە و نەخۆشی بۆماوەییش چارەسەری نیە .
تیۆری دووەم ، هەڵوەرانی قژی ئەبەستەوە بەکەم بوونی هۆرمۆنی سێکسی . بەڵام تیۆری سێیەم ئەیوت کە گوایە ئەم دیاردەیە تەنیا نیشانەیەکی پیری و زووپیربوونەو بەردەوام ئەبێ تا کۆتایی ژیان .
ئەم (3) تیۆری یە چەسپێنران ، هەرچەندە بەرهەمی لێکۆڵینەوەو هەوڵدانێکی زۆریش نەبوون بەڵام لەگەڵ ئەم (3) سێ تیۆری یە رەش بینەش تا ئێستا پزیشکی ی میللی و گەلێ هەولی لابەلای تریش خۆیان پێوە خەریك کردووەو بگرە هەندێك ئەنجامی باشیشیان وەدەست هێناوە .

پزیشکەکان بۆ زیاتر روون کردنەوەو دۆزینەوەی هۆیەکانی پرچ وەرین ، دیراسەتێکی توێکاری (التشریحی) و کارئەندام زانی (فسیۆلۆجی) پێستی سەریان کردووەو لێیان کۆڵیوەتەوە .

ئەوەی ئاشکرایە قژ بەزۆری لە ناوچەی تەپلی سەر Vertex وەپشتی سەر هەڵئەوەرێ وەدەگمەن نەبێ لە ناوچەی سەرووپشتی مل Occipta وە سەرووی گوێکان (ناوچەی جنوکێ Temporal) هەڵناوەرێت .

ئەگەر لە رووی توێکاری یەوە سەیر بکەین ئەبینین ئەو دوو بەشەی یەکەم بەرزترین شوێنن لە لەشدا ، وەهەروەها هیچ ماسولکەیەکیشیان لە ژێردا نیە بەپێچەوانەی ئەو شوێنانەی کە قژیان تیا هەڵناوەرێ دەبینین کە هەریەکەیان ماسولکەیەکی بەهێزی لەژێرە . وە ماسوولکەش بەهۆی کرژبوونەوەو خاوبوونەوەوە خوێنێکی زۆری تێئەچێ بەم جۆرە بەهۆی جوولەی ئەم ماسولکانەوە خوێن زیاتر ئەچێ بۆ ئەم بەشانەی پێستی سەر وە بە هۆیەوە خواردن و ڤیتامیناتیش زیاتر ئەبردرێن بۆ سەلکە مووەکانی Hair Follicle ناوکەولی سەر لەم شوێنانەدا ، کە ئەبێتە هۆی زیاتر گەشەکردن و هەڵنەوەرانیان . بە پێچەوانەوە تەپلی سەروو پشتی سەر هیچ ماسولکەیەکیان لە

زیر نیە بۆیە جووڵەش لەم دوو شوێنەدا کەمەو خوێنیاز
ـەرێژەیەکی کەمتر بۆ ئەچێ لە ناوچەکانی تری کـا
ـسمان‌کرد . لەلایەکی تریشەوە سەر کە بەرزترین شوێنە
ـەلەشدا بۆیە هێزی ڕاکێشانی زەوی کارئەکاتە سەر چوونی
خوێن بۆ سەرو خوێنەکەش بە هێواشی دەچێ بۆ کەوڵی سەر
ومبە پێچەوانەشەوە بە تیژی بەرەو دڵ ئەگەڕێتەوە ، بۆیە
خانەکانی سەلکە مووەکان لەو کەسانەی کە جموجۆڵیان کەمەو
ێش ناکەن‌و هیچ جۆرە وەرزشێکیش ناکەن ئەو دەرفەتەیان
ـابێ کە خواردن‌و ڤیتامینی پێویست بەتەواوی لە خوێن
وەربگرن وە بە باشی گەشەبکەن .

وەهەر کارکەر (Factor) ێکی تریش کاربکاتە سەر سوڕانی خوێن
ـیمانەوە کاریگەری‌ی ئەبێ بۆ نموونە کەم خوێنی .

ئەمە لەلایەنی توێکاری‌و سوڕانی خوێنەوە لەلایەکی تریشەوە
خۆراکی پێویست ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە پاراستنی قژ لە
هەڵوەران .. هەر خانەیەك لە لەش‌دا پێویستی بە ماددەی
تایبەتی خۆی هەیە ، بۆئەوەی بە باشی گەشە بکات‌و پارێزگاری
خۆی بکات ، بۆ نموونە خانەکانی ئێسك‌و ددان پێویستیان بە
فۆسفۆرو ڤیتامینی D هەیە هەر بەم جۆرەش خانەکانی قژ
پێویستیان بە هەندێك ماددەی تایبەتی وەکو پرۆتین‌و ڤیتامینی C
هەیە . زانیاری‌ی نوێ Recent Data نیشانی‌داوە کە کەموکوڕی
ـە ماددەی ئاسن لە لەشدا دیسانەوە دەبێتە هۆی ڕووتانەوەی
سەر . وەبەبەڵگەی زۆر سەلمێنراوە کە ڤیتامینی C کارئەکاتە
سەر گەشەی قژو چڕی‌یەکەی زیاد ئەکات بە پێچەوانەی
ڤیتامینی A کە ئەگەر بەرێژەیەکی زۆر بخورێت دەبێتە هۆی
هەڵوەران لەقژدا .

هەندێك نەخۆشی هەن وەکو گرانەتاو مەلاریا نەخۆشەکە تووشی
قژ هەڵوارنێکی کاتی‌ی ئەکەن بەلام لە ماوەی ساڵێك‌دا قژەکە
گەشە ئەکاتەوەو دەچێتەوە باری ئاسایی خۆی .

لەلایەکی ترەوە بەکارهێنانی تیشکی ئێکس بۆ هەر مەبەستێك
بێ چارەسەرکردن یاخود دەست نیشان‌کردن (التشخيص)
بۆسەر ڕەنگە ببێتە هۆی قەلاچۆبوونی قژ . پێویستە ئەوەش
بلێین کە لە دوای تەقینەوەی دوو بۆمباکەی هیرۆشیماو
ناگازاکی لە جەنگی دووەمی جیهانیدا بەشێکی زۆری خەڵکی

ئەم دوو شارە لەوانەی کە نەمردبوون تووشی قژ هەڵوەران
بوون .

ژیانی نوێش لەگەڵ هەموو پێشکەوتن‌و بەرەو پێشەوە
چوونێکیدا ئاڵۆز بووەو مرۆڤی خستۆتە دوودڵی نارەحەتیەوە .
خوێنەکانی دەماخ‌و کەوڵی سەر پەیدا ئەکەن ، وە ئەم
شێوانەش وائەکات کە خوێن‌و خۆراك بە شێوەیەکی ناڕێك‌وپێك
بگاتە خانەکانی مێشك‌و هەروەها خانەکانی قژیش دوابەدوای
ئەوەش قژ لاوازبێ‌و هەڵبوەرێت . لەهۆش خۆچوونیش هەمان
کاریگەری‌ی هەیە چونکە لە کاتی بێ‌هۆشیدا لوولە خوێنەکانی
کەوڵی سەر دیسانەوە تووشی تەسك بوونەوەو شێوان ئەبن .

تۆشك Dandruff کە بریتیە لە پێکهێنانی
خانەی مردووی پوولەکەیی لە سەر پێستی سەر وە هەندێك جار
بە هاوبەشی هەندێك بە کتیریای وەکو ستافیلۆکۆکەی staphe
lococcus ئەبێتە هۆی خورانی پێستی سەر وە هەڵوەرانێکی بلاو
لەقژدا . ئەم تۆشکە چارەسەرئەکرێ بە بەکارهێنانی هەندێك
شامپۆی تایبەتی کە پزیشك ئەیاننووسێ وە هەندێك
چارەسەری‌ی میللیشی هەیە وەکو بەکارهێنانی ترشی سالسلیك
Salicylic Acid وە ڕۆنی فۆسفۆر بە هاوبەشی لەگەڵ شامپۆدا .
وەتۆشکە سەر چارەسەری‌ی تریشی هەیە کە لێرەدا ماوەی
باسکردنیان نیە .

ڕۆڵی بۆماوە تارادەیەك دیارە لە دووچاربوون بە
قژهەڵوەران بەلام ئەو دەوروبەرەی کە باوك تیایدا ئەژی ڕەنگە
جیاواز بێ لەو دەوروبەرەی کە کوڕەکەی تیایا ئەژی بۆیە
بۆماوە مەرجێکی بنەڕەتی نیە بۆ قژهەڵوەران ، تەنیا لە بارێك‌دا
نەبێ کە کوڕ هەمان دەوروبەری باوکی کاری تێبکات . کاری
هۆرمۆنەکان تابلێی ئاڵۆزە . هۆرمۆنی تێستۆستیرۆن کە بریتیە
لە هۆرمۆنی سێکسی لە پیاواندا هانی دروست بوونی ڕیش‌و
سمێڵ ئەدات لە هەمان کات‌دا کاریگەری‌یەکی پێچەوانەی
لەسەر قژی سەر هەیەو هانی وەرینی ئەدات وەکو ئەبینین
مرۆڤە خەساوەکان (الخصيان) بە هۆی نەبوونی ئەو هۆمۆنەوە



به هیچ جۆرێك قژیان هەڵناوەرێت و لە هەمان کاتیشدا ریش و سمێلیان لێ دروست نابێ . هەندێك لە زانایان بە پێچەوانەوە کەم بوونی هۆرمۆنی سێکسی ئەبەستنەوە بە وەرینی قژ وەهەندێکیان دەوری هۆرمۆن پووچەڵ ئەکەنەوە . هەرچۆنێك بێت کاری هۆرمۆنات تا رادەیەکی زۆر ئاڵۆزە لە مەسەلەی قژ وەریندا .

مرۆڤی پێست سپی بە رێژەی چوار ئەوەندە زیاتر لە مرۆڤی پێست رەش تووشی ئەم دیاردەیە ئەبن . گەلە سەرەتاییەکان بۆ نموونە ئۆسترالیەکان بە هیچ جۆرێك تووشی ئەم گیروگرفتە نابن ، ئەمەش بۆی هەیە پەیوەندی بە ژیانە ساکارەکەیانەوە هەبێ ، کاتێ کە بەبێ هیچ دوودڵییەك بە درێژایی رۆژگار لەبەر خۆرەتاو لە ناو کێڵگەکانا کار ئەکەن .

بەکارهێنانی هیپارین و چارەسەرکردن بە دەرمانەکانی دژ بە نەخۆشی شێرپەنجە ئەبن بەهۆی وون بوونی مووی سەر . دیسانەوە خواردنی هەندێك ماددەی ژەهراوی وەکو ثالیوم ، قەسدیر Tin وە زەرنیخ وە زیاد خواردنی ڤیتامینی A هەمان ئەنجامیان هەیە .

تائێستا روون بۆتەوە کە تاقە هۆیەك زۆر جار بەتەنیا نابێتە هۆی وەرینی قژ ، بەڵکو چەند کارکەرێك لەمانە یارمەتی یەکتر ئەدەن بۆ لاواز کردن و وەرینی قژ . بۆ نموونە پیاوێکی دوودڵ و نارەحەت (هۆیەکەی هەرچیبێ) تۆشکی لەسەردا هەیە و لەهەمان کاتیشدا تووشی کەم خوێنی بووە ، بۆی هەیە لە ماوەیەکی کەمدا تووشی ئەم گیروگرفتە بێت ئەگەر بەلایەنی کەمەوە دوان لەم کارکەرانە چارەسەر نەکات .

هەندێك جۆری قژهەڵوەرانمان هەیە کە هۆیەکانیان بەشێوەیەکی تایبەتی دەست نیشان کراوە وەکو :

**یەکەم :**

قژ هەڵوەرانی ئاسایی Common Baldness ئەمە لە پیاواندا لەدوای قۆناغی پێگەیشتنی سێکسیدا رووئەدات دوای رژاندنی هۆرمۆنی نێرینە Androgen ئەمە تا رادەیەك ئاساییە ئەگەر تەنها لە سەرووی ناوچەوانەوە لەملاو لەولادابێت ، بەلام هەندێك جار هەموو قژی تەپڵی سەر دێتە خوارەوە لەم بارەدا ئەتوانرێ بە رێگەی نەشتەرگەری مووی سەروو پشتی مل هەڵبگیرێ و لە ناوچە رووتاوەکەدا بچێنرێ بە مەرجێك مووی سەروو پشتی مل هێشتاچڕو سەلکە مووەکان توانای ژیانەوەیان هەبێ .

**دووەم :**

قژ هەڵوەرانی زگماك Congenital Alopecia : ئەمە بریتیە لە نەبوونی قژ لەو منداڵەی تازە لە دایك ئەبێ یاخود قژەکە زۆر تەنك ئەبێ ، ئەم جۆرە زۆر جار لەگەڵ هەندێك باری نائاسایی تری لەشدا پەیوەندی هەیە .

**سێیەم :**

قژ هەڵوەرانی پەڵە پەڵە Alopecia Areata ئەمە بە زۆری لە منداڵ و گەنجان رووئەدات وە رەنگە لە گەڵ چەند نەخۆشییەك پەیوەندی هەبێ وەکو کەم خوێنی Anemia وەزیاد رژاندنی هۆرمۆنی ثایرۆکسین کە دەبێتە هۆی ژەهراوی بوون Thyrotoxicosis ئەم جۆرەیان یەکەم جار بە قەوارەی چەند سانتیمەترێك دیارئەکەوێ دوای ئەوە هەموو سەر ئەگرێتەوە وەبۆی هەیە هەموو لەش تووش ببێ Universal Alopecia لەم جۆرەدا بەزۆری دوای شەش تا نۆ مانگ قژی نوێ جێگەی قژە کەوتوەکان ئەگرنەوە .

**چوارەم :**

تەنك بوونی قژ Diffuse hair loss : بریتیە لە هەڵوەرانی ناوەناوە (بڵاو) ، لە ئافرەتاندا رووئەدات لە کاتی سکپڕی یاخود دوای منداڵبوون هەروەها بە بەکارهێنانی حەبی سکنەبوون . هەر چۆنێك بێت قژ لەم حاڵەتەدا بەیەکجاری هەڵناوەرێ بەڵکو تەنك ئەبێ . وێنەی١

**پێنجەم :**

هەندێك کەس لە ئەنجامی زۆر بەکارهێنانی هۆیەکانی جوانکردن (التجمیل) وەکو بەکارهێنانی ماددەی کیمیاوی بەکارهێنانی گەرمی بۆ ووشك کردنەوەوە هەر هۆیەکیتر کە بۆ لووسکردنی قژی لوول بەکاربهێنرێ قژیان هەڵئەوەرێت .

**چارەسەرکردن :**

زانستی پزیشکی تا ئێستا نەیتوانیوە لە بنج و بناوانەوە

ـرمەری ئـەم دەردە بکات . چـارەسەرکـردن تا ئێستـا ـمستوەتە سەر ئەرکی تاکە کەسی و خۆپاراستن و بەکارهێنانی هەـیك داوو دەرمانی میللی .

کتێ کە قژ هەڵئەوەریٚ خانەکانی سەلکەمووەکان بەیەکجاری ـ ـوناچن بەڵکو لاوازو بیٚهێز ئەبن و داوە قژە ئەستورەکان ـوکی (زغابات) یەکجار بچووك جێگایان ئەگرنەوە کە بەچاو ـبینرێن . ئینجا ئەو کـەسەی کـە قژی وەریـوە لە ڕاستیدا ـوومکانی قژی ماون بەڵام ئەوەندە لاواز بوونەتەوە کە بە چاو هەستیان پیٚناکریٚ . پزیشکی میللی تائێستـا هەوڵی داوە بـۆ ـهێزکردنەوەی ئەو تووکە لاوازانە .

ئەلکهول کاتێ کە بەسەر شوێنێکدا ئەکریٚ خێرا ئەبیٚ بە هەـم وە ئەو گەرمی‌یەی کە پێویستی ئەبیٚ بۆ بوونە هـەڵم لە ـشەوە وەریئەگریٚ . ئەم دیاردەیە سوودی لیٚوەرئەگیرێت بە ـەکارهێنـانی ئەم مـاددەیە بـەخەستی 90 — 96٪ بـۆ شێلانی ـنلیك) پێستی سەر زۆر بە توندی وە بۆ ماوەیەکی زۆر تاکو ـستی سەر سوور هەڵئەگەرێت (پێویستە ئاگاداری ئەوەبـین ـچێتە چاوەوە) ئەم کردارە دەبێتە هۆی تەسـك بوونـەوەی موولوولە خوێنەکانی کەوڵی سەر بۆ ماوەیەکی کەم وەدوای ئەوە ـراوان بوونیـان بۆ مـاوەیەکی زۆر . ئـەم فراوان بـوونەش هـەروەکو بـاسمان کـرد ئەبێتـە هۆی بـردنی بڕێکی زۆر لە خواردن و ڤیتامینات بۆ سەلکە مووەکان . بەهەمان شێوە ڕۆنی ـمیتوون بەکارئەهێنـریٚ . هەروەهـا بەکـارهێنانی سیـریش ـثوم) سوودێکی زۆری هەیە . هەندێـك لە پاکستـانیەکـان هەموو ساڵێك ماوەی یەك مانگ سەریان بـە سیر ئـەشێلن بە وردوخـاش‌کردنی سیـرەکە لە سـەر سەر بـۆ بەهێـزکردن و پاراستنی قژ لە هەڵوەران .

ئەگەر یەکێك بیەوێت سوود لە سیر وەربگریٚ بۆ ئەم مەبەستە ئەوا 3 — 4 سەلکە سیر زۆر بە توندی بە شوێنە ڕووتـاوەکەدا ئـەخشێنیٚ تاکـو وردوخاش ئـەبن وەشوێنـەکەیـان سـوور هەڵئەگەرێت ، ئەمە ئەبیٚ بـەلایەنی کـەمەوە ڕۆژیٚ دووجـار دووبارە بکرێتەوە (بۆنە ناخۆشەکەی سیر دوای بەکارهێنـانی ئـەتوانـرێت لاببردریٚ بـە بەکـارهێنانی هـەنـدێـك سپـرای بۆن لابەر) .

بەکارهێنانی ئەم مـاددانە بـە یەکـەوە لەگەڵ جـۆرێکی وا لە وەرزش کە خوێن بە ڕێژەیەکی زۆر ببات بـۆ سەر لە مـاوەی ساڵێکدا ڕەنگە کاری خۆیان بکەن . لە وێنەی (2) دا ئەبینین ئەو پیاوە دوای ئەوەی تووشی قژ وەرینێکی تەواو بووە Complete hair loss بە بەکارهێنانی ئەم ماددانەو وەرزشێکی زۆر لە ماوەی دوو ساڵدا لە تەمەنی حەفتاوسیٚ ساڵیدا قژی بەم جۆرە هاتۆتەوە .

خۆراکی هەمەجۆر باشترین ڕێگەیە بۆ وەدەست هێنانی بڕی پێویست لە ووزەو ڤیتامینات ، ئەمەش نەك تـەنیا قـژ بەڵکـو هەموو لەش سوودی لیٚوەرئەگریٚ ، وەکو ووتـراوە (خۆراکی هەمەجۆر بریتیە لە دەرمانی هەمەجۆر) .

بەکارهێنانی هەندێك خواردنەوەی گیانی وەکو عەرەق و ویسکی کاریگەریەکی بەکەڵکی بۆ سەر قژ هەیە بەهۆی فراوان‌کردنی لوولە خوێنەکانی کەوڵی سـەر بەڵام لەبـەرئەوەی ئـەم جۆرە خواردنەوانە دەبن بە هـۆی زۆر نەخـۆشی کوشنـدەتر لە قـژ هەڵوەران ئەگەر بە بەردەوامی بەکاربهێنرێن . لەم نەخۆشی‌یانە شیٚبوونەوەو بە مۆم بوونی جگەر (انحـلال و تشمع الکبـد) ، نەمانی تەرکیز لە بیرکردنەوەدا ، شێرپەنجە .. هتد بۆیـە زۆر خواردنەوەی ئەمانە زیانی لە قازانجی زیاترەو بەهیچ جۆرێك بۆ مەبەستی چارەسەرکردن بەکارناهێنرێن .

لەمانەی باسمان کرد ڕوون‌بووەوە کـە چارەسـەرکردنی قـژ وەرین بە بەکارهێنانی هەندێك دەرمان و شروب نابڕێتەوە ، ئەم چارەکردنە جوزئیانەش کە باسمان کرد تەنها شتێکی وەرگیراوە لە پـزیشکی میللی و ئەوەستێتـە سـەر هـەوڵی تـاکـە کـەسی و ماندووبوون و ئارام‌گرتنێکی زۆر .

## تیٚبینی :


بۆ نووسینەوەی ئەم باسە سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتوە ..

1 — پـەرتـووکـی ROXBURGH'S COMMON SKINDISEASES FOURTEENTH EDITION — PETER BORRLE

2 — پـەرتووکی (الطب ینتصر عـلی الصلع) دانانی د . ملحم حسن مطبعة دار العلم للملایین 1981 .

3 — گۆڤاری MEDICINE INTERNATIONAl VOLUME 1 Number 28 April 1983

فۆلکلۆر

● احمد شادی ●

# شیعرێکی فۆلکلۆری

زۆر بەسەرهات و کارەسات و ڕووداوی خۆش خۆش بەرگوێمان دەکەوێت ، وە فرە بەسەرهاتی کاریگەرو دڵ تەزێنیشمان وەمێشک دەکەوێت ـ ناوچەی کوردەواریمان گە لێك دەوڵەمەندە .. هەر شیوو دۆڵێ بگرین ، ڕووداوێکی دیاردەی پێوە نەخشاوە . پڕن لە داستان و خۆشەویستی نەمر .. بن هەموو دار بەروویەك ، سەر هەموو کانیاوێك ، ژێر گشت ڕەشماڵ و خێڵێك ئەولاو لای تاشە بەردان ، نێو ڕەزو مەزراو دەرماڵێك ، وەدەنگ دێن و بەڵگەی ڕاستەقینەت دەست نیشان دەکەن . دیمەن و نەخش و نیگارەکانی هێندە سەرنج ڕاکێشن ، هێندە جوان و ڕازاوەن ، بوونەتە پەرستگای خۆشەویستی . گەلی کورد وەك هەموو گەلانی سەر ڕووی زەمین خاوەنی ئاکارو خورەوشتێکی تایبەتی خۆی بووە . هەمیشەو ، هەمیشە ئاشتی خوازو پاك بووە ، سەر تروپکی گەلێك لەو عەشقە پاکانە بووە . نمونەی ئەوانەش زۆرن وەك [شیرین ، فەرهاد . مەم ، زین . لاس ، خەزاڵ . وەلی ، شەم .. هتد ..]

ئەوانە بەڵگەیەکی تەواوی خۆشەویستی ڕەسەنن ، خۆشەویستی پاك و پاراون .. بەداخەوە !! زوربەی زۆری نەماون و لە نێوچوون ، ئەوەش کەم تەرخەمی خۆمانە کە پشت گوێمان خستوون . ئێمەش دەڵێین سروشتی جوگرافیا هۆیەکی سەرەکیە بۆ لەنێوچوونیان لە فولکلۆردا . بەلام ئەگەر بێتوو هەریەك لە خوێندەواران و ڕۆشنبیران بگەڕێن بە دوای ئەو بەرهەمە نایابانە چ دەبێت ؟ ! بیاماندوبین !! کە لەپوری کۆن زیندو بکەنەوە ، فولکلۆرەکەیان وەدۆزن ...

زۆر ڕاستە هەرگەلێك فۆلکلۆرەکەی دیاربێ و زیندو و بێت خاوەنی مێژویەکی بێ پایانە . فولکلۆر سەرچاوە یەکە مێژوی گەلێك وەخۆی دەگرێ ـ فولکلۆر ئاوێنەیەکە خوت و گەڵ و نیشتمانی تێدا دەبینی . تاڵی و سوێری ، خۆشی و شادی هەست پێ دەکەی و دەیبینی . (ئەوەی دنکە گەنمێك بچێنێ ، چلە گەنمێ دەدرویتەوە) لە هەر شوێنێك بێت فولکلۆرو کەلەپوور زیندو بکەیەوە ئەوا لاپەڕەیەك لە مێژو زیاد دەبێ و بەرەو پێشەوە دەچێت ...

ئەو گفتو گۆیەش نمونەیەکی ساکارن لە خۆشەویستی لە نێوان شۆڕە لاوو کیژۆڵەی نازکدا ، هیچ سەیر نی یە لە نێو کوردەواریماندا ، لە کۆنەوە تا ئێستا کە خاوەنی لاوی شاعیربێت واتە زۆر زۆربێ .. باللۆرەو لاووك و حەیران هێجگار باو بوون . شعری دڵداری و خۆشەویستیان هۆنیوەتەوە . بەدەنگێکی خۆش بەسەر یەکتریان هەڵداوە سروشتە جوانەکەی فێری خۆشەویستی پاکی کردوون ، بە عەشقی پاك پەروەردەی کردوون ...

ئەمەش نمونەیەکە .

«کوڕ» هەر دەڕۆم و دەناڵم
کۆترێکی پێ بە خاڵم
لە دو بالات عەودالم

«کچ» هەر دەڕۆم شاخەو شاخە
کراسی بەرم شیرداخە
کاکم زۆر لێ بەداخە

«کوڕ» هەر دەڕۆم و دەگریمە
کۆترێکی پێ سپیمە

له دو بالآت شەقیمە(2)

کچ: دەڕۆم .. له حەوایە
دەدروم شینە گیایە
له بۆ ئەسپی برایە
ئەسپی برام ئاو دایە
کوتکولەم(3) لێ وەرگەڕایە
کاکیم له منی دایە
من چی بکەم چیم خەتایە ؟ !!

کوڕ: باغی یاری خۆم شیناو شین دەچێ
جۆگەلەی ئاوێی بە بن‌دا دەچێ
یارم منداڵەو بە سەفەر دەچێ

کچ: بەسمان لێ بگرە سەران سوێ باری
له تۆ ماڵێ زۆر له منیش جوانی
پێت حەرام کردووم سەر ئاوو کانی

کوڕ: یەکێك لەو ماڵە هەروا بانگ دێلێ
ئاوێنەی پێ نییەو بسکان دادێلێ
ئاموری پێ نییەو جەرگم دەکێلێ

[پێکدا هەڵدانی کوڕو کچ]

کچ: حێوکەی بەملانم
کلسی نۆ کلدانانم
خوشکی حەوت برایانم
حەوت برایانم پێ بێلێ
بەجێم نێلن له خێلێ

کوڕ: باللورەی بە لێوان
شەقەی توله میوان
ماچ خۆشن له کێوان

کچ: باللوری نازانم
کوخی نیو ڕەزانم
بە دراوان هەرزانم
بەلیران گەلەك گرانم

کچ: هەی دادو بێداد لەو نەهاتیە
دوو چڵە ڕیحانە لێم بوون قاتیە
تاکو بینێرم بۆ دوور ولآتیە

کوڕ: تۆ دوورو من دوور هەردوکمان دوورین
دەخودا دەیزانێ بۆ یەك مەجبورین

کچ: ڕەشە ڕیحانەی بە قەتارەوە
دەردەداری تۆم له پێرارەوە

کوڕ: ڕەشە ڕیحانەی ماڵۆ بە ماڵۆ
بە خەڵکی دەبڕێی بەمن ڕەنجەڕۆ

کچ: ڕەشە ڕیخانەی پەلك حەبیبی
خۆم لێرەکانەو تۆم له غەریبی

کوڕ: ڕەشە ڕیحانەی خۆمی پێ ڕەشکەم
له دوای بالآی تۆ دڵ بەکێ خۆشکەم

---

« پەراوێز »

1 – شیرداخە : ناوی قوماشێکە ئەو وەختە کە له بەریان بووە .
2 – شەقیمە : مانای شەوو ڕۆژ هەر بەدواتەوەم ، هێندە عاشقی بووە .
3 – کوتکولە : جۆرە دارێکە بۆ ئاودانی وولآخ بەکار هێنراوە . وە مرۆڤیش بەکاری هێناوە .

# خاجە[1] ئاليخان[2] بەگ

● ڕێکێش ئامێدی ●

سترانا خاجە ئاليخان بەگێ سترانەکا زێمارییە يا کەڤن بسەدەها خەلکێ ژبەرکربو ئو هەتا نهوژی گەلەکا بەلاڤە ڤێجا کا وەرن دا بزانين کا ئەڤ سترانە چەوا چێبويە ئو ئەو مروڤێ ئەڤ سترانە پێڕا هاتيە گۆتن کييە ؟

خاجە ئاليخان بەگ کوڕێ بەهرام[3] پاشایێ مەزنە کوڕێ زوبەیر پاشایێ ئێکێ بـو یێ کو میـراتی لئامێـدیێ دکر سـالا 1113ك ـ 1701ز بابێ وی بەهرام پاشای دوانزدە کوڕ هەبون ژ دوو ژنا ئو پشتی بەهرام پاشا مری سماهيل پاشایێ کوڕێ وی شينا وی گوت ئو بو پاشایێ ئامێدیێ .

لێ موخابن ئەم بدروستاهی سالا بوونا خاجە ئـاليخان بەگێ نزانين .

بەلێ تشتێ کو ئەم دزانين ئەوە کو دسالا 1201[4]ك ـ 1780ز دلمان چێبو لناڤبەرا سماهيل پاشایدا ئو ئەڤا برايێت وی :

1 ـ طيفور بەگ

2 ـ لطف الله بەگ

3 ـ جص خان بەگ

پشتی سماهيل پاشا نـەچار بـوی رابو ئـەڤ هەر سێ برايێت خو ژ ئامێدیێ دەرێخستن .

برايێت وی ژی ڕابون قەستا زاخـو کر لوێـرێ هندەك پێزەڤەنگ گەهشتنێ ئو بهندەك کارێت نە ژڕەنگ ڕابون دەمێ سماهيل پاشای ئەڤ تشتە زانی ڕابو برايێ خو یێ دی ئاليخان بەگ ب لەشکەرێ خوڤە دگەل لەشکەرێ جزيرێ ڤڕێکرنە سەر وان ئينا (لطف الله بەگ) ڕەڤی چـو چيايێت زێبـارێ ئو هـەر دوکێت دی (طيفور بەگ) ئو (جص خان بەگ) بدەست گرتن ئو ڤڕێکرنە ئامێدیێ نك سماهيل پاشای .

خاجە ئاليخان بەگ بو والی لزاخـو ب وێ فەرمـانا کـو سمـاهيل پـاشای دای چـونکی مـروڤـەکێ گـەلەکێ زانـا و تێگەهشتیبو ئو ما لزاخو هەتا کو چويە بەر دلوڤانيـا خودای سالا 1791[5]ز ڤێجا سترانبێژا دەست هاڤێتێ ستران بمرنا ویڕا چێکرن ئو ئەڤ سترانە ل گەلەك دەڤەرا بەلاڤبون ئو بسەدەها خەلکێ ژبەرکرن ئو دەست سەر دەستی ئەڤ سترانە ڤەگێڕان لەوما هەتا ڕۆژا ئەڤروژی ئەڤ سترانە يا بەلاڤە لئامێـدیێ و لناڤ نهێليا ئو لدهوکێ و ل زاخو ئو لگەلەك دەڤەرێت دی ژی لناڤ بەهدينا .

ئو هه‌ر وه‌چکو من گولێ بـوی (خاجـه ئالیخـان به‌گێ) گه‌له‌ك حه‌ژ ڕاڤ و نێچیرا دكر ئو ئه‌و دشیا چه‌ند ڕوژا سه‌ر ئێك ببورینیت ل چه‌ل و چیا ئو ل بستی و زنارا ئو بگه‌ڕیت ل دویڤ كیڤیا ل سرت و په‌سارا دگه‌ل ئه‌لندی و سحارا .

ئو یا هه‌ژی گوتنێیه بیبێژین كو ئه‌ڤ سترانه ب گـه‌له‌ك ڕه‌نگا ئو بده‌ڤێ گه‌له‌ك سترانبێژا یا هاتیه گوتن ئو ئه‌م دێ به‌س دو ڕه‌نگا نوكه به‌لاڤكه‌ین .

## «سترانا خاجه ئالیخان به‌گێ»[6]

سلكێ منو بابێ بابێ
تابویتا خاجه ئالیخان به‌گێ
ل زاخو هه‌لاند و ل دارا بێبادێ ده‌ینابێ
دێ جابه‌كێ بده‌نه حه‌لیمایێ[7]
دا ڕابخیت بانێ كوچكێ
دگه‌ل به‌ر بانگێ بێلایێ
كه‌كێ سماهیل پاشا
هه‌كو ل په‌نجه‌رێ دبێته خولام و خوله‌ت كارا
ئو جاری و قه‌ره‌واشا[8]
ئه‌و چ بوشاتیه
لبن داركا بێبادێ[9] ده‌ینابێ ؟
دێ ببینێ ئه‌ڤه
كه‌یف و ئه‌شق و ڕاڤ و نێچیرێت
خاجه ئالیخان به‌گێ‌نه
بێت دزڤڕیته‌ڤه ژ ڤی چیایی
هه‌ی لاوو لاوو
خاجه ئالیخان به‌گێ منو هه‌ی لاوو
ئیسڤو ژخوڕا نه‌ماوو
ته پشتی خاجه ئالیخان به‌گێ ده‌لال
ته خه‌م و خیال و كول و كوڤان
ژێڕا ماوو
ئه‌ی دلێ منو
چه‌ندێ ب كولا چه‌ندێ ببرینا

دێ جابه‌كێ ببه‌نه ئامێدیێ
بو ڤا خاتوینا
دا تابویته‌كێ چێكه‌ن
بو خاجه ئالیخان به‌گێ ده‌لال
یا سور و شینو
هه‌كو كه‌كێ سماهیل پاشا
لبه‌ر په‌نجه‌رێ
دبێته خولام و خوله‌ت كارا
ئو جاری و قه‌ره‌واشا
ئه‌و چ بوشاتیه
لداركا بێبادێ ده‌ینابێ ؟
دێ ببینێ ئه‌و كه‌یف و ئه‌شق و
نێچیرێت خاجه ئالیخان به‌گێ‌نه
بێت دزڤڕیته‌ڤه
ژ حه‌راما چیایێ مه‌تینا
وه‌ی دلێ منو چه‌ندێ ب كولو
چه‌ندێ ب خه‌مو
دێ جابه‌كێ ڤڕێكه‌نه
ئامێدیێ بو ڤا ڕه‌به‌نا
دا تابویته‌كێ چێكه‌ن
ژبه‌ر تابویتا خاجه ئالیخان به‌گێ
ژ دارێ له‌ڤه‌نا
كه‌كێ سماهیل پاشا
هه‌كو لبه‌ر په‌نجه‌رێ
دبێته خولام و خوله‌ت كارا
ئو جاری و قه‌ره‌واشا
ئه‌و چ بوشاتیه لبن
داركا بێبادێ ده‌ینابێ ؟
ئه‌م دێ ببینێ ئه‌و چیه ئه‌و چنینه
دێ بینێ ئه‌و
كه‌یف و ئه‌شق و ئه‌ڤینا
ڕاڤ و نێچیرێت وینه
بێت دزڤڕیته‌ڤه ژ ڤا مه‌وته‌نا
دێ جابه‌كێ بده‌نه ئامێدیا
دا بهێنه سه‌ر شیرهان و ڤا ده‌رییا[11]

دا ڤەدەنە ڤە چار شەفكان[12] و ڤا خێليا[13]
دا تابويتەكێ چێكەن
لبەر تابويتا خاجە ئاليخان بەگێ دەلال
يا سورو شينۆ
كەكێ سماهيل پاشا هەكو
دبێتە خولامو خولەت كارا
ئو جارى و قەرەواشا
ئەڤە چيە چ نەبو ؟
دێ بێنێ ئەڤە كەيفو ئەشقو
راڤو نێچيرێت
خاجە ئاليخان بەگێنە
يێ دزڤرێتەڤە ژ حەرامە
ئەڤێ چيايێ
دێ بينە دەرێ
دێ تابويتا خاجە ئاليخان بەگێ دەلال
بينە دەرێ
دێ بێنە دايكا وى ، دا
بسەرێ خو وەركەت
كۆتكەكێ خولێ ئێكێ كەرێ
كەكێ سماهيل پاشا
لپەنجەرێ هەكو دبێتە
خولام و خولەت كارا
ئو جارىو قەرەواشا
ئەو چ بو شاتيە
لبن داركا بێبادێ دەينايێ ؟
ئەم دێ بێينێ ئەو كەيف و ئەشق و
نێچيرێت خاجە ئاليخان بەگێنە
بێت دزڤرينەڤە ژ حەرامە
ئەڤێ سەفەرێ

## خاجە ئاليخان بەگ[14]

دلێ منۆ بايى بايى
تابويتا خاجە ئاليخان بەگێ

ل زاخوكا رەنگين دەركەڤتو
ئينا لبن دارا بێبادێ دانايى
خاجە ئاليخان بەگێ دبێژيت :ـ
يا گەلى خولام و خولەت كارا
ئەگەر كەكێ من سماهيل پاشا
لسەر بەرێ ئاميدێ
پسيارەكێ ل حالێ من بكەت و
هنگ ببێژنێ ئەڤە كەكێ تە
خاجە ئاليخان بەگە
يێ تێتو لسەرايێ
وەى ژارۆ ئەزۆ
بريندارۆ ئەزۆ
برين كولۆ ئەزۆ
دلكێ منۆ بايى بايى
تابويتا خاجە ئاليخان بەگێ
ل زاخوكا رەنگين دەركەڤتو
ئينا لبن داركا بێبادێ دانايى
هەى يوسفۆ كوهينێ رێلانۆ
دلێ من تێشى
تابويتا خاجە ئاليخان بەگێ
ل زاخوكا رەنگين دەركەڤتو
لبن داركا بێبادێ دانا وۆ
پێش پێش
خاجە ئاليخان بەگێ دبێژيت
يا گەلى خولام و خولەت كارا
ئەگەر كەكێ من سماهيل پاشا
لسەر بەرێ ئاميدێ پسيارەكێ
ل حالێ من بكەتو
هين بێژنێ
ئەڤە كەكێ تە خاجە ئاليخان بەگە
يێ تێتو ل راڤ و نێچيرا
ل چيايێ بشێش[15]
دلكێ منۆ بايى بايى
تابويتا خاجە ئاليخان بەگێ
ل زاخوكا رەنگين دەركەڤتو

ئینا لبن دارکا بێبادێ دانای
دلێ من یێ ب کول و برینە
تابویتا خاجە ئالیخان بەگێ
ل زاخوکا ڕەنگین دەرکەڤتو
لبن دارکا بێبادێ دانای
یا سورو شینە
خاجە ئالیخان بەگێ دبێژیت
یا گەلی خولام و خولەت کارا
ئەگەر کەکێ من سماهیل پاشا
لسەر بەرێ ئامێدیێ
پسیارەکێ ل حالێ من بکەتو
هنگ بێژنێ
ئەڤە کەکێ تە خاجە ئالیخان بەگە
یێ تێتو ل ڕاڤ و نێچیرێ
لچیایێ مەتینە
دلکێ منۆ بایی بایی
تابویتا خاجە ئالیخان بەگێ
ل زاخوکا ڕەنگین دەرکەڤتو
ئینا لبن دارکا بێبادێ دەینایی
جابەکێ ببەنە (مەحلا) ڕەبەنا
بلا ڕابن تابویتەکێ چێکەن
ژ دارێ لەڤەنا
خاجە ئالیخان بەگ دبێژیت
هەکە کەکێ من سماهیل پاشا
پسیارەکێ ل حالێ من بکەتۆ
هنك بێژنێ
ئەڤە کەکێ تە خاجە ئالیخان بەگە
یێ تێتو ل مەوتەنا
دلکێ منۆ بایی بایی
تابویتا خاجە ئالیخان بەگێ
ل زاخوکا ڕەنگین هەلینایی
لبن دارکا بێبادێ دانایی
جابەکێ ببەن بو خاتوین عەیشێ
بلا بینیت
کولوسکەکێ بن خومبێ
نە وڵلا بابۆ ئێکێ هەشێ
هەکە کەکێ من سماهیل پاشا
لسەر بەرێ ئامێدیێ
پسیارەکێ ل حالێ من بکەتو
هنگ بێژنێ
ئەڤە کەکێ تە خاجە ئالیخان بەگە
یێ تێتو ل لاەشێ
وەی ژارۆ ئەزۆ
بریندارۆ ئەزۆ
برین کولۆ ئەزۆ
هەی ئیسفۆ گوهینێ ڕێلانۆ[16]

## ژێدەر و پەیڤێت گران

1 ـ خاجە : بازرگان ، تیجار
2 ـ ئالیخان : عەلی خان
3 ـ بەهرام پاشا : سالا 1686ز ژدایك ببو ئو سالا 1714ز بو پاشایێ ئامێدیێ
4 ـ إماره بهدينان العباسية بپـ 82
5 ـ الاكراد في بهدينان انور مائي بپـ 157
6 ـ ئەڤ سترانە من یا ژدەڤێ عبداللە بەگێ ئامێدی ڤەگیسی .
7 ـ حەلیما : ناڤێ دایکا خاجە ئالیخان بەگێیە
8 ـ جاری و قەرەواش : بەردەستك و خولام و خودام
9 ـ بێباد : گوندەکێ ڤەلایە دکەڤیتە ڕوژ ئاڤایا ئامێدیێ
10 ـ ئیسف : خولامێ خاجە ئالیخان بەگێیە
11 ـ دەرێیا : ئانکو دەرگەها ڕامان ژێ هەر دوو دەرگەهێت ئامێدیێ نە دەرگەهێ پاشای ئو دەرگەهێ سەقافا .
12 ـ چارشەف : پاتەکێ ڕەش بو شینا عەبای ژنکا ب سەرێ خو دادداوی دەمی .
13 ـ خێل : بەرچاڤك ، پێچە .
14 ـ ئەڤ سترانە من یا ژدەڤێ احمد عبداللە گوهەرزی «نهێل» ڤەگیسی .
15 ـ بشێش : پارچەکا بلندە ژ چیایێ مەتینا دکەڤیتە هنداڤی ئامێدیێ ژ ڕەخێ باکوری ڤە .
16 ـ ڕێل : چول .

# مەتەڵ

فەرهاد گەردی

خۆشەویستم ..
چەندان پایزو زستانە ،
بەسەر کێڵگەی غوربەتی‌و ویرانی منا ،
هەورێکی ڕەشی چلکنی !
نە دەباری !! نە کۆچ دەکەی !
چەندان ساڵە ...
مەتەڵێکی ،
جارجار دیاری .. جارجار وونی
نەتێت دەگەم ، نەتیم دەگەی !
چەندان ساڵە ..
کلیلێکی ،
دەرگای هەموو نهێنی‌یەکان دەکەیتەوە ،
بەلام سەد ئاخ !
قاسەی خۆزگە بەداخراوی دەبەیتەوە .
چەندان ساڵە ..
ئەڵقەیەکی ،
لە پەنجەی گشت دڵدارێکا ،
بەلام لەپەنجەی لەرزۆکو ،
سەرمابردووی عەشقی منا ...
لە دەریای بیرو خەیاڵی ،
ئەندێشەو ڕقی بێ بنا ..
ئەپچڕێیت و لە گەرووی مەرگ ،
بەندم دەکەی !
چەندان ساڵە ..
چیرۆکێکیت ،
نەسەرەتات بۆ دانراوە نەکۆتایی
دەتخوێنمەوەو لێت تێ‌ناگەم !
فەرهەنگێکیت ،
چەندان ووشەی تاڵو شیرین ،
ئەگریتە خۆت !
بەلام بەدوای ووشەیەکا ،
چەندان ساڵە دەگەڕێمو ،
قەت پێی ناگەم !

# چوارینە

• نەجم خالید •

هەردەم شاد بژی لێو بەخەندەوە
دونیا خەونێکەو زوو دەبڕێتەوە
ماچکە لێوانی کچی شۆخو شەنگ
باگوڵی تەمەن سیس نەبێتەوە

* * *

بەهار زۆر خۆشە بە مەستی بژی
سەر کوڵی جوانێ بە لێو بمژی
نەك خەفەتباریی لە گۆشەی ژینا
پەپولەی عەشقت بە غەم بکوژی !!

* * *

پەپولەی عەشقم شەیدای جوانێکە
وێڵو ئاوارەی بێ ئامانێکە
بۆیە بەشەوان دەسوتێ بەگڕ

# دڵنیابوون

سەباح ڕەنجدەر

خاچی پەرستگاکەی دڵم
سۆفیەکانی ئەو بنارەی وەها فێرکرد
واز نەهێنن
بۆ کابەی ئەشقەکەی پیرۆز
کەشکۆڵ و عەسا هەڵگرن
لە ئەشکەوتی خڵوەت و نوێژ
کاری ڕەوا بەجێ بێنن

* * *

چونکە پەروشی گوڵ ئەندامێکە !!

«چوارینە»

دونیای بێوەفا بەسە دەردی دڵ
بۆ ؟ ! ئاواتی من بچێتە ژێر گڵ
بۆجوانی نەبێ بۆ تەنیا ساتێ ؟ !
بەخەندەی لێوی خەم بکا بەگوڵ

* * *

موتریب دەخیلە دەنگێ ، ئاوازێ
بولبولی تەمەن سەفەر ئەخوازێ
بۆگوڵ ، بۆجوانی ، بۆ عەشقی پیرۆز
بابدرکێنێ خوای جوانی ڕازێ

دێوانەم و ...
بە هەوای باڵۆرەیەکی ، غوربەتی کۆچ
ڕاچەنیم و ڕێم گرتە بەر
ڕێم هەورازە
بە ناو تەم و بەفرو هەڵدێر
گوزەر دەکەم دەڕۆم تاسەر

* * *

گوڵ ئەستێرەی ڕوگەنیمای ڕازی شەوم
بەناو سینەو مەمی باخی
حەزو ئەوین دادەگەڕێ
«باشووکە» و «بۆ»[*] دەتۆقێنێ
وورشە دەداتە پێش کاروان
تادوا لووتکە جێ نامێنێ

* * *

هۆ کیژۆڵەی کۆکی جافان
لە نەورۆزدا
بۆ بووکێنیت
بۆ کراس و سوخمەی پوولەکەچنی کاڵات
چوار چەپك گوڵاڵەو نێرگز
دەکەمە خەڵاتی باڵات
دڵنیابە ئەی گیانەکەم
لەهەر کوێ بیت
بەیانی من هەرپێت دەگەم

---

* بۆ : کورت کراوەی کوندەبەبۆ

# شیعر

محمد غفور

## دووز

کاتێ کە دەستی برسێتی
گوڵی خەندەی ...
سەر لێوی زارۆ هەزارێك ،
دەژاکێنێ
هەر ئەو کاتە ...
لە نێو دڵی گڕگرتووما ،
شیعرێکی تر سەردەردێنێ .

## رەشەبا

گیانە پرسیوتە لەسەرچی
وارقی لە رەشەبایە ؟
دەزانی بۆ ؟
چونکە کاتێ ...
کە تێنوێتی ،
دار بەروویەك دەمرێنێ ،
رەشەبا لە پرسەکەیدا ،
دەستی ئۆخەی ...
بەسەر سینگی خۆیا دێنێ .

کورتە چیرۆك

# کۆتایی پایزی سێهەم

دانا علی سعید
ئاباری / 1984
سلێمانی

زۆر بە تاسەوە ئەم بەیانی‌یە رێی قەراغ شارت گرتووەتە بەر ، هەنگاوەکانت زۆر خێران .. هەڵپە ئەکەیت .. چاوەکانت دەریایەکی مەنگن‌و لەناویدا جیهانێکی تری حەشار داوە .. رەنگی پایز بەهەموو قوژبنێکی شارەوە دیارە .. بە بەر چاوەکانتەوە گەڵا زەردەکان سەما دەکەن .. چەند حەز دەکەیت هەموو گەڵاکان کۆبکەیتەوەو لەژوورە بێ دەنگەکەتی بئاخنی .. سێ پایزە بە تاسەوە دەڕوانیتە دیمەنە زەردەکەی .. هەموو شتێ زەردە وەکو قژی دەسگیرانت .. خۆزگە دەخوازی هەمیشە پایز بوایە .. هەموو گەڵایەکی زەردی پایز لای تۆ تاڵێ قژی دەسگیرانتە . ئەم بەیانی‌یە کزە بایەکی سارد خۆی لەشارەکە هەڵدەسوێ ، دەربەست نایەیت .. خۆت

پێچاوەتەوەو .. زۆر حەز بەو کزە بایە دەکەیت ، ئەگەر جەستەیشت بکاتە سەهۆڵ هەر خۆشت ئەوێت .. دیاری پایزە .. دیاری تابلۆ ڕەنگینەکەی ساڵە .. بڕیاری ئەمشەوت ئەم گەشتەبوو .. [شەو وەك دایك وایە ، ڕاوێژکەرێکی دڵسۆزە][1] . هەمیشە ئەم ڕستەیە بۆ برادەرەکانت دەڵێیتەوە ..

تەواو بڕوات پێ هێناوە .. دایکی ئەمشەویش ڕێی ئەم گەشتەی نیشان داوی .. بەردەوام بەدەم ڕێوە لە جوینەوەی بڕیارەکەتدای .. «ئەڕۆم .. تالە لۆغانەکەی شار بێ ئاگادەبم .. لە ناو دڵی دەشتەکەدا .. جێ هەوارگەی تەمەنی سێ پایز .. سێ پایزی پڕئاوات و تاسە .. سێ پایزی پڕ چاوەڕوانی و خەم و ژان .. پڕ دوکەڵ و تەنیایی .. لەناو ئەو گیا زەردەدا تل دەخۆم .. دەست بەسەرو قژیا دەهێنم .. تێر تێر لەوگیا تفتە دەجووم .. تاسەی ساڵێکی پڕ نەهاتی و چاوەڕوانی دەشکێنم .. پاشان کڕنووشی بۆ دەبەم و پڕ بە دڵم ئەسرینی بۆ دەڕێژم .. گرێی داستانە بێ دەنگەکەمی بۆ دەکەمەوە ..

لەگەڵ ناشتنی گشت دێڕێکی داستانەکەم بە ڕەهێڵەی فرمێسکەکانم بۆی ئاو دەدەم .. تەنها ئەوە بە بێ دەنگی گوێم بۆ ڕادێرێ .. ژانەکانم لێ وەرگرێ .. فرمێسکەکانم لە سینەیدا بۆ حەشار بدا .. ئەویش کزەبا فێنکەکەی هەڵدەکاو بەبێ دەنگی بۆم دەلاوێنێتەوە .. بەشداری ئەو ئاهەنگەم دەکات .. منیش بە سەریدا دەنوشتێمەوە تاکفت دەبم .. ئەوەندە ئەلاڵێمەوەو نزا دەکەم تا خواوەندی خەو لە ئامێزم دەگرێ ..

نایەمەوە تا چاوە پڕ فرمێسکەکانم نەسڕێ .. دڵە پڕ زووخاوەکەم نەشواتەوە .. هەتا توێشە بەرەی ساڵێکی تری پڕ ئارامی و بێ دەنگی لێ نەخوازم .. پاشان دەگەرێمەوە باوەشی پایزە زەردەکەو ماڵ ئاوایی ئەم گەشتە پڕ لە ئەسرینەی لێ دەکەم .. جێی دەهێڵم .. جێی دەهێڵم ..» .

هۆڕنی ئوتومبیلەکەی دواتەوە هێنایتیەوە هۆش خۆت .. بە دوو قەڵەمباز خۆت گەیاندە ئەوبەر جادەکە .. دەستەکانت لەوورگی گیرفانەکەت ڕۆکردەوە .. کەوتیتەوە هەڵپە .. بەناو شەقامە درێژەکەی شاردا شۆڕبوویتەوە .. ئافرەتە قژ زەردەکەی بەرامبەرت دایچڵەکانیت .. تەزوویەکی خێرا جەستەتی ڕاوەشاند .. پەنجەکانی لە ناو دەستی کوڕە کەڵەگەتەکەی تەنیشتیدا بەبێ دەنگی ئارامیان گرتبوو .. کوڕەکەش خێرا خێرا قسەی بۆ دەکرد .. هەناسەیەکی قووڵت هەڵکێشا .. زۆر بەتاسەوە چاوەکانت تێ بڕیبوون .. دیمەنەکەیان لە گرێژنەی بردبوویت .. لەگەڵ ڕەت بونیاندا خۆت دا بە قەبرغەی کابرا زلەکەدا .. هەر بە پەلە سەرێکت بۆ نوشتانەوەو بەجێت هێشت .. کەوتیتەوە دەریای بیرکردنەوە ..

«منیش زۆر شتی نوێم لەخورجینەی ئەم عەشقەدا بۆ هەڵگرتووی .. لە یەکەم ژوانەوە چەپك چەپك ئەیکەمە دیاری .. زۆر ڕقی پیرۆز لەدەروونتدا دەڕوێنم .. فێرت ئەکەم ڕقت لە هەموو ئەوانە بێت ڕێزت لێ گرتوون .. هیچ نرخێ بۆ ئەوانە دانەنێیت کە لێیان ترساوی .. هەموو ئەوانەی چاویان لێ سور کردویتەوە .. ئەوانەی ماکی ڕەوشت نزمی ئەم کۆمەڵە لە ناخی خۆیانەوە پەرە دەسێنێت و دەرسی ڕەوشتی هەزارانی وەکو تۆ دائەیەن .. فێرت دەکەم چۆن بە بێ نرخی تەماشایان بکەیت .. لە فەرهەنگی سینەتدا ناوو ئامۆژگاری هەموو ئەوانە ئەسڕمەوە کە تۆوی ترس و شەرمیان لەناخدا چاندووی .. فێرت دەکەم هەموو ڕۆژێ یەك هەزار تفی خەست بدەی بەڕووی ئەوانەی ئەو پرچە زەردە جوانەتیان لەژێر سەرپۆشی شەرما شاردوتەوە .. هەموو ئەوانەیش تائێستا زمانی بەرگریتیان لەکۆ خستبو .. تەنانەت ئەوەیشت فێر دەکەم ئەم جیهانە هەر ئەوەندە نی یە تێیان گەیاندووی ، بەڵکو زۆر لەوە گەورەترە .. تۆیش دە ئەوەندەی تر هانم بدە ڕق ئەستوور تربم .. لەگەڵ هەموو تەریق بوونەوەیەکت .. لەگەڵ هەموو بێ دەنگی و کزەڵی یەکت .. لەگەڵ هەموو سەر داخستن و ڕەنگ بزرکاندنێکت .. سەد ئەوەندەی تر ئازارەکانم گەورەتر دەبن .. پەردەی ئارامم ناسك تردەبێت .. هەردووکمان دەبینە مامۆستاو لە هەمان کاتیشدا قوتابی .. ڕێچکەی ژیانێکی تازەی دوور لە یاساو سنور دەگرینە بەر .. دەبینە سەرەتایەك بۆ

دروست بوونی خێزانێکی نوێ .» .

خۆیشت سەرت سوڕماوە .. نازانیت سەرەتای سەوز بوونی ئەم ڕاو بڕوایانەت لەکوێوە سەری هەڵدا .. لەگەڵ خۆشەویستنی ئەودا یان پێشتر .. زۆر جار تووشی سەر ئێشەیەکت دەکەن بە سێ حەبی (ئیسپرین) نایەیتەوە حساب .. سەرەتاو کۆتایی ئەم مەسەلەیەت لەلاڕوونە .. بێ دەنگیت کردۆتە قەڵغانێك بۆ حەشاردانی نهێنییەکانی دەروونت .. دووکەڵیش نزیکترین هاوڕێ .. بێ دەنگیو دووکەڵ بوونەتە چوار چێوەیەکی پۆڵایین بۆ نهێنییەکانی ناخت .. ئەوەندەت نەماوە لۆغانەکەی شار بەجێ بهێڵی .. چەند نزیك دەبیتەوە زیاتر هەڵپە دەکەیت .. هێندەت نەماوە بیکەیتە نەرمە غار .. هەستت بە سەما کردنی گیازەردەکان دەکرد .. لەکاتێکدا کزە باکە خۆی لە سنگو بەرۆکی دەشتەکە هەڵدەسوو .. وورشەی گیا ووشکە زەردەکان زیاتر دەروونتیان جۆش ئەدا .. عاشقەکەی خۆیان دەناسنەوە .. حەزت دەکرد وەك مار خۆت بەسەر گیا زەردەکاندا کێش کردایە .. لێوەکانت لە بنجەگیاکان گیر کردایە .. بێ ئەوەی بنجەگیایەك لەیاد بکەی .. تاخۆت دەگەیاندە ناو دڵی دەشتەکە ئەوکاتەیش بەلێنەکەت لەسەرخۆ بەجێ بهێنایە .. هەست دەکەیت وەك قەرزی لێهاتووە بەسەرتەوە ، ئەبێ هەموو پایزێك ئەم ئاهەنگە بگێڕیت .. پەڵەگیایەکی زەردی تۆخ .. تۆخ وەك قژی دەسگیرانت .. لەناو سنگی دەشتەکەدا پێشوازی لێدەکردی ، میوانداری شیوەنەکەی ئەمساڵی لێ دەخواستی .. هەر خێرا خۆت گەیاندە پەڵە زەردەکەو تەخت خۆتدا بە سەریدا .. تێر تێر ڕوومەتت لە گیا زەردەکەی هەڵسو .. هەتا تاسەی ڕێ دوورەکەت شکاند .. ئنجا زور بە هێمنی خۆت خستە سەر پشت .. دەستەکانت بەبێ ئارامی بە ناو گیاکەدا دەهێناو دەبرد .. جارێك .. دووان .. دە .. پانزدە .. هەتا تەواو ماندوو بوویت .. پاشان هەر دوو چنگت لەدوو بنجەگیا گیر کرد .. تا تەواو ئۆخەیت کرد .. دڵۆپ دڵۆپ ئەسرینەکانت لەژێر چاوە داخراوەکانتەوە وەك یاقوتێکی وورشەدار بۆ لای لاجانگت خلۆر دەبوونەوە .. لەناختدا چەند یادێکی ئاڵۆز ئاوێتە بوون ..

«لەپایزی پارەوە هەتا ئەمڕۆ چاوەڕێی ئەم ڕۆژە دەکەم .. بیری ئەم ساتە دەکەمەوە .. خۆشەویستیتان لەناخمدا ڕەگی داکوتاوە ، هەرچی دەکەم بۆم دەرنایە .. ئەم دووبارە بوونەوەیەش خەریکە بێزارم دەکات .. ئێوە هاوڕێمن ئەی گیاو گەڵا زەردەکانی پایز .. خۆشم دەوێن هەروەك پرچی زەردی دەسگیرانم .. بەڵام نەدەتوانن ئەسرینێکم بگەیەننە لای دەسگیرانم نە هەواڵێکی ئەوم بۆ بهێنن .. لەساڵێکدا تەنها ڕۆژێ میوانداری ئێوە کۆتایی بەژانو خەمەکانم ناهێنن .. نە ئامۆژگاریتان هەیەو نە هەواڵ .. بێ دەنگن ، هەروەك چاوی دەسگیرانم .. بێ هەواڵن ، وەك شەماڵی سێ ساڵی پڕ چاوەڕوانیم .. دەئێوەیش گوێی بێ دەنگی بهەژێننو شتێ بڵێن .. خۆ من هەر چیم زانی ووتم .. هەرچی هەواڵ هەیە بۆم هێنان .. تاکەی ئەم بێ دەنگییە .. بە قەدەر «ئەیوب» سەبرم گرتو هیچتان نەووت .. هیچتان نەووت ..» .

ئەمجارە گریانێکی زۆر بەکوڵ قوڕگتی گرتو وتەکەی پێ بڕیت .. زۆر بێ دەسەڵاتانە ئەکڕوزایتەوە .. هەنسکەکانت ببوونە چەخماخەی بەهارو ڕەهێڵەی فرمێسك بەدوایدا .. زۆر گریایت ، بنجەگیاکانت بەدەستەوە هەڵکەند .. لەگریانیش بێزار بوویت ، هیچت بۆ ناکات ، هیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕێت .. بێ دەنگ بوویت .. بەپشتی دەستت چاوەکانت سڕی .. هێور بوویتەوە .. بێ بیرکردنەوە ماوەیەك بێ دەنگ بوویت .. بەهێمنی چاوەکانت بەرزکردەوە .. وەك شتێکی کتوپڕت بینیبێت هەر دوو چاوەکانت زەق کردەوە .. زۆر بەسەر سوڕمانەوە ئەتڕوانییە ئەو دیمەنە .. حەپەسا بوویت .. لەگەڵیدا لێوەکانت لەژاندا بوون بۆ لە دایك بوونی زەردە خەنەیەکی ناسك .. دیمەنی ڕۆژە زەردەکەی ژێر هەورە تەنکەکە لە ئامێزی گرتبوویت .. ئەویش زەردە وەك قژی دەسگیرانت .. تێ گەیشتی کەتەنها گیا ووشکەکانی پایز زەرد نییە .. تەنها گەڵا وەریوەکانی پایز زەردنییە .. هەر بەپەلە هەستایتە سەرپێو بڕیاری ڕۆشتنت دەرکرد .. ڕۆیشتنێك هەرگیز نەگەڕێیتەوە .. لەمەو دوایش ببیتە عاشقی ڕۆژ .. ئەمجارەیان لەهاتنت بە پەلە تر دەڕۆیشتی .. خێراتر هەنگاوت دەنا .. بە دەم ڕێگەشەوە چاوەکانت لە ڕۆژ نەدەتروکاند .

# یادی کۆچێکی وون

● سمکۆ ئەحمەد رەشید ●
هەولێر 1982/5

هاوار بکە .. رازەکانت مەتاسێنە ، با نەبن بەگریی کوێرە .. بەگوێی دلبەردا بچرپێنە (خۆشم دەوێی) .. بیخە سەما .. پڕ بە دڵی هەموو گەردوون هاوار بکە .. لێت وەرس نیم .. هاوار بکە .. با سەداکەت بەر دوا خاڵی ئاسۆ بکەوێ و دەنگ بداتەوە .. خەوتوو لە باوەشی گەرم و نەرما ڕاچڵەکێنە ...

هەموو شەوێك یەخەم دەگرێت .. بەنێو هەزارەها شەپۆلی سام و تەلیسمدا ، بەدوای خۆتدا کێشم دەکەیت .. سەرەداوی سەفەرێکی خەیاڵاویم دەدەیتە دەست ، منیش هەڵی دەکەمەوە .. دێوانە ئاسا شەو بەکۆڵەوە دەگرم .. توێشووی سەفەریشم دەنگی تۆیە .. کەندو کۆسپ دەگرمە بەر .. هەزاران ڕێگای هات و نەهات و پڕ ئەندێش دەبڕم .. هەڵدەنگوێم .. دادەچڵەکێم .. سەرما کەڵبەم لێ گیر دەکات .. دەبم بە پارچەیەك سەهۆڵ .. کەچی چۆك نادەم .. ئاواتێکی سەوز لە ناخما چەکەرە دەکات ، (برۆ دەیگەیتێ) .. جەستە شەکەت و داهێزراوەکەم باڵ بێ دەگرێ .. ڕێگا دەکشێ ، هەنگاو دەزێ .. هەست بەسەختی ڕێگا ناکەم .. سیامەندم و بەسیپانا هەڵدەزنێم .. بەرەو ڕەنگت تەکان دەدەم .. تۆ نازانی چەند پەرۆشی دیدارتم ! ؟ تۆ نازانی دوای کۆچت خەمەکانم دەست لە قژی یەکتر دەنێن ؟ .. شاپەڕی مەلی شادیم هەڵپرووکا .. دوای کۆچت تەمی پرسە تیشکی ڕۆژی لە ژێر باڵی خۆی حەشاردا .. زەردە خەنە بوو بەگریان .. تۆ نازانی چەندەها شەو بوویت بەپێشەنگی پێشانگای تابلۆی خەونەکانم ! ؟

«دوێنێ شەو لەخەونمدا ببوویت بەگوڵێکی سوور . بەخەی کیژێکی شەنگت کردبووە نیشانەی تیری لاوە چاوبرسیەکان .. بەدەم خۆرەوە پێدەکەنیت .. لە خۆشیەکی بێ ئەندازەدا دەتریقایتەوە . کچەش لاقی پێ لێ دەدایت .. کەچی داخ ، لەپڕ زریانێکی تووش و تووڕە لەکچە ئاڵا .. تۆشی ڕافڕاند .. کچە حەپەسا .. چەند هەناسەیەکی دوکەڵاوی پڕ بە هەموو سیەکانی بەند کردو لەهەمان کاتیشدا ئازادی کردن .. چەندەها چاوی مات و خەمبار بەدواتدا کەوتنە خولانەوە .. بەڵام بێ سوود بوو ، لەچاو وون بوویت .. زریانی بەد لە چاو تروکانێکا وونی کردیت ..»

بۆیە ئێستا گومان لەمانت دەکەم .. ئاخۆ نەبوویت بەهەمان گڵ کە گیانی (ئادەم و حەوا)ی بەبەرداکرا ؟ سەداکەت لە گوێما دەزرنگێتەوە .. بەرەو ڕەنگت تەکان دەدەم .. بێ سڵ کردنەوە بە دواتدا دێم .. تا ئەو کاتەی تۆ دەبیت بەتیشك و من پیادە .. دڵنیا دەبم کە ناتگەمێ .. بەکۆڵێ ژان و ئازارەوە هەمان ڕێگا دەگرمەوە بەر ، بەرەو ئەو کونجەی کە لێی بەڕێ کەوتم .. ژوورە شڕو خامۆشەکەم دەمگرێتەوە خۆی .. بەناچاری پەنا دەبەمە بەر دەنگت .. ئای کە خۆشە تۆ گۆرانیم بۆ بڵێیت و دەستەسڕی چۆپی منیش لەهەوادا بشەکێتەوە .. وای کە خۆشە تۆ گۆرانیم بۆ بڵێیت و منیش هۆن هۆن فرمێسکەکان بهۆنمەوە .. ئاوازەکەت هاوەڵێکی دێرینەم و لەشەوانی باراناوی تەنیاییمدا هاودەنگێکەو لەتەنیاییم ڕزگار دەکات .. سەر دەکەمە سەرینەکەم .. ئاوێزانی باڵای خەمێکی کەڵەگەت دەبم .. هەنسك لەگەروما قوڵپ دەدات .. دەبێ بەگریان .. فرمێسك وەکو مێروولە ڕیز دەبەستن ، بۆ سەر سەرینەکەم دادەچۆڕێن .. تۆش لای لایەم بۆ دەکەیت ، تا خەوێکی کپ و خامۆش قووتم دەدات ..

# نهێنی پیێکانی سێ گۆرانیی بێژی کوردستان

● کەمال رەئووف محەمەد ●

## ـ بەشی یەکەم ـ

پیرەمێردی رۆژنامەنووس و شەیدای هەواڵ و درووستکردنی کە جارو بارەش بەگاڵتەو گەپەوە دووای کەوتووە ، لە 1935 دا هەواڵێك دەگێڕێتەوەو دەڵێت[1] : [ مەلا کەریمی[2] خاوەندی قەوانە خۆشەکان چووەتە هەولێر زاتێك سێ دیناری داوەتێ ، هاتووەتەوە لە کەرکووك لێیان دزیوە (میوانداریی وا دەبێ !) . ئەمڕۆ لە حەمام هێزی دەستی نەبوو بمشێلێ ، ووتم : مەلا چیت لێ قەومیوە ؟ ووتی : گاییکیان دەبرد ، بۆ خوویی لێنێن . لەم سەرەوە هەڵی دەتووراند . لێیان پرسیی : کووێ دەچی ؟ بەگورجیکەوە بۆڕاندی ، ووتی : (میرو بە نمەك « = دەڕۆم بۆ خووێ ك . ر . م) . لەو سەرەوە بارە خووێ بەرەڵستی بڕیی بوو . پرسییان : کووێ دەچی ؟ بەڕقێکەوە نووزاندی ، ووتی : (می .. را .. نندم بە .. کوتەك « = دەمئاژوون بە کوتەك / ك . ر . م » ) . لە حەمام هاتمەوە بۆ باجی ئایشێم گێڕایەوە . ووتی : قەت دەنگ مەکە ! خوا حەقی گای کۆڵ ، بەسەر شاخدارەوە نایێڵێ . ئەو بەزۆر پارەی لە پایە سەندبوو ، پێی چوو بووە هەولێر ! جا بزانین لە هەولێرەوە بۆی دەبژێرن ؟ ] .

ئەو یادگارە کە پرشنگی رووناکیی زۆرە ، ئەم پرسیارمان پێدادەڕێژێت : ئایا ـ بۆ وێنە ـ هێندەی مەلا کەریم ، بەختی قەوان و ـ کەمێکیش ـ لێنووسینی هەبووە ، گۆرانیی بێژە کۆنەکانمان هەتا پێش و پاش جەنگی جیهانگیریی یەکەم ، بەختی ئەوهایان هەبووە ؟ ڕاستیی و بەڵگەی دیارو نووسراو کە بەبەر چاوەوەن ، دڵنیامان دەکەن کە ئەو گۆرانیی بێژانە ـ کڵۆڵانە ـ هەرگیز بەختیان نەبووەو ئەگەر تاك و تەرایان بەختێکیشی هەبووبێت ، هەر هێندەی بێبڕاوە ، شاعیرێکی[3] بەوەفاو هەست تەزیوی ئاهەنگ و زەمزەمە ، لە دێڕە شعیرێکدا ؛ ناوی خۆی ـ یان ـ جۆرێکی ئاهەنگی هێناوە لەوە بەولاش ، دیرێکی ژیانیان ، باسی زانستانەی ئاهەنگیان تۆمار نەکراوە ـ یان ـ نەنووسراوە کە پاشە ڕۆژێکی وەك ئەمڕۆ پێیان شادببێت ـ یان ـ بۆ گوڕی پێشکەوتن کەڵکیان لێببینێت ! بەڵام ـ کۆمەڵێك[4] ـ گۆرانیی بێژی دووای ئەو جەنگە یەکەمەو دووەمیش ، هەل و بەختیان بۆ هەڵکەوت کە دام و دەزگای تەکنەلۆژیی و پەیوەندیی بەستنی وەك ؛ قەوان ، ڕادیۆ ـ ئەمجا تەلەڤیزیۆن ـ بەخۆیانەوە ، بەتووانا و بەهرەیانەوە ببینن ، کە کەم و زۆر ، بەهۆی تۆماربوونی ئاهەنگ و دەنگەوە ، ناوی خۆیان ، زیاتریش بەرهەمیان ـ کە هەیشیانە وون بووە[5] ـ کوێر نەبێتەوە .

بەهای ئەو دام و دەزگایانە ـ بە وێنەیێکی بچووك ـ بەوەدا دەردەکەوێت کە ؛ ئەحەی ناسری[6] گۆرانیی بێژی ـ بێ یادگاری تۆمارکراو ـ بەناوبانگ بە قسە ، هەرگیز ناگاتە



عەلی مەردان 1970

ناوونیشان‌و یادگاری ـ تۆمارکراوی ـ مەلا کەریم . هەر ئەم دووانەش ، هەرگیز ناگەنە عەلی مەردان کە جگە لە تۆماربوونی بەهرەی لەسەر قەوان یان شریتی ڕادیودا ـ با خۆیشی مردبێت ـ دەنگ‌و وێنەی ئاهەنگی تەلەڤیزیۆنیی هەیە[7] .

لێرەدا ـ لەو ڕاستییەوە کە باری سیاسی‌و ژیانی نەتەوەی ئێمە سەخت‌بووەو وەك باری خەڵکی‌تر ڕێك خراوو ئارام نەبووە ـ دەبێت بپرسین ؟ چۆن چۆنیی ، گۆرانیی بێژەکانمان لە ئەو دام‌و دەزگایانە نزیك بوونەتەوە ؟ کە ڕۆشنا کردنەوەیش ـ بەوەڵامی ڕاست ـ باری کۆمەڵایێتی‌و ڕۆشنبیریشمان ، هەروەها لاپەڕەی نادیاری ژیان‌و گوزەران‌و تووانای گۆرانیی بێژەکانیشمان دەست نیشان دەکات‌و چاوی مێژووش ڕوون دەبێتەوە . ئەمجا ئایا هومای ڕێکەوتێکی بێ‌هوودە ـ یان ـ تووانای خۆیان‌و دەستێکی چاکە نزیکی خستنەوە ؟ (کە ئەو دام‌و دەزگایانەش ، وەك خۆماڵیی نەبوون ، حەوت کێویش لە شارەکانی کوردستانەوە دوور بوون ) .

پرسینەوەو کۆڵینەوەیشمان کە ـ جاریّ ـ بەچاوێکی گەشەوە لە گشت دەنوواڕێت ، دڵنیامان دەکات کە 3 هۆ ئەوانی لە قەوان نزیك خستووەتەوە :

**هۆی‌یەکەم** : ـ کەسانی ڕۆشنبیرو خاوەن پیشە کە عومەر قەززاز[8] لە سلێمانییداو قاسم عەلی سەعاتچی[9] لە کەرکووکدا بەڵگەن‌و یەکەمیان حەمدی ئەفەندی[10] هان‌داوەو مەلا کەریمی بردووە بۆ لقی کومپانی‌یێکانی قەوانی « ئۆدیون ODEON و بەیزافۆن BAIDAPHON ـ بەغداد[11] » . دووەمیشیان عەبدوڵڵا سەعیدو[12] محەممەد ئەمینی[13] هانداوەو بردوونی بۆ لقی کومپانی‌یێکانی بەیزافۆن‌و کۆڵۆمۆبیا COLUMBIA بەغداد تەنانەت ـ ڕەنگ هەیە ـ ئەو کەسە لە ساڵی 1924 دا عەلی مەردانی لە کەرکووکەوە ـ کە نزیکی ئەوی‌بووە ـ هان‌دابێت یان بردبێتی بۆ لقی کومپانیای « هومۆ کۆرد ـ HOMOKORD »[14] و بە کوردیی‌و تورکمانیی قەوانی دەر کردبێت .

**هۆی دووەم** : ـ کەسانی بەدەسەلات‌و دۆستی ئاهەنگی کوردیی ، وەك ؛ دۆستایێتیی نووری باویل ئاغای[15] ڕواندزیی‌و محەممەد ئەفەندیی نەورۆز ئەفەندیی ڕواندزیی لەگەڵ (کاویس ئاغای) لاووك‌زان کە لە لای لقی کومپانیای بەیزافۆن ـ بەغداد ، گۆرانیی دەکردووە . هەروەها وەك ؛ (دەرویش عیسای[16] ، گۆرانیی‌بێژو پیاوی حازم بەگی شەمدین ئاغا کە لەسەر فەرماییشتی گەورەکەی قەوانی دەرکردووە (!) .

هەروەها ـ ڕەنگ هەیە ـ لاووك‌زانی کوڕی جزیرا بۆتان (سەعید ئاغا) بەیارمەتیی محەممەد ئاغای حاجی ئاغای شەمدینی لە زاخۆوە هاتبێت بۆ قەوان دەرکردن لە بەغداددا (کە باسی دێت) .

**هۆی سێیەم** : نزیکاتیی‌و پەیوەندیی ژیان‌و گوزەرانی گۆرانیی‌بێژان لەگەڵ کوڕی ئاهەنگ‌و ناسیاوەکانیان لە بەغداددا کە کارگێڕەکانی لقی کومپانی‌یێکان نزیکترین کەس‌و وێنەی ئەو گۆرانیی‌بێژانەش ؛ دایکی[17] جەمال‌و مەریەم خان‌و[18] ئەڵماس محەممەدە[19] .

بە ئەولێکدانەوەیەدا ڕوون دەبێتەوە کە تووانا لە لایێك ، دەستی چاکەیش لە لایێکی‌تر ، بەسەر ڕێکەوتی بێ‌هوودەدا زاڵن . نرخی دەستی چاکەیش ، بەوە زۆرە کە تێکەڵی هەستێکی کوردەواریی بووبێت وەك ؛ هەستی عومەر قەززاز کە لەسەر پرسیارمان دەڵێت[20] :

و ـ هات‌و چۆی بەغدام دەکرد . لە کاسبیدا دەمویست سەیتەرەم ببیّ‌و لە شت بزانم . بزێو بووم . دەچوومە سەیر کردنی ئەو موغازەو شەریکەتانەی قەوان . دەمپرسیی : قەوانی کوردیتان بوچی نییە ؟ گوتیان ؛ کەس نییە گوتم ؛ با هەیە !

پ ـ بۆچی قەوانی کوردیتان نییە ؟ ئەمەت لە چی‌بوو ؟

و ـ زۆر حەزم دەکرد قەوانی کوردیی ببیّ بۆ ئەوەی پیاو گوێی لە زمانەکەی خۆی بیّ .

ئەگەر ئەمە شێوەیێکی ڕووی پەیوەندیی



گۆرانیی‌بێژەکانی قەوان بووبیت . ساحو : ڕووی ئەو پەیوەندییە بەرانبەر ڕادیۆ چۆن بووە ؟

جارێ ، کە دەبێت تەماشاییکی گشت بکەین ، لە پێشدا باس‌کردنی ئەو ڕاستییە پێویستە کە ئەوەیە ؛ کومپانیای قەوان ـ ی بازرگانیی ـ لەگەڵ دەزگاییکی دەوڵەت جودایە . دامەزراندنی یەکەم ڕادیۆی کوردییش ـ 1939 بەغداد ـ بۆ گۆرانیی بێژی کورد نەك هەر بوو بە قیبلە بۆ پەیوەندیی بەستنی نزیك بە جەماوەرێکی زۆرەوە ، بەڵکو هەر دووای داهاتنی هونەری تۆمارکردن لەسەر سیم‌و قەوان‌و شریتی رادیۆیی ـ 1950 ، بوو بە گەنجینەییکی گۆرانیی‌ییکانیان .

پەیوەندیشیان ـ وەك کۆڵیومانەتەوەو خۆیشمان شایەتێکن ـ مایەی 2 هۆیە ؛ یان لە خۆیانەوە چوون ، یان بە هۆی دەستێکی چاکەوە چوون کە دەشێت ئەو دەستە کەسێك ـ یان ـ کۆمەڵەییێك[21] بووبێت کە ئەمی دووابیان لە نیوەندی ساڵەکانی پەنجادا سەری هەڵداو هەتا نهوو هەربەردەوامەو گۆرانیی‌بێژەکانی ئەمانیش ـ بە بڕووای ئێمە ـ لێ‌هاتوو ، خاوەن جەماوەر بوون‌و هەن .

وێنەکانی ئەو پەیوەندییەش زۆرەو دووانیشیان زۆر بەنرخەو هانمان دەدەن ، بڵێین : کێ هەیە نەپرسێت دوو گۆرانیی‌بێژی وەك ؛ عەلی مەردان وحەسەن زیرەك کە بەتوواناو زۆریی بەرهەم ، بە مەقام‌و بەستە ، دوو گەوهەری گۆرانیی کوردین ، چۆن چوونە سەر ڕادیۆ ، کە یەکەم بە خاوەن قەوانیش ناسرابوو ، لەوانەیش بوو ئەگەر ڕادیۆ نەبووایە ، وەك هاوتاکانی هەر بە خاوەن قەوان بناسرایە ـ کە زۆریشی وونە ـ و وا پێشکەوتوو نەبووایە . هەروەها دووەمیش کە بە ڕادیۆوە ناسراو لەوانەبوو ئەو دەزگایە نەبووایە ، لە تاق توواناو هێزیدا سەری هەڵنەدایەو ئەم ناوبانگەو ئەم قوتابخانەیەی ـکە درووستکرد ـ نەبووایە ! جگە لە پرسیارەش ئایا چاکە بەدەم ئاووە ، وون دەبێت :

**عەلی مەردان**

خۆی لە دەستنووسێکی ـ بۆ من ـ لە زستانی 1974 دا ، هەروەها لە کتێبەکەیدا « گۆرانیەکانم ـ 1983 تەنانەت لە گفت‌و گۆییکی تۆمارکراویدا لەگەڵ کاك شەماڵ صائیب ـ 1961 ،[22] لەمەڕ پەیوەندیی خۆی‌و قەوان ـ یان ـ لەمەڕ یەکەم چوونی‌و پەیوەندیی لەگەڵ ڕادیۆ ، هیچ باسێکی نەداوە بەدەستەوە ، بەلام لەو یادگارەیدا ـ لەگەڵ شەمال ـ گوتوویێتی : « لە خاڵۆم عاجز بووم ، لە لەیلانەوە هاتما بەغدا . لێرە لە بەغدا کاك حەمید شاکیر ـ موهەندیس ـ منی برد ، لە باقووبە ( = بعقوبة) منی کرد بە مەئموور مەخزەنی ئەشغال » . هەرلەوێدا زیاتر دەڵێت « لە 1941 — 1942 دا بووکە چوومە لای حەمید ، لە ئیزگە بووم » واتە رادیۆ / ك . ر . م) » .

ئەی چۆن چوو ؟ چی دەستێکی چاکە بردی ؟ مامۆستا کامیل کاکە ئەمین ، یەکەم کارگێڕی ڕادیۆی کوردیی بەغداد ـ هەرچەند پیریێتیی کاری تێ‌کردووە[23] ـ لەسەر پرسیاری ئێمە ، وەڵامی ـ ئەم نهێنییە ـ دەداتەوەو دەڵێت : ـ

و ـ من خۆم شەخصییەن دەگەڕام ، دەچووم بۆ کەرکووك ، هەولێر ، سلێمانی‌و ئەوانە ، بۆئەوەی گۆرانیی‌بێژێك پەیدا بکەین . لە 1940 — 1941 دا لە سەفەرێکدا لە کەرکووکدا بووم لە ئوتێل پەلاسدا . خاوەندەکەی برایم ـ یان ـ عەباسیان پێ‌دەگووت ، لەگەڵ جەماعەتێك لەلای ئیدارەوەو دانیشت بوو . کابراییك بە تورکمانیی ـ قۆریات ـ ی دەگووت منیش کە گوێم لێ‌بوو زۆرم پەسەندکرد . بە ئوتێلچی‌ییکەم گوت کە بانگی کاتە لای من .. هات ، قسەم لەگەڵ کردو پێم‌گوت کێم‌و لە کوێداکار دەکەم . منیش لێم بیست کە ناوی (عەلی مەردان) و خەڵقی لەیلانە گوتم : گۆرانیی کوردیی دەزانیت ؟ ئای ئای‌ییکی بۆ گوتم . پێم‌گوت : هەڵستە وەرە بۆ ئیزاعەی کوردیی ، داخلیی ببە ! وەڵلا گوتی ؛ باشە ! هەڵستام ـ 10 ـ دینارم دایێ بۆ هەقی ڕێگا .. کەچی .. نەهات .

پێنج شەش مانگێکی پێچوو ، بەهارێکی گەرم بوو ، لەگەڵ چەند رەفیقێکی خۆم هاتین بۆ تەماشای (بابە گوڕ گوڕ) ، من بووم ، شاکیر عەلی تیکریتی وەکیلی مودیری ئیزاعەی عەرەبیی عەبدولجەببار سامەڕرائیی مودیری مەطبووعاتی عەرەبیی . لە گەڕانەوەدا بۆ بەغدا ، بەشەمەندەفەر هێشتا نەگەیشتبووینە مەنطیقەی بەشیر ـ لە دەرەجە دوودا بووین ، لە نزیکەوە گوێمان لە گۆرانییبوو . لە محەطەی بەشیر کە دابەزین ، چووینە دەرەجە سێ ، تەماشامانکرد (عەلی مەردان) کۆڕی بەستووە ، گۆرانیی دەڵێت . وەڵڵا ئێمەیش دانیشتین ، کەوتینە گوێ لێگرتنی . لە دوواییدا بە عەلی مەردانم گوت : عەلی گوتی : بەڵێ گوتم : بۆچی نەهاتیت ؟ گوتی : بەخوا ئیشوکارم لە لەیلاندا زۆربوو ، نەکرا ! ویستم هەر بێتو هەڵستام ـ 100 ـ (!) دینارم دایێ کە وەعدیدا ئەم جارە هەر دێت . دێتەوە بیرم برادەرەکانم داوای گۆرانیی عەرەبییان لێکردو ئەویش نەیگوت . کە گەڕامەوە بۆ بەغدا تەقریرم نووسیی ، سەد دینارەکەیان بۆ ئیعادە کردمەوەو (عەلی مەردان) یش لە پاش چەند ڕۆژێك هات بۆ ئیزاعە ، دامەزرا . یەکەم حەفلەی ئای ئای‌بوو کە گوتی . پاشان حەفلەی کرا بە چارەك سەعاتێك ئینجا بە نیو سەعات ، ئینجا سەعاتێك لە هەفتەیێکدا ئەووەڵ جاریش ـ2ـ دینار ، دووەم هەفتەی ـ3ـ دینار ، ئەویش بە تەقریری خۆم ، چووارەم هەفتە بۆمان کرد بە ـ4ـ دینار بۆ دەرکەوتنی عەلی مەردانیش لە ئیزاعەوە ، خەڵقیی زۆر زۆر مەتحو سەنایان کرد ، قاقەز ، تەلەفوونمان بۆ دەهات .

پ ـ هێنانی عەلی مەردان لە لایەن ئێوەوە بۆچی ؟

و ـ هێنانی عەلی مەردان بۆ خزمەتی گەلو نیشتمان‌بوو ، سانییەن دەمانویست ئیزاعەی کوردیی پەرەبسێنێو گەورە ببێ . لە نیو سەعاتو دوو سەعات تێپەر ببێت !!

**حەسەن زیرەك**

ئەی ئەم ؟ ڕاستییەکەی ـ ئەو ـ کە



ئەمەکداری گۆرانیی یادگاری باوو باپیری بوو ، ئەمەکداریشی بۆ ڕادیۆ نیشانداوە کە بە شیعر(*) (فیلمۆچکەیێکی = فیلمێکی کورت) لەمەڕ بەشێکی ژیانی ئەو سەردەمەی لە بەغدادا گێڕاوەتەوەو دەڵێت :

« بغداد » پاك گەڕام شارع ، چاخانە
بووم بە شاگردی مسافر خانە
باش کارم ئەکرد ڕۆژو شەوانە
لە ئوتێل « شمال » کە جێی کوردانە
« سەلاح » کوڕێ بوو پێی گوتم بدوێ
بەخوا ئازایە شەوو ڕۆژ نانوێ
پێی گوتم برا بتبەم بۆ [ ڕادوێ ]
هەوڵت بۆ ئەدەم بەڵکو بۆت بلوێ
پێم ووت ئەی برام ئەی لاوی جەسور
لە بردنی من هیچ مەکە قسور
جنسیەم نیەو خەڵکی ئێرانم
مەشورم بە [ زیرەك ] ئاوازی خوانم
بردمی بۆ ڕادیۆ بێ منەت بە گیان
جوان ڕەتی کردم لە پۆلیسەکان
جوان ناساندمی بە « عادل عرفان »(**)
هەمە کارە بوو لە ڕادیۆی کوردان
گوتی برام کوردی ؟ تۆش لە خۆمانی

ئا بۆمان بڵێ بەنێ گۆرانی
کە بەندێکم گووت بە دڵی پڕ گریان
لە خوداوە جەرگیان بۆم‌بوو بە بریان
گوتیان بەراستی لەهجەی شیرینە



بەڵام داخەکەم کە بێ تەمرینە
چەندە رێك خەرو سەدای خەمگینە
چەندە بەجۆش و چەندە بەتینە
مەخلەس دامەزرام لە بەشی کوردی
لە ڕادیۆ « بغداد » هێجگار بەمەردی
زوڵیان لێکردم مانگی « 6 » دینار
مانگ لەگەڵ مانگ زیادیان کرد ناچار

لەنێو ئەو دێڕانەشدا کە رووناکیی ئاوێنــەی ڕاستین ، ناوی (سەلاح) شایانی ناسینەوەیە : (پێی گوتم برا بت بەم بۆ ڕادیۆ .. هەوڵت بۆ ئەدەم بەڵکو بۆت بلوێ) .

ئایا ئەم سەلاح ناوە ، ئەو ـ کاك سەلاح ـ یە کە لەسەر گۆرانیی « ئەسمــەر یارم جــوانــە » لە ســاڵی 1963 دا ، لە ئێرانەوە نامەی[28] سکالای بۆ نارد بۆ ڕادیۆ ؟ یان ســەلاح ناو یەکێکی ترە ؟

کاك سەلاحــەکە ( = ســەلاح محەمەــەد حیلمی) لە نزیکەوە دەیناسین و وەرگێڕو وێژەوانی ڕادیۆی کوردیی بەغداد بوو ، پێی گوتووین ـ ئەو ـ حەسەن زیرەکی نەهێناوە ! ئەی سەلاح کێیە ؟

پاش لێپرسینەوەو گەڕان بۆ ڕاستیی ، سەلاح ناو هاتە بەرچاوو زمان : ـ

و ـ من ، سەلاح عیرفانم[27] . لە زستانی 1950 دا کە چووم بۆ بەغداد ، بۆ خوێندن لە بەشی ئینگلیزیی کۆلێجی ئـادابو علوومدا ، هەتا ساڵی 1954 ، لە بــەشی‌کوردیی ئێـزاعەدا گــوتاری هــەفتانــەم دەربارەی کــۆمــەڵایــەتیی‌و ویــژە ، پێشکەش دەکرد .

پ ـ لەو مــەودایەدا چی یــادگــار ، بیــرەوەری‌یێکت لەگــەڵ گۆرانیی بێژێك هەیە ؟

و ـ گەورەترین یادگار کە ـ من ـ هەم بێت و مایەی بەختیاریە ئەوەیە ؛ من بووم حەسەن زیرەکم ناردە ئێزاعەی کوردی کە پێش چوونی ، ناسیم .

پ ـ چۆن ؟

و ـ هەتا ئێستا لە هیچ جێگایێکدا من ئەم قسەیەم نەکردووە ، نەم گوتووە ، ئیللا لە دانیشتنی تایبەتی خۆمانەدا نەبێ بێت . گەلێك جار نووسراوە ، لە لایێ حەسەن زیرەکیش خۆیەوە ، چیرۆکی ئەمەیش دەگەرێتەوە بۆ ســاڵی 1955 مانگی تەمووز ـ بوو ، چــووم بۆ بــەغدا بــۆ ئەوە واز لە مــودەرریسییــەتی بهێنم ـ لە هــەلەبجــەدا بــووم ـ و وەزیفــەییکی تــر بــدۆزمــەوە . لە بــەغــداد لە ئــوتێــلی ـ شیمالولکەبــیر ـ دابەزی‌بــووم خاوەنــدەکەی حــەمەی دەرویش کەریمیان پێ‌دەگوت . لەگەڵ لاوێــك لە ژوورێك بووم . ناوی خدر ئاغا بوو خەڵکی قەلادزی کە مەشــوور بوو ـ بە خدرئاغای ئاغا ژن ـ وا بزانم ئێستاش ماوەو لە قەلادزێدایە . خدر ئاغا بــە منی گوت : کــورێك هــەیە ، کــوردە ، زۆر جــوان گــۆرانیی دەڵێت و دەنگیشی زۆر خۆشە ، بەڵکو یارمەتیی بدەیت ـ فەقیرە ـ لە ئێزاعــەدا شتێکی دەست بکەوێت ، ئاوا گۆرانیی بڵێت ! پرسیــارم لێکرد کە بیهێنێت .. هاتە بەر دەرگەکە ، لێم پرسیی : گوتی « قوربانی چاوت بم ، قوربانی بالآت بم ! » ئەولەهجەیە لە لای من شتێکی غــەریب بوو ئــەو ساتــە . زانیم کەوا کوردی ئێرانە . تەماشایشم کرد ـ بۆیە ـ خزمــەتچییە ، ئــەرزەکەی پــاك دەکردەوە . ئێستــاکە لە یــادمــدایــە ، سەتڵەکەی بەدەستەوە بوو ، هەروەها ئەو گوێنییەی کە ئەرزەکەی پێ پاك دەکردەوە . لە حاڵەتێکی زۆر فەقیرییدا بوو ، جلەکانی زۆر درابوو ، شەرواڵەکەی هەڵکردبوو تاکو ئەژنۆی ، هەمووی قوڕو ئاوی ئوتێل سرین‌بوو . گــوتم : « تۆ گۆرانیی دەزانیت ؟ » گوتی : « بەڵێ » . گوتم : « دە وەرە ژوورەوە بــۆم بڵێ ! » . گــوتی : « ناتــوانم لەبەر خودان ئوتێلەکە ، گوێی لە دەنگم دەبێت و پێی ناخۆشە ، وەرە سەربان ! . کە گوتی ؟ وەرە سەربان ، ئێوە خۆتان بیهێننە یاد ، لە چلەی هاوینی بەغدادا بچیتە سەربانی

ئوتێل ، لە قرچەی نیوەڕۆدا ، گۆرانیی بڵێت چی شتێکی سەیرو ئەنتیکەیەو خەڵك گوێیان ، چاویان لێبێت ، دەڵێن چی ؟ بەڵام خدر ئاغا ئیلحاحی زۆر لێکردم کە لەگەڵی بڕۆم . گوتم « باشە با بڕۆیین ! » .

چووینە سەربان . لەسەر دوو قەڵویڕەی ڕەق و ڕووتی گەرمدا ئەو بەرانبەری منو منیش بەرانبەر ئەو زۆر لەیێکەوە نزیك بووین ، خدر ئاغاش لە تەنیشتمەوە بوو . حەسەن کە ئێستا پێی دەڵێن حەسەن زیرەك ، دەستی خستە پەنا گوێی ، دەستیکرد بە گۆرانیی منیش حەزم بە گۆرانیی کوردیی دەکردو لە ئیزاعەیش گوێم لە هەموو گۆرانیبێژەکانی ئەوسا بوو ، بەڵام حەسەن وێنەی ئەوان نەبوو . خوا دەیزانێ چەند کەسانیتر لە پێش مندا گوێیان لێبووەو گوێیشیان نەداوەتێ .

ڕاوەستا . گوتم : « ڕامەوەستە ، گۆرانیی خۆت بڵێ ! » . گوتی : « ئاخر تۆ ، خۆ گەرمات دەبێت ! » گوتم « هیچ . گەرمابیم لە بیر چووەوە . گۆرانیی‌یێکانی تۆ هێندە خۆشە ، دەتوانم هەموو نیوەڕۆییێك بەم گەرمایە گوێت لێبگرم . تۆ دەتەوێت من یارمەتیت بدەم ، وا بزانم دەبێت تۆ یارمەتیمان بدەبیت گوێمان لە گۆرانیی‌یێکانت بێت . دەنگت ، بەڕاستیی زۆر زۆر خۆشە هەڵستە بچینە خووارەوە ، حەز دەکەم نامەت بۆبنووسم ! » . چووینە خووارەوە . نامەیێکم بۆ نووسیی ، ئێستاکە زۆر باش دێتەوە یادم کە بە چی شێوەیێکم نووسیی بۆ کاك کامیل کاکە ئەمین .. گوتم : کاك کامیل ، ئەم کوڕەتان بۆ دەنێرم کە دەیەوێت لە ئیزاعەدا بە گۆرانیی‌بێژ دابمەزرێت . من خۆم ، لەسەر بانی ئوتێلەکە ئیمتیحانم کردووەو بە پلەیێکی زۆرباشدا سەرکەوتووە . هەروەها گومانم نییە کەوا لە لای ئێوە زۆر باش دەردەچێت ، بەڵکو یارمەتیی بدەبیت و بەگۆرانیی‌بێژ دابمەزرێت ، چونکە بە ڕای من لە هەموو گۆرانیی‌بێژەکانی کە لامانن ، باشترە .

ئەو نامەیەو هێندێك پارەی کەم ـ زۆر کەم ـ کە لە توانامدا بوو ، دامێ هەتا سوواری پاس ببێت و بچێت بۆ ئیزاعەو ڕێگایشم بۆ وەسفکرد . پێم گوت ؛ ڕۆژێکی دوو شەممە بچۆ ! ئەو دوو شەممەییشم دێتەوە یاد . کە ڕۆییشت و




هاتەوە ، گوتی : « پۆلیسەکانی بەردەرگا نەیانهێشت بچمە ژوورەوە ! » گوتم : « ئەی نامەکە ؟ » . گوتی : « نامەکەیان لێ وەرگرتم بۆیان برد ! » .

پاش چەند ڕۆژێك کاك کامیلم دییەوە گوتی ؛ بەڵێ هات و ڕۆژی ئیتمیحانمان بۆ داناوە . دووای ئەوەیش دیمەوە ، گوتی ، قبووڵمان کرد بە گۆرانیی‌بێژ !؟

بۆ دڵنیابوونی(*) تەواوەتیی ، دەربارەی ئەو باسە پرسمان بە مامۆستا کامیل کاکە ئەمین کرد : ـ

و ـ سەلاح عیرفان دەناسم . کاغەزێکی بۆ نووسیم و کوڕێکی لەگەڵ ناردبوو ، ئەو کوڕە ، گوایە ؛ حەسەن زیرەکە . پۆلیسەکان مەنعیان کردبوو ، بەڵام کاغەزەکەیان لێوەرگرتبوو ، گەیاندیانە دەستم . من لەسەر ئەوە ، دووبارە لەپاش چەند ڕۆژێك ، چاووم بە سەلاح عیرفان کەوت . بە منی گوت ؛ چیتکرد بۆ مەسەلەی حەسەن زیرەك گوتم ؟ وەعدەی ئیتمیحانمان پێداوە . فەقەت ئەمە شەهادەی جنسییەو دەفتەری نفووسی هەیە ؟ گوتی ؛ بەخوا نازانم ! کە حەسەن زیرەك هات بۆ ئیمتیحان ، لێم پرسیی ، گوتی ؛ نیمە ! هەڵستام لەپاش دوو سێ ڕۆژ ناردم ـ بە کاغەزێکەوە ـ بۆ سلێمانی بۆ لای مەئمووری نفوسی سلێمانی ـ بابان ـ ناو بوو . ئەو دەفتەری نفووسی بۆ دەرهێناو هاتەوە بەغدا . لێرە بەواسیتەی مودیری جنسییەوە ، جنسییەی عیراقیشم بۆ دەرهێنا ، ئینجا دامان مەزراند(*) .

پ ـ هەفتەی بە چەند ؟

و ـ بە 2 دینار . لەپاش مانگێك بۆمان کرد بە 3 هەتا گەییشتە 6 دینار .

پ ـ ڕەواجی هەبوو ؟

و ـ زۆر زۆر .



- بەشی دووەم -

## ● سەعید ئاغا - لاووکزان[*] .

بولبولی کوردستانە کوڕی جزیرا بۆتانە کە بە سەعید ئاغای جزیری - ش ناوبانگی دەرکردووە . کوڕی محەممەدە بۆیێکە ناویش دەبرێت بە سەعیدی حەمۆ - یان - حەمێ . ڕەنگ هەیە لە گوندی « عەندیوەر » و لەپێش 1900 دا لە دایك بووبێت ، کە ئەو گوندەیش لەپاش ساڵی 1920 لە لایێن لەشکری فرانسزی[*] داگیرکەرەوە خرایە پاڵ سووریا . سەعیدیش کراوە بە ژاندرمەو پاشان هاتووەتە « دیر ئەلزوور » و لەوێدا مامەکانی ئەب یووسف سەعید چایخانەیان بۆ داناوە . بە دزییەوە هاتووەتە کوردستانی عێراق و - ڕەنگ هەیە لە زاخۆوە - بەیارمەتیی محەممەد ئاغای حاجی ئاغای شەمدینییەوە هاتبێتە بەغدا و لە لای لقی کومپانیاکانی قەوانی بیگانە ، گۆرانیی لەسەر قەوان دەرکردبێت . ئاشنای گۆرانییبێژە کوردەکانی وەك : ئەلماس محەممەدو مریەم خان و حەسەنی جزیری و هی‌تر بووەو بەزۆریی هەر جارێك هاتبێت ، میوانی ئەلماس خان بووە . بەشێکی ژیانی ، هەتا مردنی (کە ڕەنگ هەیە لە نیوەندی ساڵەکانی پەنجاکاندا بووبێت لە لوبناندا ڕابوواردووە کە لەوێدا بە نەخۆشییێکی قورگ مردووەو لەوێشەوە تەرمەکەیان بردووەتەوە بۆ دیاربەکر . لەنێو کەس و کاریدا ، برایێکی ناسراوە « چوولی » ی بووە . ڕەنگ هەیە وەجاخ کوێر نەبێت .

ئەوی دیارە ، لە لای 2 کومپانیای قەوان[*] (هس ماسترس ڤۆیس : His MASTER 's VoicE لقی بەغداد - چاپکراوی پاکستان) و کومپانیای قەوانی (چقماقچی - CHAK MAKCHIPHON بەغداد . چاپکراوی «!») . لە نێوانی ساڵانی 1938 بەدوواو 1956 دا قەوانی دەرکردووە کە کومپانیا بازرگانییێکانی تورکیاو ئێرانیش وێنەیان لەسەر چاپکردووەتەوە .

وەك تەواوی ژیانی ڕوون نییە ، ژمارەی تەواوی قەوانەکانیشی ، گۆرانییێکانی دیار نییە . گۆرانییبێژەکان بەوەستایێکی لاووك و پەستەی کوردیی دەژمێرن کە ئاوازو هونراو دانانیشی لەدەست هاتووە . بەناوبانگ و کۆڵینەوەش ، هاوتاییکی کاویس ئاغای لاووکزانە ئەگەرچی ئەمی دوایی لە ئەو دەوڵەمەندترە و دەنگی ئەویش لە ئەم بەرزترە .

لاووکی مێژوویی ، ئەڤینداریی ، پەستەی خۆشی گوتووە . دەنگی گڕ ، بەرزو بەهێزە ، زمانی ڕەوان ، دەربڕینی کاریگەرو دڵگیرەو هەناسەی درێژە . قورگی سنووقێك ئاوازی ڕەنگینەو بەرەگی باوو باپیرییەوە بەستراوە .

لێی دەگێرنەوە کە باوەڕی بە نەتەوەی کوردی هەبووە ! ئەلماس محەممەدی - کۆچکردوو - بۆی گێرامەوە گوایە گیراوە . حەسەنی جزیری - کۆچکردوو - لەم بارەیەوە بۆی گێرامەوە گوایە ؟ برایێکی سەعید ئاغا گیراوەو - ئەویش - بۆ ڕزگارکردنی براکەی لە مردنی مستەفا کەمال پاشادا (!!) بە قەوان مەقامێکی دەرکردووە . هیچ بەڵگەیێکیش بە دەستەوە نییە کە گۆرانییبێژی ڕادیوێك بووبێت . لایشمان ڕوون نییە ئەگەر تەنبوورڤان بووبێت !

(ئەم ناسینەوە یەکەم جارەیە ، کۆششێکە کە چاوەنوواڕی کۆششیتره) .

## ● گۆرانییێکانی

ئە : - ئەوانەی بەناو بیستوومانن و نەماندیوون[*] :

1 — لاووك : عەیشانێ .

2 — = : شەڕی تییارێ .

3 — = : عەدۆی نووران .

بێ : ـ ئەوانەی لە قەوانەوە «!» خراونەتە سەر شریتی ڕادیۆی کوردیی بەغدادو خۆمان ـ بەقەوان[34] ـ نیمانن :

4 — لاووك : لێدایێ . ـ

5 + 6 ـ مەقام + پەستەی : لەبیۆلەبیۆ

7 — پەستەی : نۆڤێ . ( = ناوی ئافرەتە/ك . ر. م) .

تێ : ـ قەوانی کۆکراوەیی خۆمان .

یەك[35] : قەوانی کومپانیای « هس ماسترس ڤۆییس »

8 — دیوی یەکەم : هی واخلمین «ژ» OML . 473 / NO. 11020

* تێبینی : ـ ماوەی 3,22 دەقیقەیە . ڕاستییێکەی لاووکی بەسۆزو ئەڤینداریی بەناوبانگی « ئەحمەدی مووسێ » یە . ڕەنگ هەیە دەوروبەری پێش ـ یان ـ پاش جەنگی جیهانگیریی یەکەم بێژرا بێت کە ئەحمەدی مووسا لەو مەودایەدا ژیاوەو خەڵکی ناوچەی (ماردین) ە ... نموونەیێکی لاووکەکە : ـ

ئاخ هەی واخ لمین مالا یامنێ
ئەحمەدێ مالا موویسای چەوە م°دخازێ م°نادنێ
ئەحمەدێ مالا موویسای تەنبوورڤانە
تەسبیحی دەستی ویدا کەهرەبانە .

9 — دیوی دووەم : منوفار نوفار «ژ» OML. 474 NO. 11020

* تێبینی : ـ ماوەی 3,23 دەقیقەیە . ناوەکە هەڵەیە . ڕاستییێکەی پەستەی : ئەو بەغدایەی پایتەختە ـ یە . دیارە دانانی خۆییتی . بەڵگەش باسە[36] لەمەڕ ـ حەسیبە ـ ی تاکە کچی مندالی ئەڵماس محەممەد کە پەستەکەیش خۆی بەڵگەیە کە دەڵێت :

ئەو بەغدایێ پایتەختە
ئەو حەسیبە ل°سەر تەختە
شوویشا چائێ ل°دەستە
ئەز لێبدەم نەختە
لێ بەرخێ
لێ صەبرێ
لێلێلێ . لێلێ .
ـ یان ـ

چووم بەغدایێ ب°دکانە
تەختێك تێدا ڤەدانە
مینا تەختێ سوڵطانە
دلێ من ڕەبەنبوو
دل کەتە کەچا ئەلماس خانە
لێ بەرخێ
لێ صەبرێ
لێلێلێ . لێلێ .

دوو : هەمان کومپانیای پێشوو .

10 — دیوی یەکەم : لیلی دیرانی «ژ» OML. 475/NO. 11021

* تێبینی : ـ ماوەی 3,16 دەقیقەیە . لاووکی لێلێ دیرانێ ـ یان ـ لۆلۆ دیرانۆ ـ یە کە نیمچە میژوویییە . لەمەڕ شەڕێکی نێوان سەرۆکی فەلەی ناوچەی (طورعابدین) : حەنێی حەیدۆ و شەمعوونی حەنێ لەگەڵ عەلی بەتێی سەرۆك عەشرەت و موسایی فاطمێ کە ئەمیان لە یەکەم جەزرەبەدا کوژراوە . هەروەها 44 کەسیش لە عەسکەری عەلیێ بەتێ ، کوژراوون و شەڕەکەیش لە گوندی « دگوورا » دا قەوماوە کە لە گوندی « چیلکێ » هەتا « قەزای مدیات » هەتا « دەرگای نسیبین » هاتووەو 6 گوندیش تالانکراوە .

لاووکبێژ چەند بێلایین بووە لە گێڕانەوەی هەستی خۆیدا ، هەروەها بەپەژارە بووە . لە لایێك موسایی فاطمێ بە بابی فەقیرو ژار ناو دەبات ، لەو لایشەوە حەنێی حەیدۆ هان دەدات بۆ پەلامارو ئازاییتی . هەرە گرنگ ئەوەیە کە دەڵێت : شەڕەکە (فەرمانی گرانی سوڵتانی تورکانە) . ئەم نیشانەیە هانمان دەدات بڵێین ـ ڕەنگ هەیە ـ شەڕەکە بە فەرمانی سوڵتان عەبدولحەمید ـ یان ـ کەمالییەکان بووبێت ! ؟

11 — دیوی دووەم : یار جاورا[37] «ژ» OML. 476/NO. 11021

* تێبینی : ـ ماوەی 3,20 دەقیقەیە . ڕاستییێکەی پەستەی : یار گەورێ ـ یە کە دیارە دانانی خۆییتی و لەسەر کیژێکی (گەورێ = ئافرەتێکی سوورو سپیی) جووانە کە تەماییتی بیفرێنێت بۆ عەندیوەر هەتا بەغدا .

سێ[38] : هەمان کومپانیای پێشوو .

12 — دیـوی یـەکــەم : لاووکــا رئیس بلدیــە محمــد آغــا «ژ» OML . 878/No . 11019

* تێبینی : ماوەی 3,22 دەقیقەیە . لاووکێکە کە دیارە دانراوی خۆیێتی و لەسەر ڕەئیسی بەلەدییەی زاخۆ ـ محەممەد ئاغای کوڕی حاجی ئاغای یووسف پاشای شەمدینییە کـە ستاییشی خـۆیو باوکی کـراوەو بە شـانو باهــووی خـانـەدانیی و ـ عەدالەت ـ و کۆشك و دیوەخانیدا هەڵدەڵێت . (پێم وەهایە ئەم بنەماڵە بەدەسەلاتــە پشتوپەنــای خەڵکیو بـەتایبــەت کۆچ کردووەکانی جزیرا بۆتانو گۆرانییبێژەکان بووە کـە مریـەم خانیش هەر لە زاخودا گیرساوەتەوە) .

13 — دیوی دووەم : هی لیلی لیلی «ژ» OML . 479/1101q

* تێبینی : ماوەی 3,20 دەقیقەیە . پەستەییێکی ئەڤینـدارییە و دیارە دانراوی خۆیەتی کە تەواوی گۆرانییێکە بەم جۆرەیە :

ئاخ .. ڤی سەقلانی ب°حەلانە
ڤی سەقلانی ب°حەلانە
کراسێ لەیلێ کیتانە
دەستی لەیلێ بگیرن ، بینن ژمالا قێیمقامە
دەستی لەیلێ بگیرن ، بینن ژمالا قێیمقامە

●

لەیلێ تۆ لەیلا تەیێ
ڕەبەنێ تو لەیلا تایێ
ئاخ ب° طۆب و تەفرە(*) نایێ
مەحبەتا دلێ من ب° خوایێ
ب° طۆب و تەفرە نایێ
شیرینا دلێ من ب° خوایێ

ئاخ بەر مەکتەبێ مەرمەرە
پشت مەکتەبێ مەرمەرە
مەرمەرە سوور و زەرە
کراسێ لەیلو حەفت بەرە
حەجی لەیلۆ ناس ناکێ
ئەو شینك بەرامبەرە
حەجی لەیلێ ناس ناکێ
دینێکی بەرامبەرە

●

ئاخ .. ڤی سەقلانی و ب°بییە
ڤی خوپانی ب°بییە
یەهـ .. کراسی لەیلۆ مۆهرییە
دەستی لەیلۆ بگیرن ، بینن ژمالا میددەعییە
دەستی لەیلۆ بگیرن ، بینن ژمالا میددەعییە

●

لەیلێ تو لەیلا تەیی
ڕەبەنێ تۆ لەیلا تایی
ئاخ .. ب°طۆب و تەفرە
مەحبووبا دلێ من ب°خوایێ
ب°طۆب و تەفرە نایێ
مەحبووبا دلێ من ب°خوایێ .

●

ئاخ لەیلێ چمما دەی ناکی
ڕەبەنێ چمما دەی ناکی
دلێ ئیسب خۆش ناکی
ژبەغدایێم ڕێ ناکی ؟
ژبەغدایێم ڕێ ناکی ؟

**چووار(*) : هەمان کۆمپانیای پێشوو .**

14 — هـەردوو دیو : مصـطفی کمال پـاشا . قسم 2.1 «ژ» OML. 480,481 / NO. 11017

* تێبینی : ماوەی 5,42 دەقیقەیە . بە باوەڕی ئێمە مەقامێک باسەکەی دانراوی خۆیێتی کە لە کۆتاییشـدا بە کـۆپلێیێکی تورکیی دەبیرێتەوە . لەمەڕ مردنی «!!» مستەفا کەمال پاشای (!!) کە ڕیکەوتی 1938 ه . دەڵێت کە میللەتان لە پـاش مردنی ڕەحمەتی بۆ دەنێرن « !!! » و هەروەها ناوی فەوزی پاشا و عیسمەت پاشا «!!» دەبات کە هاتوونەتە جێگای باسکراو . لە ڕووی ڕەنگینی ئـەداوە زۆر بـەنـرخـە . مێـژووەکـەیش ڕووناکییێك بوو بۆ وادەی دەرکردنی قەوانەکە .

**پێنج(*) : هەمان کۆمپانیای پێشوو .**

15 — دیوی یەکەم : شری نادربگی «ژ» OML. 477/ NO.11022

16 — دیوی دووەم : حیامان آمان «ژ» OML . 486/NO. 11022

* تێبینی : لەبەر بریندارییی قەوانەکە ، ماوەیان ، نیشانە نەکرا . هەردوو لاووکن و یەکەمیان نیمچە مێژوویی و دووەم فۆلکلۆرییە .

شەش[30] : کۆمپانیای « چەقماقچی »

17 — دیوی یەکەم : هیلە خانم 1 . مقام کوردو «ژ» N.S. 149 . Sj . 4 OJME 421 — 1

* تێبیتی : ماوەی 3,26 دەقەقەیە . ڕاستیییێکەی لاووکێکی ئەڤینداریی زۆر بەسۆزو ڕەسەنەو لەفۆلکلۆر دەچێت . ناوەکەیشی بە هەڵە نووسراوە ، ڕاستیییێکەی « های لێ خایینۆ » یە .

18 — دیوی دووەم : وەرە خانم وەرە 2 . بستە «ژ» N.S. 149 . sj . 4 OJME 422 . 2

* تێبینی : ماوەکەی 3,11 دەقەقەیە . پەستەییێکە بەو ناوە کە بەسەر دیاربەکر و ڕوباریو شەپۆلەکانی ئاویداو خشڵو موتو مووڕووی ملوانکەو چاوی ڕەشو بەڵەکی دولبەرەکەیدا هەڵدەڵێتو هیوادارە کە لەگەڵی بچێت بۆ وڵاتی گەرمێنی شام . دیارە ئەمەیش دانراوی خۆییتی .

حەوت[31] : کۆمپانیای « H . C.T ایران، ساخت کارخانە »

19 — دیوی یەکەم : حسنی موسی «ژ» 1199

20 — دیوی دووەم : درویشی عبدی «ژ» 1200

* تێبینی : لەبەر بریندارییی قەوانەکە ، ماوەیان نیشانە نەکرا . هەردوو لاووکی نیمچە مێژوویی ، فۆلکلۆریی بەناوبانگ و بەنرخنو لە لایێن گۆرانییبێژی تر گوتراوون . ئەم قەوانە چاپکراوێکی سباختەیە .

## پەراوێز ـ سەرچاوە

(1) — بنووارە ڕۆژنامەی (ژیان ـ س 10 ، ژ . 447 . شەموو 7 تەمووز 1935) [ تێبینی : بەدەستکاریو ڕاستکردنەوەیی نووسیومانەتەوە ] .

(2) — مەلاکەریم = مەلاکەریم ئەحمەد : 1885 — 1939 سلێمانی . [ تێبینی : کە پیرەمێرد لێی دەڵێت : ئەمڕو هێزی دەستی نەبوو بمشێلێ ـ مەبەست ئەوەیە ، وەك ناسرابوو : ناتری حەمام بوو ] بۆ ناسینەوەیشی ، بنووارە لێکۆڵینەوەمان ـ وێنەی بولبولی کورد مەلا کەریم لەلای کێیە ؟ ـ ڕۆژنامەی : هاوکاری . ژ . 478 . 11 ی حوزەیرانی 1979 .

(3) شاعیرانیکورد ، هەر لە کۆنەوە ـ بۆ وێنە ـ مەلای جزیری . ئەحمەدی خانی ، خانای قوبادی ، مەولەوی ، نالی ، مستەفا بەگی کوردیی ، ناوی ساز ، ئاواز ، ئاهەنگیان بردووەو کەمیشیان ناوی گۆرانیی بێژەکانیان هێناوە . مستەفا بەگی کوردیی یەکێکە کە وەفادارانە ـ جگە لەناو بردنی سازو ئاواز ـ ناوی چەند کەسێکی مۆسیقاژانو گۆرانیی بێژی هێناوە . (بنووارە دیوانی) بەڵام کەسیان وورد باسیان نەکردوون .

(4) — وەك حەمدی ئەفەندی ، عەلی مەردان ، سەیید عەلی ئەسغەر ، مەولوودزادە محەممەد سەعید ، عەبدوڵڵا سەعید . محەممەد ئەمین ، دایکی جەمال . مریەم خان . ئەلماس محەممەد محەممەد ئاغا (محەممەد عارف) حسن ئاغا (حسن جزیری) . تایەر تۆفیق . ڕەسووڵ گەردی . حەسەن زیرەك .. هتد .

(5) — وەك حەمدی ئەفەندیی ، قەوانەکانی وونە ، ژمارەییێکی زۆر عەلی مەردانو چەند کەسێکیتر کە ناویان براوە . بووژاندنەوەو ئاشناکردنی ئەو قەوانانە ـ لەلایێن هەر کەسێکەوە بێت ـ خزمەتە بۆ مێژووی هونەری گۆرانیی کوردیی !

(6) — ئەحەی ناسر : 1876 — 24 ئەیلولی 1923 لە سلێمانییدا بەکوشتچووە . قەوانی نییە . بە سەرگوروشتەی جۆر بەجۆر ناوبانگی دەنگ خۆشیی هەیە . بۆ ناسینی بنووارە : ئەحەی ناسری هونەرمەند . نووسینی ـ کۆچ کردوو ـ غفور رشید داراغا چاپخانەی کامەرانی ـ 1971 سلێمانی .

(7) — هێندەی ئاگاداربین ، عەلی مەردان ـ (1904 ! — 1981) چەند مەقامو پەستەییێکی ، بە ڕەشو سپی ، لە ئاهەنگدا یان لە ستۆدیۆدا بە دۆبلاژ ، گورانیی تەلەڤیزیۆنی هەیە . یەکێکیان مەقامێکی ؛ ئەڵڵاوەیسی ـ یە . موخابن بە تەلەڤیزیۆنی ڕەنگاو ڕەنگ هیچی نییە .

(8) — عومەر قەزاز = عومەر حاجی فەتاحی قەززاز . 1904 — 1984/3/14 لە سلێمانییدا کۆچیکرد . یەکەم وەکیلی قەوانە ، یەکەمەکانی هێنانی سینەما ، سۆدەو سیفۆنە بۆ سلێمانیی . هەروەها لە چلەکاندا باوەڕ ، پێکراوی گۆڤاری گەلاوێژ بوو لە سلێمانییدا . لە 1979/5/11 دا گفتوگۆمان لەگەڵ تۆمارکردووە ـ باسی چۆنێتی بردنی مەلا کەریم دەکات بۆ قەوان دەرکردن ـ کە بڵاوکراوەیی ڕۆژنامەی : هاوکاری : ژ . 490 . دوو شەممە 3 ی ئەیلولی 1979 یە . هەمان گفتوگۆی لە بەرنامەی « ڕۆژێ لە

ڕۆژان ، ڕادیۆیی ئێمەدا بڵاوکراوەتەوە (هەر لەو ساڵەدا) .

(9) — قاسم عەلی سەعاتچی : دانیشتوویێکی شاری کەرکووك بووە دراوسێ ماڵی خاڵی باوکم بووە . 25 ساڵ زیاترە کۆچی کردووە . یەکەم وەکیلی قەوان و ڕادیۆ و سەعات بووە لە کەرکووکدا . گوێگری جارانم ، دۆستم کاك نەجات محەممەد جەبار لە 1980/3/20 دا نامەیێکی بەنرخی بۆ ناردووم و دەڵێت کە (قاسم سەعاتچی . عەبدوڵلا سەعیدو ئەمین باخەوانی بردووە بۆ دەرکردنی قەوان لە بەغداددا) .. زیاتر دەڵێت کە (عەلی مەردانیش ئاشنای ئەوان بووە) . خاڵۆزای باوکم لە 1983/11/3 دا بۆی گێڕامەوە کە ـ دەشێت ـ هەر ئەو عەلی مەردانی هان دابێت ـ یان ـ بردبێت بۆ قەوان دەرکردن .

(10) — حەمدی ئەفەندی = حەمدی ئەمین ئاغا حسێن ئاغا . 1887 — 1949 لە سلێمانییدا کۆچیکردووە . بۆ ناسینی بنووارە لێکۆڵینەوەمان ـ یەکەم گۆرانیی بێژی سەر قەوان : حەمدی ئەفەندی ـ گۆڤاری : (کاروان ـ س . 1 . ژ 10 .) .

(11) — هەروەها خۆیشی لە لای کومپانیای (هس ماستەرس ڤۆییس) چەند قەوانێکی دەرکردووە .

(12) — عەبدوڵلاسەعید : ـ کاك نەجات لە نامەکەیدا ـ وەچەی ـ عەبدوڵلا سەعیدیشی ناوبردوودو لەوان و ناسیاوانییەوە ، باسی عەبدوڵلای وەرگرتووەو دەڵێت : (عەبدوڵلا سەعید ئیسماعیلە ، ڕیشەی عەربەت ـ یە . لە 1898 دا هاتووەتە دنیاو لە 1943 دا ـ شەوی جەژنی ڕەمەزان ـ بە خوێنپژینی لووت ، کۆچی کردووە . لە دەورو بەری 1931 — 1933 دا قەوانی دەرکردووە) . بۆ قەوانی بنووارە لێکۆڵینەوەمان ـ کۆمەڵێ قەوانی بەنرخ ـ ڕۆژنامەی : هاوکاری . ژ 497 + 498 ڕێکەوتی 22 ، 29 تشرینی یەکەم 1979 .

(13) — محەممەد ئەمین : (عەلی مەردان لە دانیشتنێکی دوو قۆڵیی 1979/7/13 دا باسی بۆگێڕاینەوە ، دەڵێت : خەڵکی هەفتەغار بووە . هاوڕێم بووە ، چایخانەیێکی لە ناو دارتاشخانەکانی کەرکووکدا هەبووە حەمەمینی کۆتەرە ملیشیان ناوبردووە . مردووە .) دوو قەوانیشی لە ـ کۆمەڵە قەوانی بەنرخ ـ لایێن ئێمەوە ئاشنا کرایەوە . بنواڕە : هاوکاری : ژ 497 .

(14) — عەلی مەردان لەلای ئەم کومپانیایە 2 قەوانی دیارە (لە دەستنووسی خۆیدا ـ بومن : 1974 ـ دەڵێت : لە 1924 دا لەلای هۆمۆ کۆرد ، قەوانم دەرکردووە) . قەوانەکان ـ کە کۆکراوەیی کاك محەممەد شەریف ڕەسوولە سلێمانی ـ بەم جۆرەن :

یەکەم:

1 — دیوی یەکەم : اللەوەیسی ـ علی مردان افندی لیلانی «ژ» C 193 AB

2 — دیوی دووەم : (پەستەیێکە باش نابیستریێت) «ژ» C 195 AB

* تێبینی : پاش پرسینەوە دەرکەووت کە ئەمە پەستەیێکی تورکمانییە بەناوی (روحم لەیلانن قز ـ درناخ لار قرمز = ڕۆحەکەم کچە لەیلانیی نینۆك سوور) .

4 — دیوی دووەم : (ئەمان ئەمانێکە باش نابیستریێت) «ژ» C 196 AB

* تێبینی : دەتووانین بلێین کە ئەم ـ ئەمان ئامانە ـ ئەو بەستە تورکمانییەی عەلی مەردانە ، بەناوی (ئامان عەشە = عەششە ، عائشە) کە خاڵۆزای باوکم بۆی گێڕامەوەو گوتی ؛ عەلی مەردان کاتی خۆی بەقەوان دەری‌کردووەو ـ وێنەی ـ ڤۆریاتەکە ئەمەیە :

بوگویلن یار اولایدی
کوسکندە نار اولایدی
ئامان عشّە
هرکیمز بیر کونکدە
یاخاسی دار اولایدی
ئامان عەشّە
ـ واتا ـ
خۆزگە ئەوی دیارە یاربووایە
لە باخەڵیدا هەنار بووایە
ئامان عەشّە
هەردووکمان لە کراسێکدا بووینایە
باخەکەی تەسك بووایە
ئامان عەشّە

(ئەم لێکوتنە یەکەم جارە بیخەیینە ڕوو) .

(15) — کاك عەبدولڕەقیب یووسف دەڵێت کە نووری باویل ئاغای ڕواندزی کاویس ئاغای ـ لەبەر دەنگ خۆشیی ـ کردووە بەبرای ژیانیی و محەممەد ئەفەندیی حاجی نەوڕۆزیش کە دۆستی نوری بووە ، تکای کردووە کە کاویس لەلای ئەوان گل بداتەوە ، بەو جۆرە کاویس لە شەقڵاوەدا مایەوەو ژنی هێنا . بنوواڕە ڕۆژنامەی : العراق ـ 1983/8/31 ، باسی (کاویس ئاغا لە ڕەواندزو بەشداربوونی لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا ـ عبدالرقیب یوسف) .

(16) — لە سەرەتای 1968 دا دۆستم مامۆستا عومەر جەلال حەوێزیی بۆی گێڕامەوە کە خۆی و هاوڕێکانی ـ قوتابی کۆلێجی حوقووق ـ دەچوون بۆ ئوتێل بۆ کن حازم بەگی شەمدین ئاغلو بیستنی و دەنگی « دەرویش عیسا » ، کە بەفەرماییشتی

گەورەکەی قەوانیشی دەرکرد .

ئێمە ـ خۆمان ـ قەوانیمان نە دیوە . بۆ زانینیش حازم بەگی کوڕی یووسف پاشای شەمدینی ، لە 1925 — 1926 دا نوێنەری لیوای مووسڵبوو لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقدا ..ئەمجا ئەگەر ـ دەرویش عیسا ـ قەوانی دەرکردبێت دەشێت لەو ماوەیەدا ـ یان ـ پاش ئەوە بوو بێت .

(17) — دایکی جەماڵ = بەهیجە ئیبراهیم یەعقووب 1906 ؟ ـ 1979 . بۆ ناسینی ، بنووارە لێکۆڵینەوەمان : ـ هاوکاری : ژ . 306 27/2/976 + ژ . 509, 510 — 14 + 1980/1/21 .

(18) — مەریەم خان = مریەم محەممەد . بۆ ناسینی بنووارە باسمان : ـ هاوکاری : ژ . 502 + 503 — 3 + 1979/12/10

(19) — ئەلماس محەممەد : 1894 — 1979 بۆ ناسینی بنووارە باسمان : ـ هاوکاری : ژ . 419 ـ ساڵی 1978 .

(20) — گفتوگۆی ـ تۆمار کراوی ـ نێوانمان : 1979/5/11 (بەدارشتنێکی ڕۆژنامەنووسییەوە) .

(21) — وەك کۆمەڵی هونەرە جووانەکانی سلێمانی ـ تیپی مۆسیقای مەولەوی ـ 1956 ، کە لە ئەمەوە ئەو پەیوەندییە داهات و هەتا ئهوو بەردەوامە .

(22) — ئەو گفت و گۆ بەنرخە لە ستودیۆی تایبەتی هونەرمەندی کۆچکردوو « جەمیل بەشیر » دا تۆمار کراوە .

(23) — مامۆستا کامل کە تەمەنی 72 ساڵە و 20 ساڵێك ـ هەتا ئابی 1958 ـ بەرپرسیاری ئەو ڕادیۆیە بووە ، هەموو شتێکی ڕابوردووی ـ وەك خۆی ـ نایێتەوە بیر . ئەم قسانەیشی بە چەندین دانیشتن ، بەتایبەت لە ڕۆژانی 1983/11/10 و 1984/3/6 دا وەرگیراوە ، چی بەبیستن چی بەتۆمارکردن ، کە ئێمە ـ لێرەدا ـ پشتمان بە هەردوو شێوە بەستووەو بە دارشتنێکی ڕۆژنامەنووسیشەوە نیشانمانداوە .

(24) — شیعرەکان وەك خۆیان ـ بێدەستکاریی ـ نیشانمان داوون . سەرچاوە : حەسەن زیرەك ـ هیوا عمر احمد (در) . چاپخانەی ڕاپەڕین ـ سلێمانی . 1976 .

(25) — عادل عرفان = عادیل جەماڵ عیرفان : 1915 — 1969 وێژەوان و وەرگێڕی ڕادیۆی کوردیی ـ ئەو کاتە ـ کە ئامۆزای سەلاح عەلی عیرفانە . لە دەستنووسێکی ـ 1956 یدا ـ کە لامانە دەردەکەوێت ، جگە لە فەرمانی خۆی ، هەروەها ـ سێ ساڵ ـ چاودێری کاروباری تۆمارکردنی کردووە ، کە گۆرانیی بەردەکەوێت ، هەر بۆیێکە ـ زیرەك ـ ناوی هێناوە . دووریش نییە کە سەلاحی ئامۆزای ئەویشی هان نەدابێت بۆ یارمەتییدانی حەسەن زیرەك . (بنووارە وێنەی عادیل عیرفان)

(26) — ئەو نامەیەی زیرەك لە 1963/5/28 ناردوویێتی کە رەخنەی گرتووە بۆچی (گۆرانی ئەسمەر یارم جوانە ـ دەنگی منە لە ڕادیۆدا بەناوی احمد شاباز بڵاو ئەکریتەوە) ؟ بنووارە باسی بڵاوکراوەی ئێمە : هاوکاری ـ ژ . 416. 1978/3/6 « لاپەڕەیێکی نهێنیی حەسەن زیرەك » .
لێرەدا شایانی گوتنە کە یەکێك لەوانەی نهێنیی بەنرخی چەند ڕۆژگارێکی ـ زیرەکی ـ بڵاوکردووەتەوە . شاعیر حەمەی حەمە باقییە بنووارە ڕۆژنامەی (ژین ـ ژ 83 . +1972/9/7 1972/8/31 .

(27) — سەلاح عیرفان = سەلاح عەلی عیرفان . لە 18 ی ئابی 1927 دا لە ماڵی جەماڵ عیرفانی مامی ـ گەرەکی کانیسکان : سلێمانی ـ هاتووەتە دنیا . لە 1954 دا بەشی ئینگلیزیی کۆلیجی ئاداب و علوومی لە بەغدادا تەواو کردووە . چەند فەرمانێکی دیوە هەتا لە یونیسکۆدا . لە 983/8/1 دا کە مامۆستا بووە لە سانەویی سلێمانییدا . لەسەر داوای خۆی خانەنشین کراوە . لە 1983/11/25 دا گفت و گۆمان لەگەڵ تۆمار کرد کە ـ لێرەدا ـ بە شێوەیێکی ڕۆژنامەنووسیی بڵاومان کردەوە .

(28) — لە 1984/3/6 پرسمان بە مامۆستا کامیل کردو قسەیمان ـ بەبیستن و تۆمارکردن ـ وەرگرت .

(29) — لەمەڕ دامەزراندن و هێنانی حەسەن زیرەك ، دەبێت ئەم نووسینەیش بخەیینە بەرچاو کە « یادداشتی دەستنووسی هونەرمەند ڕەفیق چالاك ـ ی کۆچ کردوو کە لامانە ، دەگێڕێتەوەو دەڵێت : (هەر لە ماوەی 1950 — 1956 داو نازانم چ ساڵێکە ، ڕۆژێکیان ، خوا لێخۆشبو ئەحمەد دلاوەر ( = ئاکتەری لێهاتووی ڕادیۆ / ك . ر . م) پێی وتم کە گورانیبێژێکی باش هەیە وا لە ئوتێل شیمال لە مەیدان . هەڵساین چوین کە تەماشا ئەکەم کوڕێك زەبون و لاواز ، دیشداشەیەکی لەبەردایەو خەریکی سڕینی ناو هۆڵی ئوتێلەکەیەو ئارەقی شین و مۆری کردوتەوە ، پاش نواندن و گۆرانی وتن ، بردمان ئەرزوحاڵمان پێداو لە ئێستکە کردمان بە گۆرانیبێژ . ئەمیش ئەو کەسەیە کە لە دواییدا بەسەدان بەرهەمی گۆرانی لە عیراق و ئێراندا هێنایە ناو ناوان و حەسەن زیرەکبو . » وەکخۆی بڵاومان کردەوە / ك ر . م » ) .

(30) — کە یەکەمجارە ـ باسی ـ ئەم لاووکزانە بەناوبانگە بکرێت ،

بەپێویستی دەزانم ـ خوێندەوار چەواشە نەبێت ـ یەکەم: سەرچاوەکان . دووەم : لێکدانەوەکانم ، روونبکەمەوەو بەم جۆرە :

یەکەم : سەرچاوەکان « وەك خۆیان » .

1 – الأب یوسف سعید [ مجلة : التراث الشعبي العدد الاول . السنة الثالثة . ایلول 1971 ] .. دەڵێت : سعید آغا : ولد في جزیرة ابن عمر وتربى فیها ونشا في دیار البوتان ثم انخرط کجندي في جیش الفرنسیین اثناء احتلالهم لسوریة ثم سکن دیر الزور (المالکیة) الیوم . ساهم عصامي في بناء دار مقهى له . ثم زار العراق خفیة ، فسجل بعض اسطواناته اذکر منها (لي لي دیرانو) ، وتوفي في احدى مستشفیات بیروت وهو في العقد الخامس من عمره . اقوى شعراء الاکراد ومغنیهم قاطبة سریع في لفظته . مؤمن بالقومیة الکردیة . حنجرته کبکرة ملولبة . قوي في غنائه ، له بحة في صوته ، عجیب یحرك فیك شجونك . قیل انه استاذ کل المغنین الاکراد الیوم في الاذاعة العراقیة وعندما توفي ظهر هؤلاء وانقذوا اغانیه من الضیاع فهو قطب هائل من اقطاب الغناء الکردي وجهبذة في تعبیره . له اصالة حقة في الاداء . کل اغانیه مقبولة بدرجة ممتازة . بدأت اغانیه تتوارى من الاسواء مؤخرا وسمعت احدى اغانیه مطبوعة في (ترکیا) ومقلده وبدلاً من ان یضع الناشر اسم صاحبها (سعید جزراوی) وضع حسن جزراوی . انه بلبل الاکراد بغیر منازع .

2 – حەسەنی جزیریی (گفتوگۆی تۆمارکراوی ئێمەو ئەو ـ ماڵی خۆم ـ سلێمانی . 1979/9/3) دەڵێت : ـ سەعید ئاغا ، شاعیر بی ، دەنگ بێژەکی خۆش بی . یەعنی حەدداد بی ، حەدداد ( = وەستاییك وەك ئاسنگەر / ك . ر . م) بۆ گۆرانیی گوتنێ . دەنگی وی بەرز بی . ئەڤ سترانە حەمی ، ئەوی دەرکرنە ، ب ْخۆژی ئاواز دانانە ، ئو گوتنیا یە ئەوی‌و تەئلیف ، حەمی ، ئی ئەوینە . ب ْخۆژی خەلکی جزیرا بۆتایە . سەعیدی حەمۆ ، برایێ (چوولی) ناڤێ برایێ وی (چوولی) بی . هەکە من دیت (دیارە مەبەستی دووا دیدارە / ك . ر . م) عومرێ وی ، دبیت زیاترێ ل ْ پێنجی ـ 50 ـ ساڵ . بەری 20 – 25 ساڵ دبت . نەمایە ، ئەمرێ خودێ کرییە .

ژ تورکیا دەهاتە عیراقێ ، دەهاتە زاخۆ ، گۆرانیی تەسجیل دکرد (واتە لە بەغداد /ك . ر م) ل ْ دیاربەکر ئەمرێ خودێ کر . ئەوە کرکا وی کون بی . ئەمری خودێ کر ، ئانین جزیرا بۆتا ڤەشارتی (نێژرا /ك . ر. م) .(کە گوتم دەڵێن /ك . ر.م) بەلێ . ئەو جەندرمە بی ل ْ سوریا . گۆرانیی گەلەك گوتنە : عەیشانێ هەبی . شەڕی تیباری هەبی . کەماڵ پاشا هەبی . دەرویشێ عەبدی ، عەدۆیی نووران هەبی .

* تێبینی : لەمەڕ گرتنی پرسیارمکرد ، وەڵامەکەی پێش گفتار تۆمار کردن پێ‌گوتم ، بەڵام ـ وەك سڵ لە بڵاوکردنەوەی ڕادیۆیی بکاتەوە ـ لە تۆمارکردندا نەیگووت . هەروەها ـ بێ‌تۆمار کردن کە گوتم : گۆرانیی ئەو بەغدایێ پایتەختە چییە ؟ باسی ماڵی ئەملاس محەممەدو حەسیبەی کچی‌و گۆرانییێکەمی سەعید ئاغای بۆ کردم . (لەساڵی 1980 دا لە بەرنامەی ڕادیۆیی : ڕۆژێ لە ڕۆژان ـ دا باسم کرد) . بەدەمو دووش پێی گوتم کە سەعید ئاغا زیاد لە 15 قەوانێکی دەرکردووە . (حەسەن لە 1983/7/9 دا مرد) .

3 – وێنەی : سەعید ئاغا ـ یەکەم جارە بلاو دەبێتەوە ـ دۆستم کاك عەبدولڕەقیب یووسف پێشکەشی کردووین کە ئەویش لە « مەلا خەلەفی بافەیی ، کوڕی جزیرا بۆتانەوە بەدیاریی بۆی هاتووە . هەردوو شایانی سوپاسن ، بە تایبەت ، یەکەم کە لەسەر داخووازیمان ، هاریکاریی کردین بۆ بیستنی ـ قەوانە کۆکراوەکانمان ـ هەروەها ناسینەوەی بابەتەکانیان .

دووەم : لێکدانەوەکانم « دەربارەی ژیان‌و مردنی ڕۆژگاری قەوان دەرکردنی ـ بەتێکڕایی » .

* کە گوتوومە « ڕەنگە هەیە » : خەڵکی گوندی عەندیوەر بووبێت ، بەڕۆشنایی دووشتە . لە لایێك ، بوونی بە ژاندرمە لە لەشکری فرانسزیدا کە عەندیوەری خستە پاڵ سوریا . لە لاییکی ترەوە ؛ خۆی لە گورانییدا ـ بەستە کانی ـ چەند جار ناوی عەندیوەری هێناوە کە دەشێت پاشان هاتبێت بۆ دیرئەلزور .

* کە گوتوومە « ڕەنگە هەیە » : پێش 1900 دنیای دیتبێت‌و لە نێوەندی پەنجاکاندا مردبێت ؛ بەڕۆشنایی قسەی ئەب یووسف سەعیدە . هەروەها قسەی حەسەن جزیری هەروەها بە ڕۆشنایی قەوانەکەی ـ چەقماقچی‌یە ـ کە باسی دێت ، هەروەها وێنەکەیشی.

* کە گوتوومە « ڕەنگە هەیە » : بەیارمەتیی بنەماڵەی شەمدینی باس‌کراو ـ هاتبێت لە بەغدادا قەوان دەربکات ، بە ڕۆشنایی قەوانەکەیێتی لەسەر محەممەد ئاغای رەئیسی بەلدییەی ـ زاخۆ .

* کە گوتوومە ؟ لە نێوان 1938 – 1956 دا لە لای دوو کومپانیا ناوبراوەکاندا قەوانی دەکردووە ، ڕۆشنایی ـ مردووە باس‌کراوەکەیە لە 1938 دا ـ بۆ 1956 یش ڕۆشنایی هەبوونی کومپانیای چەقماقچی ـ یە لەو ڕۆژگارەدا ، وەك لەم گوتارەدا نیشان کراوە ، (القبانچي .. عادل کامل ـ مجلة : القیثارة ع : 4,3

حزیران 1960) هەروەها خویشم بیستوومە کە ئەو کومپانیایە خاوەنەکەی ـ عارف چەقماقچی ـ ناو بووەو لەو رۆژگارەدا هەبووە . بەلام رۆشنایی هەرە زۆر (نزیکایتی) قەوانەکەی سەعید ئاغاو قەوانێکی تایێر تۆفیقە کە تۆمارکراوی ـ چەقماقچی‌یە ـ و ژمارەکانیان بەم جورەیە :

قەوانی : سەعید ئاغا ، ژ ، NS. 149 . sJ:4 / OJME 421

قەوانی : تایێر تۆفیق ، ژ ، NS. 145 . SJ:7/OJME 415

(مقام حسینی : من بریندارم)

(تێبینی : ئەم بەراوورده ـ وام لێدەکات بلێم ـ سەعید ئاغا پێش 1958 مردبێت کە ـ ناتەواوی دەنگە سازکارەکەی جارانی ـ لە ئەو قەوانەدا نیشانەشە بۆ ناتەواوی ، قورگی ، کە بەنەخۆشبوونی ـ ئەو ـ مردووە ) .

(31) — فرانسە لە 1920 — 1941 لە سووریادا بوو هەتا دامەزراندنی کۆماری سوریا .

(32) — گومان دەکەم هەر لە لای ئەم 2 کومپانیایە قەوانی دەرکردبێت بەتایبەت لەبەر ئەو هۆیە کە لە سوریا و لوبناندا لقی کومپانیای تر هەبووەو فرانسەش کە داگیرکەری سوریا بوو ، کومپانیی‌یێکانی قەوانی ـ هەڵبەت کەوتوونەتە کەڕ .

33) — سەرچاوە : قسەی حەسەن جزییری .

34) — نازانرێت قەوانی چی کومپانیایێك بوون .

(35) — گۆرانیی‌بێژ ـ ناوی نووسراوە ـ سعید آغا . هەروەها بە ئینگلیزی .

(36) — ئە :

حەسەنی جزیریی ، گوتی : سەعید ئاغا لە ماڵی ئەلماس محەممەد میوانبوو . منداڵی خۆش دەویست . کچەکەئەلماس ـ حەسیبە ـ سێ چووار ساڵانبوو لەسەر تەختێك ـ کورسی ـ دانیشتبوو ، چلپی دەخوواردەوە . لەسەر ئەوە ئەو پەستەیەی دانا .

بێ :

لەو ماوەیەدا ـ 1968 — 1970 کە هاموشووی ئەلماسم دەکرد وێنەی منداڵو کچێنیی ـ حەسیبەم ـ دیبوو کە دایکی هەر ئەوی هەبوو ، هەموو جارێك بچوومایە هەناسە ساردی خۆی ـ بۆ جووانەمەرگیی کچەکەی ـ هەڵدەکێشا . کچەکەی جووان بوو ، ئارەزوومەندی کەمانچە بوو کە دایکی ئەو سازەی هەڵگرتبوو ، لەناوی نەدەبرد . حەسیبە تەنها کوڕێکی لەپاش بەجێماوە کە خۆم لە 1970 دا لای نەنکی دیم ، سەربازبوو .

(تێبینی : تەمەنی حەسیبە ـ 3 , 4 ساڵان ـ دیسان لە 1938 و بەدووا نزیکمان دەکاتەوە بۆ دەرچوونی قەوانی سەعید ئاغا) .

(37) — یار جاورا = یار گەورێ . خوێندەوار دەبێت بزانێت کە ئەم پەستەیە جودایە لەگەڵ (لاووکی : خەلیلی غازی‌و سیریجە خانم کە بە ـ گەورێ ـ ش ناوبراوە) . بۆ ناسینی ئەو لاووکە ، بنووارە : (دەسنووسی ژمارە : B2514 ی ئامۆژگای رۆژهەلاتناسی‌ی ئەکادیمیەی زانستی‌ی سۆفیەت لە لینینگراد ـ دکتور مارف خەزنەدار ، گوڤاری : نووسەری کورد . ژ .6 مارت ـ نیسان 1972) .

(38) — گۆرانیی‌بێژ ـ ناوی نووسراوە ـ الاستاذ سعید آغا جزراوی . بە ئینگلیزیش هەروەها ـ بێ الاستاذ .

(39) — ئەم ووشەیە : تەفرە ـ باش نابینرێت ـ دۆستم عەبدولرەقیب دەڵێت ، تەفرە ، نییە ، تەقلا ، یە .

(40) — گۆرانیی‌بێژ ـ ناوی نووسراوە ـ سعید آغا جزراوی .

(41) — = = = = سعید آغا ، هەروەها بە ئینگلیزی وەك ناوی گۆرانیی‌بێکەش .

(42) — گۆرانیی‌بێژ ـ ناوی نووسراوە ـ سعید آغا جزراوی .

(43) — گۆرانیی‌بێژ ـ ناوی نووسراوە ـ سعید آغا جزراوی .

فەرهەنگۆك (بۆگۆرانیی سەعیدئاغا) .

ل°مین = لەمن ! م°دخارێ م°نادنی = من دەخووازێت . منی نادەنی ! ڤەدانە = دانراوە ! مینا = وەك ! کەتە :کەوتە ! حەلان = بەردێکی بەنرخە بۆ رازاندنەوەی ئافرەت ! کێتانە = کەتانە . تەیی ، تایی = طي . طائي ، عەشیرەت ، ! دین = شێتۆکە ! سەقلان = رووباری ، سەقلانی مەما کە بە دەورو بەری ئێلم دزێ لە طووێ ، بەنێو دەشتی هەسنادا دێت هەتا نزیك شاری ـ جزیرا بۆتان ـ و دەرژێتە دیجلەوە : عەبدولرەقیب یووسف !! ب°بییە = بە داری بییە ! خوهان = ، وەك ناتۆرەییکە ! ، . میدەعییە = موددەعی ، مەبەست لە قایمقام ، دەسەلاتدارە ، ! دەی ناکی = دەنگ ناکەیت ! ئیسب = یووسف .

وێنەکان :

وێنەی : عومەر قەززاز و عەلی مەردان تایبەتە . وینەی عادیل ، سەلاح عیرفان ، یادگارێکە ـ 1963 ـ کاك شیروانی عادیل عیرفان پێشکەشی کردووین . وینەی حەسەن زیرەك ـ 1956 سلیمانی ـ لەگەڵ ئەکتەر ـ ی جاران ـ کاك نووری بەدەوری گیراوەو ئەو پێشکەشی کردووین . وێنەی کاك کامیل خۆی پێشکەشی کردووین ، هەموویان شایانی سوپاسمانن . (بڵاوکردنەوەیان ـ بێ ئاگاداریمان ـ بۆ کەس نییە !) .

# کاروانی رۆشنبیری لەکوردستاندا

## لە هەولێر

دژوار : ئامادەی کردووە

### ١ - ..... بینەرو شانۆ

ناونیشانی کۆڕەکەی کاك شاهین نەجمەددینە ، کە لە رۆژی ١٤/٢/١٩٨٥ لە هۆڵی بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیریی جەماوەری پێشکەش کرا ، کۆڕەکە لە لایەن جەلال ئەحمەدی هونەرمەند بەڕێوەدەبرا .. لە دوای بەخێرهاتنی ئامادەبوان وتی [ یەکێك لەو هۆیانەی کە دەبێتە مایەی خولقاندنی بارێکی گەرمی هونەری دەرگا کردنەوەیە بۆ کۆڕبەستن و گفتوگۆو لێدوان دەربارەی لایەنەکانی هونەری شانۆو دۆزینەوەی باشترین ڕێگە بۆ باری ئەمڕۆی شانۆی کوردیمان ]

دوابەدوای قسەکانی هەڵسوڕێنەری کۆڕەکە ، کاك شاهین باسەکەی بەم وتەیە کردەوە « نانێك و شانۆیەکم بدەرێ ، گەلێکی تێگەیشتووت دەدەمێ » ئینجا وتی [ هونەری شانۆش باشترین ڕێگایە بۆ بەرپەست کردنی ژیانی کۆمەڵ چونکە هەموو لقەکانی هونەرو وێژەی تیا کۆکراوەتەوە ، هونەریش جۆرێکە لە چالاکی یەکانی مرۆڤ بۆ لێکدانەوە لەژیان .. بێگومان ئەو لێکدانەوەیەش مەبەستی گۆڕینی ژیانە ، هونەری شانۆش دادەنرێت بەیەکێك لە هەرەگرنگترین هۆیەکانی فێربوون ، هونەرێکە گۆڕان و پەرەسەندنی نوێبوونەوەی باری ئابووری کۆمەڵ زیاتر بەرەو پێشتر دەبات ]

موحازیر هاتە سەرباسی گەورەترین شانۆ لە جیهانداو گوتی [ بینەرانی گریکی کۆن ، سەر لەبەیانی زووەوە کۆمەڵ کۆمەڵ ڕێگای شانۆیان دەگرتەبەر ، تا رۆژیش ئاوادەبوو نەدەگەڕانەوە ، لەو ماوەیەدا خەڵکەکە هەموو پێویستی یەکانی خۆی لەگەڵ خۆی دەهێنا وەك خواردن و خواردنەوە ، تەنانەت هی وایش هەبوو سەرین و دۆشەکڵەی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا بۆ ئەوەی شوێنەکەی ناڕەحەت نەبێ ]

ئینجا هاتە سەرشانۆی کوردو گوتی [ شانۆی کوردی ، ئێستاش پێویستی بەخۆماندوو کردنێکی زۆرە بۆ دروست کردنی نووسەری شانۆیی ڕەسەن .. ئەوەتا هەزارەها داستان و کەلەپوورو چیرۆکی کوردی و بێگانەیی هەیە دەتوانرێت ئامادە بکرێت بۆ بەرهەمێکی شانۆیی کوردی ، بەڵام پێویستیمان بەو کەسانە هەیە کە ئەو ماندووبوونە بخەنە سەرشانیان دەنا ناتوانین ئێستا ناوبنێن بەوەی کەبڵێین نەبوونیەك هەیە لە تێکستی شانۆیی ماندا .. ئێمەش ئەگەر ڕاستگۆبین لەگەڵ خۆماندا پێویستە بەرهەمەکانمان لە جەرگەی نەتەوەکەمان هەڵقوڵابێ ، ئەوەش مانای ئەوەنیە کە

دەرگای تێکستی شانۆیی جیهانی لەسەر نەتەوەکەمان کلۆم بدەین ]

دەربارەی بینەری شانۆی کوردوتی [ دەتوانین بەسێ جۆری سەرەکی دابەشیان بکەین :

١ ـ ئەوبینەرەی کە بۆ سەیری شانۆ دێت ، لەهێناو کات بەسەربردن و خۆشی و لەززەت وەرگرتن ، بێ ئەوەی بیر لە بابەتەپێشکەش کراوەکە بکاتەوە .

٢ ـ بینەرێکی تر دێت بۆ سەیرکردنی شانۆیی یەکە ، لەلایەن بیروو بابەتە شانۆیی یەکەوەو تەکنیکی شانۆکە ، کە ئەمەش زیاتر لاوە رۆشنبیرەکان و ئەدیبەکان دەگرێتەوە .

٣ ـ بینەری رەخنە گرو رەخنەی شانۆیی ، کە تەواوکەری بەرهەمەکەیەو لایەنێکی سەرەکی یە بۆ بەرهەمە پێش کەش کراوەکە ]

لەدوایدا بە بۆ چوونی خۆی ، هاتەسەر چارەسەرکردنی گیروگرفتی شانۆی کوردی و گوتی :

١ ـ جیاواز نەکردن لە شوێنی بینەران

٢ ـ هەرزان کردنی نرخی پلیت

٣ ـ تەرخان کردنی شوێنێکی نزیک و کاتێکی مام ناوەندی

٤ ـ پروپاگەندە کردن

٥ ـ نەپچرانی تیپەکان لەبەرهەمی شانۆیی

٦ ـ دەست پێکردن ، لە شانۆی منداڵانەوە

ئەوەی شایانی باسە ، کاك شاهین بەپێی توانای خۆی وەلامی پرسیارەکانی دایەوەو گفتوگۆیێکی گەرم لەسەر باسەکە لەلایەن ئامادەبوان کرا .

**شاهین نەجمەددین قادر**

ـ لە ساڵی ١٩٦٣ لە هەولێر لەدایك بووە

ـ پۆلی چواری پەیمانگای هونەرە جوانەکانی شاری سولەیمانیە ، بەشی نواندن .

ـ بەشداری لە چەند بەرهەمێکی شانۆیی کردوە ، وەك پەیامێکی نەمر : دەرهێنانی صباح عبدالرحمن ، محەمەدو سێوێ : دەرهێنانی سعدون یونس ، وەلی دیوانە : دەرهێنانی هاشم زینل ، سورمەخان : دەرهێنانی صفوت الجراح و چەندانی تر .



**٢ ـ کارەساتی دوێنی نیشاوێ**
**لە نێوان فۆلکلۆرو مێژوودا**

لەرۆژی شەممە رێکەوتی ١٦/٢/١٩٨٥ لە هۆڵی ژووری بازرگانیدا ، نۆبەرە کۆری وەرزی رۆشنبیریی یەکێتی نووسەرانی کورد لقی هەولێر ، بەم ناونیشانەی سەرەوە بۆکاك ئەسعەد عەدۆ کرایەوە ، کۆرەکە لەلایەن کاك عەزیز رەشید هەریری بەرێوە دەبردرا .. لەداوی بەخێرهاتنی ئامادەبوان وتی [ بەرێزان .. بێگومان فۆلکلۆر بەشێکی بنەرەتی یە لەئەدەبی کوردیماندا و لایەنێکی هەمیشە زیندوو گەشەداریتی ، هەرئەو نەمری و دەورە باڵایەشی وای لێ کردووە ببێتە بناغەیەکی پتەو بۆ ئەدەب و رۆشنبیریی ئیمرۆمان • هەر ئەم راستیەیشە وای لەبەشێکی زۆری نووسەران و ئەدیبانی کورد کردووە کە بەگوڕ روو لەومەیدانە بکەن و بەگوڕ ئەسپی خۆیانی تیا تاوبدەن و ، رۆژ لەدوای رۆژگیانی تازە بوونەوەی وەبەردا بکەنەوەو لەچنگ فەوتان رزگاری بکەن و بیپارێزن .. ] دوابەدوای ئەمە وتی [ بەرلەوەی کاك ئەسعەد بێتە سەر باسەکەی خۆی ئێوەو کاك ئەحمەد تاقانە ، سەرۆکی لێژنەی رۆشنبیری ی یەکێتی ی نووسەران ]

ئەحمەد تاقانەی شاعیر رووبەرووی ئامادەبوان وتی [ ئەدیب و ئەدەب دۆستانی ئازیز .. یەکێتی ی نووسەران



خۆشحالە بە ئامادەبوونتان لە نۆبەرە كۆڕی وەرزی رۆشنبیرییەكەی كورد گوتەنی « چەپلە بە یەك دەست لێنادرێ » بۆیە دەڵێم بادەست لەنێو دەست دابنێین بۆ خزمەت كردنی وشەی ڕەسەنی كورد .. تاد ] لە كۆتایی ووتەی لیژنەی رۆشنبیریی ، كاكی موحازیر باسەكەی دابەش كردو سەرچاوەكانی دەست نیسان كرد ، ئینجاوتی [ هەرچەندە مەسەلەی سەردەمو زنجیرەی مێژوویی لە فۆلكلۆردا بایەخی پێنادرێ ، بەڵكو بە ڕووداوەكانی سەردەمی گەلێك پێشتر پشت دەبەستێ ، هەروەها ئەو كەسانەی بەمەبەستی تۆمار كردنو ساغ كردنەوەی بابەتی فۆلكلۆرن ، لە زۆر جێگا تووشی بەرانكاربوونی فۆلكلۆرو مێژوو دەبن .. جارێك یەكەمیان خۆی لە گێژاوی دووەمیان حەشار دەداو جارێكیان دووەمیان بە زرنگی كابانەكەی لەكاتی دانوئاوێر خۆی دەرباز دەكاتو بەرێچكەی تایبەتی خۆی وەگەڵ ڕەوێ دەكەوێ .. بەلام هەندێك جار ئەگەر لەبەر تاموچێژی بەلەزەتی بێ ، یان لەبەر كارەساتی دڵتەزێن بێ ، هیچ لێك جیانابنەوە ، بەڵكو زیاتر پاڵ بەیەكتر دەدەن ]

دوابەدوای ئەمە وتی [ .. كارەساتی لعلی خان ، هەرچەندە دەبوایە بەكارەساتی سمایل بەگ بناسرێ ، كەچی هەر لەو رۆژەی كە ئەو ڕووداوە قەوماوە بۆتە هۆی كوژاندنەوەی دوا مۆمی لكێكی بنەماڵەی میرانی سۆرانو جەرگی ئەو ئافرەتە كوڕ كوژراوەیان كون كون كردوە ، ئەووشە كاریگەرانەو فرمێسك ڕشتنی لعلی خانو نەمانی شۆڕەسوارێكی مەیدانی كوردپەروەریو بێدەنگ كردنی داواكەرێكی ماڧ نەتەوەی كورد بۆتە هۆی ئەوە كە ئەو كارەساتە بە نێوی ئەو دایكە جەرگ سوتاوە باوبێ ] .

« لعلی خان دگۆلەخۆم بێكەسێ سەرشینێ كەس نەمایێ

كەس نیە جوابەكێی بداتەوە گەورەی بەغدایێ »

ئینجا هاتە سەرباسی تۆلەكردنەوەو گوتی [ بەڕای منو زۆربەی خەڵكی ئەم وولاتە تۆلەكردنەوە كارێكی پیرۆزە ، بەلام چ تۆلەكردنەوە ؟ تۆلەكردنەوەی نەتەوە لە دوژمنانی خوێن مژو داگیركەرانی ، نەوەك لە پیاوێكی كورد ، لە بنەماڵەیەكی تری كورد ، كە هۆی سەرەكی ڕووداوەكە دەستێكی بێگانە بووە .. ]

« هەنگینێ خۆش دەبو شەرێ منو سمایل بەگی بكەتبوایە بەرجادەیە

مەعلوومە سێ پشتا دوژمنێ مەیە »

موحازیر لەنێوان بەشەكان ، پەنای دەبردەبەر سەرچاوەی جیا جیا ، كاتێ وتی [ .. ئەندازیار هاملتۆن دەڵێ : ئەو ڕێگایەی كە بە خوێنی ئەو سوور بوو ـ واتەخوێنی سمایل بەگ ـ ، بە كۆمەك كردنی ئەو تەواو بوو ، كە هەردەم بەئومێدی ئەوەبوو ، پێشكەوتنی میللەتەكەی لەو ڕێگایەوە دێت بابێتە پەیكەری یادگاری حاكمی لاو بەسوودترە لەو قەلایە كاوڵ بووانەی كە كۆرپاشای باپیرەی دروستی كردبوون ]

دوابەدوای ئەمەوتی [ سمایل بەگی كوژراو هەردەم بەخۆزگەی پێشكەوتنی نەتەوەكەی بووە ، زۆر دەردەسەری لەو ڕێگایەوە بینیوە ، ئەو خۆزگەو هەولدانەشی وەك ئەستێرەیەكی گەش لەلاپەڕەكانی مێژووی ئەنجومەنی نیابی دەدرەوشێتەوەو دوژمنانی داگیركەر دانیان بە كوردایەتی ئەو

جوانەمەرگەناوە ! هەربەوە ڕانەوەستاوە ، بەڵکو لەدەرەوەی کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنیش هەوڵی مـافو خۆزگـەی ڕەشو ڕووتی میللەتەکەی داوە بەتایبەت پێشنیارە بەناوبـانگەکـەی شوباتی ساڵی ١٩٢٩ لە گەڵ چەندان سەرەك و ناوداری کورد ، وەك حازم شەمدین ئاغەو جەمال بابانی دواسەرەك وەزیرانی پادشایی عیراق و چەندانی تر ، بۆ فەیسەلی پادشاو نوێنەری پادشای بەریتانیا .. ]

« بەژنی سمایل ئاغەم دارێی مینایە
جوابەکێ بەرن لەبۆ بەغدایە
لعلی دەگریێ کوڕی کوژرایە »

بەنووسین و خوێندنەوەیەکی ڕۆمانسیـانە هـاتە بـەشی پێنجەمی باسەکەی و گـوتی [ نەك لەو ڕۆژەی داگیـرکەرانی ئینگلیـز گەیشتنـە ناوچـەی ڕواندوز ، نـوری باویـل ئـاغـە ئەشقیابووە ، بەڵکو لەزەمانی دەسەڵاتی عوسمانیەکـانیش ، بەلام باوکی نـوری ئاغـە بەخـۆزگەی دەربـاز کردن و هێـور کردنەوەی کوڕەکەی پەنا دەباتە بەرکاربەدەستانی ئینگلیز بۆ لێبـووردنی ، ئـەوانیش دەرگـای بـۆوالا دەکـەنـەوەو پلەی ئەفسەری لە هێزی جەندرمەی ڕواندوزی پێشکەش دەکەن ! بـەلام نوری ئـاغە تـوانای سـەرشۆڕ کـردنی بۆ فـەرمـانـە قورسەکانی داگیرکانی نەبووە ، بۆیە هێندەی پێناچێ دەست و بازووی هەڵدەکاو بەرەوچیا بۆی دەردەچێ و چەند کەسانێك لە دەوروبـەری کۆدەبێتـەوە ، هێـرش لەسـەر هێـرش بـۆسـە لەدوابۆسە ، تا لەساڵی ١٩٢٠ ڕواندوز لە دەست ئینگلیز ڕزگار دەکات و دەبێتە میرکوڕ ]

مێجر هی دەڵێ : « لەوکاتـەی گەڕامـەوەو کوردستـان کەوتە پشتم لە ڕێگا بیرم لەوخاك و میللەتە دەکردەوە ، هەموو شتێك بەولاوە نـوری بەتـەنیا بـەم لاوە ، بەڕاستی جێگـای سەرسووڕمان بوو ، نەك بۆ من بەڵکو هەموو کاربەدەستانی ئینگلیز ، ئەوپیاوە زۆر سەیر بوو ! سەرۆکایەتی نەدەویست ، داروودەستەی زۆر نەبوو ، پارەوپوولیش هیچ ، بـەلام ئازاوو مەرد بوو ، ژیانی بێشەڕوشـۆڕی نەدەویست ! هـەرەسانی لەئینگلیز هەڵگرتبوو ، دەبێ ئێستا لەکام شاخ و دۆڵ بێ ! »

« سمایل بەگ وادێ هەروەکی بایە
لەگە مەعاونی دەستیان تێك دایە
صباح لەسەرێی وا ڕاوەستایە
دەمانچەی ڕووتی لە گۆڵێ دایە
گەبیە سمایل ئاغەی لەکەلەی دایە
صباح دەڕوێی دەبووە ئەشقیایە »

دوابەدوای ئەمە ، باسەکەی بەم چەند دێرە هێناو گوتی [ .. ڕەواندوزی شانازی و پایەختی میرانی سۆران و ئاوات و ئارەزووی قبیلەگایـەکی کورد لە دێـرزەمانـەوە پێش لەدایك بـوونی حەزرەتی عیسـاوە بۆتـە پێشێ پـۆستاڵی ئـەرتەشی شـاهـەنشـاکـانی فـارس و جبـەلەبـەرەکـانی عـوسمـانی و کلاوپانەکانی ئینگلیز .. ]

ئەوەی شایانی باسە ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیب و ئەدەب دۆستان ئامـادەی کۆڕەکـەبوون و گفتـوگۆیێکی دووروودرێـژی باسەکەیان کرد .



## ٣ ـ کۆڕی شیعر خوێندنەوە

ڕۆژی ١٩٨٥/٢/٢٧ لە هـۆڵی بـەڕێـوەبـەرایـەتی



ڕۆشنبیری‌ی جەماوەری کۆڕێك بۆ مامۆستا رۆستەم باجەلانی شاعیر سازکرا ، کۆڕەکە لەلایەن کاك ئەسعەد عەدۆ بەڕێوەدەبرا .
ووتەی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری‌ی لەلایەن ئەسعەد عەدۆ بەم دوو دێرەی شیعرەی ئەختەری شاعیر خوێندرایەوە :
« وەرە لەعلی لەبت ماچ کەم لەسەر ئەم شەرتە گەرماوی
خومارە چاوەکەی مەستت لەخەویا تازە هەڵساوی »
ئینجاوتی [ شەوچەرەی شیعری کوردی لە مێژ ساڵە دەنگو ڕەنگی خۆی هەبووەو شوێنەواری ئەو دەنگە زوڵاڵانە بووەو هەندەك جارانیش شیعرو ئاواز تێکەڵی یەکتر بووینەو تابووە بە گەرەلاوژێ‌یەك ئەسەری هەبێ ئەبن .. کۆڕی نالی‌و حاجی قادرو قانع‌و سووچی مەیخانەی بێکەسی شۆڕشگێرو تا دەگاتە دیوەخانی ئەختەری کۆیی .. ]
دوابەدوای ئەمە کاك رۆستەم بەپێشەکی‌یەك ڕێگای بۆ خوێندنەوەی هەڵبژاردە شیعرەکەی کردەوەو گوتی [ شیعر چی‌یە ؟ شیعر چرکە خۆش‌و ناخۆشەکانی ژین‌و سرووشتە بەپێچەوانەوە چرکە خۆش‌و ناخۆشەکانی ژین‌و سرووشتیش شیعرە ، ئینسانی بەهرەدارو رۆشنبیرکە پێی دەووترێ شاعیر دەتوانێ لەحاڵەتێکی تایبەتیدا کە پێی دەووترێ حاڵەتی ئیلهام خامەی ڕۆشنبیرەکە بکاتە بەندەك لە نێوان خەم‌و ئیلهام یان خۆشی وئیلهام ]
ئینجا وتی [ بێگومان هەر شاعیرێ ڕێبازێکی تایبەتی خۆی لەنووسینا هەیەو باوەڕی پێ‌یە ، بەهۆی ئەم ڕێبازەو دەتوانی جمهورێکی تایبەتی بۆ خۆی پەیدا بکات لەنێوخانوەکانیانا شیعرەکانی بکاتە گوڵێ ، بورکانێ یان دوڕێ ، بۆیە ئێمەش لێرەدا دووپاتی دەکەینەوەو دەڵێین بیری منال تیژەو چاویش وەك کامیرا وایە هەر چ دیمەنێ لە دەورو پشتی خۆی ببینێ ئەوە خێرا وێنەیان دەکێشێ .. ]
دوابەدوای ئەمە مامۆستا رۆستەم هاتە سەر خوێندنەوەی شیعرەکانی .

# لە سلێمانی

**«ئاسۆس» ئامادەی کردووە**

**١ ـ میهرەجانی شانۆ لە قوتابخانەی ئامادەیی بازرگانی کوڕان‌و کچان .**

لە دواهەفتەی ساڵی ڕابوردووەوە تا هەفتەی یەکەمی مانگی کانونی دوەمی ١٩٨٥ تیپی شانۆیی ئامادەیی بازرگانی‌ی کوڕان‌و کچان لەسەر شانۆی ئامادەیی سلێمانی دوو ئانۆنامەیان پێشکەش کرد ، یەکەمیان : [ بیرەوەری ] لەنووسینی چیخۆف گۆڕینی ئەندازیاری ئەدیب مامۆستا جەلال تەقی‌و دەرهێنانی ئەرسەلان محمد عەلی ، ئەو قوتابیانەی لەم کارە هونەرییەدا بەشدار بوون ئەمانە بوون : ئازاد قادر ، ڕێزان محمد، ئەرسەلان محمد ، شەوبۆ محمد ، ئەنوەر محمد ، بەختیار کەریم ، ئارام جەمال ،
دەرهێنەر ویستبووی لە قاڵبی کومیدیادا دەقەکە پیشان بدات لەم بارەیەشەوە دەڵێ : « هەر لەمنداڵیمەوە تامەزرۆی شانۆ بووم ، لەبەرئەوەی ئەزمونی شانۆییم زۆر نییە ، بۆیە پێویستیم بە یاریدەی هاوڕێکانم بووتا لەکارەکەما سەرکەوتوو بم ، دەمەوێ خۆم لەبواری شانۆ دوور نەخەمەوەو بەخوێندنەوەی

کتێبە شانۆییەکانەوە خۆم خەریك بکەم » .
دوەمیان ـ شانۆنامەی [ گۆرانی چایکا ] وەرگێرانی هونەرمەند مامۆستا ئەحمەد سالار ، دەرهێنانی سۆران صدیق ئەو قوتابیانەی دەوریان تێدابینی ئەمانەبوون : صلاح ئەحمەد ، کەمال عومەر ، شەوبۆ محمد ، و چاوەروان دەکرێ کە صلاح ئەحمەد دوارۆژێکی درەوشاوەی هەبێ لەجیهانی شانۆدا ئەگەر بەردەوام بێ .
بەراستی جموجۆڵی هونەری و ئەدەبی لەناو خوێندکارانا مایەی خۆشی و شادمانییە ، هیوادارین ئەم تیپە خنجیلانەیە سەرکەوتووبێ و ببێتە پێشرەوە بۆ قوتانجانەکانی تریش .
ئەم بارەیەوە ویستمان رای مامۆستا شێرزاد حەسەن بزانین بەو سیفەتەی چیرۆکنووسێکی ناسراوەو مامۆستای زمانی ئینگلیزیشە لەو قوتابخانەیەدا ، لەوەلاما وتی :





« هەموو هەوڵێکی سەرەتایی بێکەم و کورِی نەبوەو نابێ .. ئەم چەند گەنجەش هەوڵێکی زۆریان داو بەسەر کێشەو گرفتی زاتی و مەوزوعی‌دا زاڵبوون و توانییان ئەم دوو بەرهەمە ساوایە پێشکەش بکەن ، توانیشیان وا لە خەڵکی بکەن بە پەرۆشەوە سەیری شانۆنامەکان بکەن ، هەرچەندە من لەسەرەتادا پێم ووتن : شانۆ نامەی چیخۆف بۆ ئێوە شتێکی گرانەو ماندووتان دەکا بەتایبەتی « دواگۆرانی » یان بابڵێین « گورانی چایکا » ، کە ئەوەیان هێزو توانایەکی چاك لە ئەکتەر دەخوازێ .. چونکە ئەم شانۆگەرییەو بگرە زۆربەی شانۆگەرییەکانی دیکەی « چیخۆف » شۆرِ بوونەوەیەکە بۆ نێو دنیای دەروونی پاڵەوانەکان و دەبێ ئەکتەر زۆر لێهاتوو بێ تارەنگی ئەوبارە دەروونییانە لەسەر تەختەی شانۆ دەرخاو .. دەشتوانم بڵێم « گۆرانی چایکا » زیاتر ئامێزی بۆ چیرۆك کردۆتەوە .. دواجار پێم ووتن : هیوادارم بەراستی شانۆتان خۆش بوێ و تەنیا کەف وکوڵ و هەڵچوونێکی هەرزەکارانە نەبێ و زوو بکوژێنەوە ، ئەوانیش ووتیان هەرگیز وانابێ » .

## ٢ ـ « پێکەنین بەپێی یاسا »

لەقەڵادزێ تیپی نواندنی قەڵادزێ لەمانگی کانونی دووەما شانۆنامەی « پێکەنین بەپێی یاسا » ی لەنووسینی چیرۆکنووس مامۆستا حسین عارف پێشکەش کرد ، کاك عمر عبدالله قاچ دەرهێنەری شانۆنامەکە بوو ، هەرچەندە تیپەکە ساوایە بەلام هیوای سەرکەوتن و پێشکەوتنی بۆدەخوازین .

لەبارەی ئەم کارە هونەرییەوە چیرۆکنووس مامۆستا ئەحمەد قادر سەعید لەرۆژنامەی هاوکاریدا نووسیویە دەڵێ : « وەك بینەرێك لە وردبوونەوەم لە هەڵس و کەوتی زۆربەی ئەکتەرەکان ، بۆنی بوونە ئەکتەری باشیان لێدێ بەتایبەتی قدسی حسن بابکر کە دەوری پاسەوانی درابویە ، لەگەڵ حاجی عبدالله بابکر کە پاشابوو جگە لەو دوو قوتابیانە ، بەیان ئیبراهیم و گوڵاڵە خدر ، کە هەریەکەیان بەجیا دەوری پیرێژنیان دەدی ، وە عمر عبدالله قاچ دکتۆرو دەرهێنەر توانیبووی سروشتی شانۆکەرییەکە بەخەڵکی ئاشنا بکات »
پیرۆز باییمان بۆ تیپی نواندنی قەڵادزێ ، بەهیوایین کە ئەم تیپە شوێنی خۆی لەجیهانی هونەری کوردیدا دیاری بکات و چاوەڕوانی بەرهەمی دیکەیانین .

## ٣ ـ شانۆیی « هیوا » لە ڕانیە

ئەوەندەی دڵشاد دەبین بەو چالاکییە هونەری و ئەدەبییانەی لە شارۆچکەکانی کوردستانا سەر هەڵدێنن ، ئەوەندەش دڵگران دەبین کە ماوەی ئەوەمان نییە لەکاتی گەشانەوەی ئەو خونچانەدا ئامادەبین .

کاك نیازی عەزیز لە ڕۆژنامەی [ هاوکاری ] دا بڵاوی کردبووەوە کە تیپی نواندنی قوتابییانی ڕانیە لە هۆڵی مەڵبەندی لاوان شانۆیی (هیوا) یان پێشکەش کردو خەڵکێکی زۆر لەهونەر دۆستان ئامادەبوون . ئەم شانۆییە کە ماوەکەی کات ژمێرێك بوو عەلی عەباسی نووسیویەتی و کاك ئەحمەد حسین دەرهێنەری بوو . ناوەرۆکی شانۆییەکە کێشەیەکی کۆمەڵایەتی پیشان دەدا هەروەها ناوی ئەکتەرەکان دەبات کە بەیان غەریب و ئەحمەد حسین و رزگار محمودو سۆران ئەحمەدو مستەفا بابەکر بوون .

پیرۆز باییمان بۆ پیتی نواندنی قوتابییان ، بەهیوایین هەنگاوی زیاتر بنێن بەرەو دونیای شانۆی کوردی .

## ٤ ـ مشانۆنامەی [ ماری ]

وا بڕیارە کاتێ ئەم ژمارەیەی گۆڤاری [ کاروان ] دەگاتە دەست خوێنەران دەبێ بەڕێوەبەرێتی مەڵبەندی چالاکیی قوتابخانەکان لەسلێمانی شانۆنامەی (ماری) یان پێشکەش کردبێ . ئەم بەرهەمە نووسینی سعدون العبیدییە و چیرۆکنووس شێرزاد حەسەن کردوویە بەکوردی و هونەرمەند دانا رەؤوف دەرهێنەریەتی ، واش زانراوە کە خوێندکارانی

ئامادەیی کوڕان و ئامادەیی کچان بەشداری تێدا دەکەن .
دوای پێشکەش کردنی شانۆنامەکە زیاترو ڕوون تر لەسەری دەنووسین .

## ٥ ـ چلەی مامۆستاعە لاءالدین سجادی

وابڕیار بوو کەدەستەیەك لەنووسەرانی سلێمانی یەکەونە خۆیان و کۆڕی ماتەم بۆ چلەی ئەدیبی کورد خوالێخۆشبوو مامۆستا سجادی ساز بکەن بەلام دوای ئەوەی کە زانرا دەزگا

# لـه دهـــۆلـك

ژ ئامادەکرنا : مەتین

## کۆڕەك بو ئەمینێ ئوسمان لسەر زمانێ کوردی

ژ چالاکییت ریڤەبەریا رەوشەنبیریا جەماوەر ل دهوکێ ، ل روژا پێنج‌شەمبێ ریکەفتی 7 — 2 — 1985 ێ ، ل هولا بزافێت فێرگەهی ، هژمارەکا مەزن یـا ئەدیب و رەوشـەنبیرو ئـەدەب دوستا ، چاڤ ب‌تورەڤانێ هێژا « ئەمینێ ئوسمان » کەڤتن ، داکو گوهێ خو بدەنە کۆرەکێ خوش بنافنیشانا « وەرارا زمانێ کـوردی » تورەڤـانێ بڤەژەن کـاك « حجی جعفر » مـوحازر پێشکیش‌کر ، پشتی هێژا « صلاح الدین سعید » ی گوتارەك



رۆشنبیرییەکان ئەم کارە لەشاری بەغدا بەئەنجام دەگەیەنن ، ئەوانیش لەو هەرەوەزە رۆشنبیرییەدا بـەشداری‌یـان کرد .
ئەوەبوو ئێوارەی ١٤/٢/٩٨٥ لەهۆڵی کۆمەڵەی رۆشنبیـری کـوردی لە وەزیریـە ئەدیبـان روناکبیـران و هاوڕێ و دۆست و قوتابییەکانی مامۆستا سجادی لەکۆڕی ماتەمیا ئامادەبوون ، ئـەو بەڕێـزانەی ووتـاریان پێشکـەش کرد ئـەمـانـەبـوون : مامۆستایان شێـخ محمد طەبـالیسانی ، عبـداللطیف گولی ـ بەناوی دەزگا روشنبیرییەکانەوە دکتۆر محمد شریف ئەحمەد ، شێخ جەلال حـەنەفی ، دکتـۆر إحسان فـؤاد ، محمد جمیـل رۆژبەیانی ، دکتۆر عزالدین مستەفا رەسول ، جەمال بابان ، جەمال خەزنەدار ـ لەبری دکتۆر مارف خەزنەدار ، مصطفی نەریمان دکتۆر شکریـە رەسول ، عـەبدول‌رەحمـانی مفتي ، مومتاز حەیدەری ، محمددانش (ووتاری بنەماڵە) .

تێکڕای نووسەران لە ووتارەکانیانا ستایستی دەوری پیرۆزی مامۆستا سجادییان لە گەشەکردنی زمـان و ئەدەبی کـوردیدا کردو بەڕێزەوە پەنجەیان بۆ بەرهەمەکانی ڕاکێشا . کۆڕەکە کە دوو سەعات زیاتری خایاند لەلایەن میتەفا سـاڵح کەریمـەوە بەڕێوە دەبرا . لیژنەی کۆڕی ماتەم وای ڕاگەیاند کە بەنیازن ئەو ووتارانەی لێرەدا خوێندرانەوە لەتەك ئەو ووتارانەی ترا کە پێـیـان گـەیشتـوە ، لەگـەڵ ئـەو نـووسینـانـەی لەسـەر خوالێخوشبوو لەگۆڤارو رۆژنامەکانـا بڵاوکـراونەتـەوە لەدوو توێی کتێبێکدا لەچاپی بدەن و بڵاوی بکەنەوە .





خاندی بناڤێ رەوشەنبیریا جامەوەر ، تێدا ڕونکر پالپشتیو هاریکاریا مەزن ژلایێ قوماندریا شورشێڤە بو وەرارو پێش ئێخستنا زمانێ کوردی .

لپێشیا باسێ خو سەیدایێ موحازر ل سەر زمانی بشێوەکێ تەڤای ئاخفت ، کا چاوا پەیدا دبیت . پاشی تبلاخو درێژکرە [ 20 ] پەرتوکا ، بێت نفیسڤانێت کوردو بێت بیانی ، ئەڤێت ل سەر زمانو ڕێزمانا کوردی دانایێن هەتا نهو .

د دویڤرا هاتو لسەر بنەمالێت زمانەوانی ئاخفت . لڤێرێ خویاکر کا دێ چاوا مروڤ زانیت دوو زمان ژبنەمالەکێنە ، گوت مروڤ دێ ڤێ چەندێ زانیت چاخێ سەحدکەتە :

(1) پارچێت لەشی : دەست ، لنگ ، چاڤ ، برو .
(2) تشتێ ژ دەرڤە : ستێر ، دار ، بەر ، ئاسمان ، ئاگر .
(3) هژمار : ئێك ، دوو ، سێ ، چوار ... هتد . ئەمازە دەمێ

مروڤ دبینیت کو ژ بنەمالەکێنە نە ژ ئەگەرا : هەڤسویاتییو دەستەسەرکرنێو ئایینیو بازرگانیێ .

پاشی سەیدایێ ئەمین تبابەکێ ل سەر زاراڤێت کوردی بو مە ئاخفت ، رایێت گەلەك زاناو بسپورا خویاکرن ، وەکی ، محمد مەردوخیو توفیق وهبیو مەکنزیو د . مارف خەزنەداری .

ژوێرێ وێڤە کرە بەحسێ ئەلیف بێتکا کوردیو سالێت بو جارا ئێکی لێ پەیدابوین ، ل ئێریڤانیو سولەیمانیێ . دیسان کەسێت بەمسێ ڤێ چەندێ کرین ، وەکی جلادت بدرخانیو رشید کوردو ئوسمان صبری . پاشی پشتی هینگێ ، بەحسێ علی تەرماخی هات ، سەیدایێ موحازر بیستەکا خوش ل سەر کتێبا وی ئاخفت ، کەدانەرێ ئێکەمین رێزمانا کوردییە . د دویڤدا تلا خو درێژکرە ، زاراڤێت سەرەکی یێت زمانێ کوردی، بەحسێ وەرارا وان کرو ل سەر زمانێ یەکگرتو چەند ڕایەکێت خو دیارکرن . پشتی باس بدویماهی هاتی ، هێژا کەریم فندی کەتە قادا گفتوگویێ ل گەل موحازری ، لسەر بیرو رایێت وی ، یێت کو د موحازەرێدا هاتین . کو دیسان هژمارەکا باش یا پرسیارا هاتنە کرن . بەرسڤا وانژی بپێڤەهاتنەکا دیار هاتە دان ، ژ لایێ سەیدایێ ئەمینڤە . سوپاس بو هێژا ئەمینێ ئوسمان ل سەر رەنجیا کێشای بو بە هەڤکرنا ڤی باسێ خوش ، هیڤیدارین کویرترو هویرتر ئەم بناڤ باسێت هولێدا بچینە خارێ لپاشە رۆژی ، ژبەرکو ژ بابەتێت گەلەك گرنگە د ژیانا مەدا .

ئەڤە وکورا مەیا پر بها بدوماهی هات پشتی نێزیکی دوو سەعەتا کێشای .

● ئەمینێ ئوسمان ●

● ل سالا 1927 ێ ، ل بازێرێ دهوکێ ، چاڤێت خول دنیا ڕوهن ڤەکرینە .
● دوو پەرتوك دانانیە ، « نانو ژیان » ل سالا 1969 ێ و « زمانێ کوردیو ئەوربی » بەرهەڤکرن سالا1981 .
● پشکداری کریە د دانانا کتێبێت کوردیدا بو فێرگەها .

## (ڤ) و (و) د رێزمانا کوردیدا

ل ئێڤارا ئەینی ، ل رێکەفتی 8 — 2 — 1985 ێ دیسان ژ بزاڤێت ناڤخویی ، بێت ئێکەتیا ئەدیب و نفیسڤانێت کورد ـ تایێ دهوکێ ، کۆرەك هاتە گرێدان ، بـو تورەڤـانێ گەنـج و هێژا « فـاضـل عمـر » ی ، ل سـەر « ڤ » و « و » دریـزمـانـا کـوردیدا . پشتی پێشەکییەکا کـورت ، ل سـەر مێـژووا زمانی ، هێژا موحازر بناڤ بابەتێ خودا چوخارێ . رایێت دوو زانا بەرچـاڤکرن و لسـەر ئاخفت گـوت : دوو هزرێت هـەڤدژ هـەنە ، « جگـەرخـوین » دبێـژیت : کـوردان وەکی گـەلێت هەڤسینور (وە) کرینە (ڤـە) . جەمـال نەبـەز دبێژیت : (ڤ) کەڤنترە ژ (و) .
پاشی چەند هزرەکێت خو ئاشکراکرن ، دەربارێ (ڤ) و (و) ، کانێ چاوا هاتینەو کیژك ژ یادی هاتیەو لسـەر خالێت ژێـری پارڤەکرن :

(1) (ڤ) ژ (و) نەهاتیە بهزرا من .
(2)(ڤ) و (و) ژ (ب) وەرگەراینەو ڤێ یەکێ ژی دوو تا ژێ برن .
(3) کو دیسان (ڤ) و (و) ژ (م) وەرگەراینە .
(4) (و) دزارێت زمانێ کوردی بێ ژێریدا ، ژ (ڤ) وەرگەرایە ،

ئەڤێ چەندێ ژی گروڤێت ب هێز هەنە ، چ ژ کەڤنـە زمانێت ئێرانیو چ ژ کەڤنە هەورامانییا پەرتوکا (یارسان) . ئو کـاك فاضلی خویاکر ، کو دزارێ کرمانجیژی دا ، ئەڤێ چەندێ رووداپە ، (ڤ) وەرگەرایە (و) ، لێ دبوارەکێ تەنگدا .
بو ڤێ چەندێ سەیدایی نمونە مشە پێش چـاڤ کرن مفـا بو بابەتێ خو ،ژ نێزیکی دەهـ ژێـدەرا وەرگرتیـە . ل دویماهیکێ گفتوگویەکا گەرمو گورِ چێبو ، ل سەر رایێت موحازری . یازدە برادەرا ژ ئەدیبو ئەدەب دوستا ، پشکداری تێداکر بابـەتێ کۆرێ پتر فرەهبو بهایێ وی پتر زێدەبوو . بێ خش مفایەکێ باش هاتە وەرگرتن . سوپاس بو کاك فـاضلی لگـەل هیڤیو داخازابێت سەرکەتنێ .

● فاضل عمر ●

● ل سالا 1962 ێ ژ دایكبو ل دهوکێ .
● ڤەکولین و بابەت ل سەر زمانێ کوردی د کوڤارو رۆژنامادا بەلاڤکرینە .
● نهو قوتابییە ل کولیجا نـوژداریێ « پزیشکیێ » ل سـالا پێنجێ .

پێشـانگەهـەکا دوو قولی یا هونەرمەندێت گەنج « فهمي صالح بالایی » و « گوهدار صلاح »

ب هەلکەفتنا رۆژا رەوشەنبیریا کوردی ، ژ چالاکیێت دەزگەها رەوشەنبیریو بەلاڤکرنا کوردی ـ نفیسینگەها دهوکێ ل ژێر چاڤدێریا هێژا جێگرێ پارێزگـەرێ دهوکێ ، پێشـانگەهـەکا هونەرێ شێوەکاری ، دوو قولی یا هونەرمەندێت گەنج « فهمي صالح بالایی » و « گوهدار صلاح » ی ، هاتە ڤەکرن ل دەم ژمێـری ١٠ ی رۆژا ٩ ـ ٣ ـ ١٩٨٥ ێ ل هـولا بـزاڤێـت خاندنگەهێ ل دهـوکێ .
هژمارەکا مەزن ژ رەوشەنبیرو تورەڤان و قوتابیا ل دەمێ



ژ هوزانێت هوزانڤانی داهینەر موئەیەد تەیب ی .

● کچ دبن دەستێ سەرمایەدارییێ دا : ئاڤەروکا وێ یا خویایە مەرف هویرك مێزەکەتێ . بێهنا سەرمایەدارییێ ناهێت ، دل لێ هین نابیت ، تنێ خوینا ژنکێ بمیـژیت ، هێزا کـارێ وێ ژێ بستینیت و بدزیت . هزرو بیرو باوەرێت وێ ژی راوەستاندینە ، دبن پێ خوەڤە کرینە .

● خو راگرتن ، مەم و زین ، مرن بو ژیانێ ، دایك ، نەڤروز . بێت هێژا کاك گوهداری .

● مەم و زینێ ، لبەر سینگێ دارکەکا تازیی و روت ، بدلەکێ پڕ شادو گەش تەماشا دکەنە ژیانێ و ڤێ جیهانێ . ل سەر دفنا کلو پێتێت د دلێ واندا . ل سەر هونەری ، بتایبەتی لباژێرێ دهوکێ دا سەحکەینێ کاك گوهدار چ دبێژیت : « هونەر ئەزمانێ هەمی



سێ روژا ، سـەرەدان ئینانـە ڤێ پێشانگـەها بسـەرکەفتی . بدلەکێ شادو بەختەوەر ، هەر بڕەکێ دناڤ ⸍را خوەدا گێنگەشە دکرن ل سەر کەڤالێت بدلێ وانڤە نویسیاین . کو دیسان دکەفتنە قـادا گفتـوگـویێ لگـەل خـوەبێت ڤـان کـەڤـالا ، هـەردوو هونەرمەندێت بیرەوەر . بەرهەمێت پێشانگەهێ پێك هـاتینە ژ ٤٠ کارێت هونەری . ب رەنگێ ، زەیت ، ئاڤی ، خامێ رەش ، پاستیل ، گرافیك ، هاتینە چێکرن . هند بقەبارێت بچویك و هند بێت مەزن .

ئەڤ کارەنە وەکو تەکنیك و شێوەو بیرو باوەرێت دنێڤ دا بەربچاڤ ، ب هێزبون چەلەنگیا هونەرمەندێت مە بە لی دکەن . بو جارا ئێکێ یە ئەم ل دهوکێ کارێت کەهەشتی و بسەرکەفتی لڤێ لوکێ دبینین . بابەتێت سەرەکی بێت پێشانگەهێ ، پێـك هاتینە ، ژ مروڤ و دورهێل ، کارو فولکلورو خورست و رەوشت و تیتالێت کوردەواری . دیسان بشارەزایی و هـونەرمـەندیـەکا جوان ، کەڤـالێت خوە ل هـولی هەلاویستینـەو رێکخستینە ژ کەڤالێت سەرنجا بینەرا راکێشایی و زێدە بدلێ وانڤە نویسیاین و مینا شلخا ل دوربەری چڤین و خربوین ، ئەڤنە بون :

● وارێ منـو ، پالە ، کـچ دبن دەستێ سەرمـایەدارییێ دا ، رەڤەندی ، شڤان ، رێنجبەری ، بێت کاك فەهمی .

وارێ منـو ، براستی هـەلبەستـەکا بێ قـام سپەهی و قەشەنگە ، ژ هەلبەستەکا سپەهی ترو قەشەنگ تر وەرگرتییە ،



گەرنە ، ئو چ مللەت نینن بێ هونەرمەند .. هونەر کارەکێ مروڤایەتی یە .. هەر ئەوە ئارمانجێت مروڤایەتیێ . هەرچەندە ئەڤ هونەرە نوی دەست پێکریە ل کوردستانێ ، بتایبەتی ل دهوکێ ، لێ هونەرەکێ پێشکەفتییە » .

کاك فەهمی ژی پشکداری د سوحبەتا مە دا کر فەرموی « براستی جهێ شانازیێیە ، کو من دڤیا کەڤالێن خو بێخمە پێش چاڤێن جەماوەری و هونەری کوردی ژی ببیتە هونەرەکێ ڤەژەنی ژ دورهێل و فولکلوری و سروشتێ مللەتێ مە چاوان بەرهەمێن مێژووێن جیهانی نەخشاندینە برەنگەکێ هونەری و هەر مللەتەکی هولێ خوە دایە نیاسین ، هوسان مە ژی دڤێت بلڤین و ببزڤین ژبو هاژوتنا ڤی کاروانی و بگەهینینە کاروانێ هونەرێ جیهانی » .

ل هولا پێشانگەهێ مە هەڤبینینە لگەل هونەرمەندێ هەژی کاك اسماعیل عبدالقادر « زیرەك » ی هەبو . دەربارەی پێشانگەهێ ژ مەرا پەیڤی کەرەم کر گوت : « ئەز ڕێزو شانازیا خوە دیار دکەم ، بو ڤان کارێت ڕندو ژێ هاتی . بەرهەمێت هونەرمەند « گوهدار صلاح » ی یێت « گرافیك » . هونەرمەند گوهدار کاری یە بهێلیت خوە ، بخیچك و بابەتێت خوە ، گریدانا خوە بقادێ و نیشتیمانی ڤە زل و بەربچاف بکەت . هیڤی ژ خودێ دکەم تم بێ سەرکەفتی بیت ژبو خزمەتا هونەری . کو دیسان ل بەرلوکا کارێت زەیتی یێت کو من دیتین ژبەرهەمێت هونەرمەند فهمی بالایی ، من هەست بێ کر درست کوردە ئەو ژی بێ گریدایە بقادێ و نیشتیمانی ڤە ، ژبەر ڕەنگێت خانەدان و مال بات یێت کوبکار ئینانین .

لکوتاییێ ئەز ڕێزو شانازیا خوە دووبارە دکەم بو پێشانگەهێ . من هیڤی و داخازیە ژ هونەرمەندێت خورت و لاو پێشانگەها زێدەبکەن ، ئەمازە هونەرێ شێوەکاری ل دەڤەرا مە بێ بکاڤێت هێدی برێڤە دچیت ژبەرکو بسهورێت زانیاری دکێمن » . صەد ئافەرین بو وان تلێت زێرین ، ل تم دسەرکەفتی و پێشکەڤتی بن ژ بو لڤلڤلینا ڤی هونەری لپارێزگەهێ و پێشڤە برنا بزاڤا هونەرێ شێوەکاری لکوردستانێ .

● گوهدار صلاح الدین ●

● ل سالا ١٩٦٧ ێ ل باژێرێ دهوکێ بێ بوی .

● خاندنا سەرەتایی و ناڤنجی ل دهوکێ بدوماهی ئینایە .

● ل سالێت (٨٢ ـ ٨٣) ێ و (٨٣ ـ ٨٤) ێ قوتابی بو ل ئاموژگەها هونەرێت جوان ل سلێمانیێ .

● نهو قوتابییە ل ئاموژگەها هونەرێت جوان ، پشکا « گرافیك » ی ل ڕێزا سیێ ل بەغدا .

● ل سالا ١٩٨٢ ێ پشکداری کریە دفیستیڤالا هونەرو رەوشەنبیریا کوردی دا ل هەڤلێرێ .

● ل سالا ١٩٨٣ ێ دپێشانگەهەکا چوار قولی دا ل دهوکێ ، پشکداری کریە .

● ل سالا ١٩٨٣ ێ و ١٩٨٤ ێ ل پێشانگەهێت ئاموژگەها هونەرێت جوان ، ل سلێمانیێ پشکداری کریە .

● فهمی بالایی ●

● ل سالا ١٩٦٣ ێ ل گوندێ « نورە » ل دەڤەرا بەرواری بالا چاڤێت خوە ل دنیایێ ڤەکرینە .

● خاندنا سەرەتایی ل گوندێ « مایێ » بدویماهی ئینایە و یا ناڤنجی ل دهوکێ .

● نهو قوتابیە ل ئاموژگەها هونەرێت جوان ، ل ڕێزا چوارێ لپشکا « نیگاری » ل موسلێ .

● پشکداربویە د هەمی پێشانگەهێت ئاموژگەها موسلی دا .

● ل سالا ١٩٨٤ ێ پشکداری کریە د پێشانگەها گەنجادا ل باژێرێ موسلێ .



